# مـردن و ڕۆژی دوایـی
## لە دیدگای قـورئان و فەرموودە

ئامادەکـردنی
مامۆستا اسماعیل سوسەیی

## ناوەڕۆك

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾ [آل عمران: ١٠٢].

﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ [النساء: ١].

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا * يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ [الأحزاب: ٧٠-٧١].

أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ صلى الله عليه وآله وسلم، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّارْ.

## پێشەکی:

ئەو باس و بابەتەی کە بۆمان ئامادە کردون خاڵێکی یەکجار گرنگە شتێکی مەحاڵە و حەتمیە هەر دێتە پێشمان و بەسەرماندا دێت، ئینجا بۆ ئەوەی بەرچاومان ڕون بێت و خۆمانی بۆ ئامادە بکەین لەو پێناوەدا زنجیرەی (مردن و دوارۆژ لە دیدگای قورئان و فەرمودە)دا بۆ ئامادە کردون.

## ئەم زنجیرەیەش سێ تەوەر لە خۆی دەگرێت:

تەوەری یەکەم: باسی مردن و ژیانی دوای مردن واتە لەناو گۆڕدا هەتا قیامەتمان لێ دادێت لە دیدگای قورئان و فەرمودە باسی لێوە دەکەین بە بەڵگەکانی قورئان و فەرمودەی سەحیحی پێغەمبەر (ﷺ) و بە تێگەشتنی سەلەفی ساڵح، لە پەرتوکە جێگا متمانەکانی عەقیدە و بیروبڕوادا.

تەوەری دوەم: لە پاش لەناوچونی دونیا (زیندوبونەوە و مەیدان و حەشر و حیساب).

تەوەری سێیەم: پردی سیڕات و بەهەشت و دۆزەخ.

## لەبەر گرنگی و پێویستی ئەو خاڵانە ئەو بابەتەمان هەڵبژارد:

١. مردن و ناخۆشیەکانی ڕۆح کێشان هەریەک لە ئێمەی مرۆڤ دەبێ تامی بکات و بیبینێ پێغەمبەر تامی کرد (ﷺ) مادەم پێغەمبەر بەسەری هات و تامی کرد کە بەڕێزترین و خۆشەویسترین کەس بوە لەلای الله تعالی دەبێ ئێمەش هەر تامی بکەین.

٢. لەدوای ئەوەی دەمرین و دەبینە لاشەیەکی سارد و سڕ و بێگیان، ئەگەر بە نسیبمان ببێت دەبێ لەبەر دەستی خەڵکانێکی تری دەوروبەرمان بشۆردرێین و لە دوایدا کفنمان بۆ حازر بکرێ و لەسەر شان و ملەکان هەڵبگیردرێین بەرەو گۆڕستان بەرەو گۆڕێکی تاریک ببرێین.

٣.شۆڕبونەوەمانە بۆ ناو گۆڕی تەنگ و تاریک مەگەر الله تعالی بە ڕەحمی خۆی و ئێمەش کردەوەی چاکمان بایی ئەوەندە کردبێ سەبەب بێت بۆ جوڵاندن و هێنانەپێش و هێنانەدی ڕەحمی الله تعالی تاوەکو گۆڕمان بۆ ڕوناک بکاتەوە.

٤.ناخۆشی و زەحمەتی ڕوبەڕوبونەوەی دوو فریشتەی الله تعالی بە ناوی (مونکەر و نەکیر)، کە سێ پرسیارمان لێ دەکەن لەناو گۆڕدا کەس لێی قوتار نابێت چەند کەسێکی تایبەت نەبێت (لە داهاتودا بە پشتیوانی الله تعالی باسی لێوە دەکەین کە کێ لێی قوتار دەبێت).

٥.زیندوبونەوە و هەستانەوەمان لەناو گۆڕ.

٦.مەیدانی حەشر و حیساب ڕوبەڕوبونەوەی حیساب و مەحکەمەی الله.

٧.ڕاوەستان لە بەرامبەر تەرازوی الله بۆ کێشانی خۆمان و کردەوەکانمان و پەڕاوەکانمان.

٨.دانەوە دەستی پەرتوک و پەڕاوەکان ئایە بە دەستی راست وەریدەگری یان بە دەستی چەپ (یەکجار یەکجار ترسناک و قورسە ئەو مەیدانە هەر بە زار و زمان خۆشە باسی لێوە بکەیت).

٩.ڕۆشتن بەسەر پردی سیڕات، بە ڕاستی ئەوەشیان یەکجار ناخۆش و زەحمەتە لەبەر ئەوەی پردی سیڕات لەسەر ئاگری دۆزەخ و جەهەنەم دانراوە هەر دەبێت بەسەریشیدا بڕۆی ئەگەر موسڵمان و پیاو چاکی وە ئەگەر خراپ و تاوانکاری یان کافر و مونافق و دوو ڕوشی.

١٠. ئاگری دۆزەخ و عەزاب و ناخۆشیەکانی.

١١. تاوەکو زۆر یادی مردن بکەین چونکە سود و کەڵکی زۆری لێ وەردەگرین لە زۆر یادکردنی مردن، ئەبو هورەیرە بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «فَأَكْثِرُوا مِنْ ذِكْرِ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ الْمَوْتِ[1]» واتە: زۆر زیکری تێکدەری تام و چێژ و خۆشیەکان بکەن کە مردنە.

[1] سنن الترمذي (٢٤٦٠) هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لاَ نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ. حكم الحديث: ضعيف جدا، لكن جملة "هاذم اللذات" صحيحة، سنن الدارمي (٢٨٥٧)، مسند أحمد (١١٠٠٠) (١١٣٣٤).

چونكه ئەو كات تۆ عاقڵ مەندی ئەگەر زۆر یادی بكەی، خۆ ئەگەر خۆشت لە گێلی بدەی هەر بەسەرتدێ، بڵێی بیرناكەمەوە لە مردن نەزانیە! نەفامیە! كەم عەقڵیە! لەبەر ئەوەی هەر لەپێشتە و بەسەرت دێت جا بیری لێ بكەیتەوە چاكترە تاوەكو خۆتی بۆ ئامادە بكەی بەباشی پێی بگەی.

عەبدوڵای كوڕی عومەر بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ پیاوێكی ئەنسار هاتە خزمەتی پێغەمبەر و لێی پرسی: (من أكيَسُ النَّاسِ وأكرمُ النَّاسِ يا رسولَ اللهِ؟ فقال: أكثرُهم ذِكرًا للموتِ وأشدُّهم استعدادًا له أولئك هم الأكياسُ ذهبوا بشرفِ الدونيا وكرامةِ الآخرةِ[1]) واتە: كێیە لە هەموو كەس ژیرتر وە بەڕێزتر ئەی پێغەمبەری الله؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ژیرترین كەس وە بەڕێزترین كەس ئەو كەسەیە زۆر یادی مردن دەكات هەر مردنی لەبیرە خۆی بۆ ئامادە دەكات لەوپەڕی ئامادە باشی ئەوانەن زۆر ژیرن ئەوانەن پلە و پایە و شەرەفی دونیایان بەدەست هێناوە وە ڕێز لێگیراون قیامەتیان بۆ خۆیان دابین كردوە

ئەو بابەتەمان لەبەر ئەوە هەڵبژارد تامردنتان بیر بێنینەوە و بەبیر خۆشهانی بێنینەوە تاوەكو زۆر یادی بكەین و خۆمانی بۆ ئامادە بكەین ئیمامی قورتوبی دەفەرموێ پێشەوا دەقاق فەرمویەتی: (من أكثر من ذكر الموت أكرم بثلاثة أشياء: تعجيل التوبة، وقناعة القلب، ونشاط العبادة. ومن نسي الموت عوقب بثلاثة أشياء: تسويف التوبة، وترك الرضى بالكفاف، والتكاسل في العبادة[2]) واتە: هەر كەسێک زۆر زیكر و یادی مردن بكات خەڵات دەكرێ بە سێ شت: خێرایی دەكات لە تەوبە و گەڕانەوە بەرەو لای الله تعالی، دڵت وا لێدەكات ڕازی بێت بە بەشی خۆی، چالاكت دەكات لە عیبادەت و پەرستشەكان. هەر كەسێكیش مردن لەبیر بكات و یادی نەكات تۆڵەی لێ دەستێندرێ بە سێ شت: بە دواخستنی تەوبەكردن، هەرگیز ڕازی نابیت بە بەشی خۆت، تەمبەڵی دەكەیت لە عیبادەتدا.

[1] تخريج الإحياء للعراقي (١٩٤/٥)، إسناده جيد، أخرجه ابن ماجه (٤٢٥٩) مختصرا، وابن أبي الدنيا في ((مكارم الأخلاق)) (٣) باختلاف يسير.

[2] التذكرة: الجزء الأول، ص: ٢٧.

ئیمامی غەزالی کە زاتێکی پڕ عیلم و زانست بوە دەفەرموێ: (فجدير بمن الموت مصرعه، والتراب مضجعه، و الدود أنيسه، و منكر و نكير جليسه، و القبر مقره، و بطن الأرض مستقره، و القيامة موعده، و الجنة أو النار مورده، أن لا يكون له فكر إلا في الموت، و لا ذكر إلاّ له، و لا استعداد إلا لأجله[1]) واتە: واباشترە بۆ کەسێک کە مردن پشتی پێ بە زەویدا دەدات، وە خۆڵ و گڵ دەبێت بە ڕاخەری، وە دەبێتە خۆراکی کرمەکان، وە مونکەر و نەکیر دێنە لای و پرسیاری لێ دەکەن، وە ناو گۆڕ دەبێتە بارەگای، وە ناو سکی زەوی دەبێتە مەنزڵگای، وە قیامەت دەبێتە مەوعیدی، بەهەشت یان دۆزەخ دەبێتە شوێنی، جا کەسێک ئاوابێت حاڵ و باڵی بیردەکاتەوە کە چۆن خۆی بۆ ئامادە بکات و شوێنی خۆش بکات لەوپەڕی ئامادەباشی و بیر لە شتەکانی تر نەکاتەوە.

جا با بزانین خەڵکی بەرامبەر بە یادکردنی مردن و لەبیر چونەوە چەند کەسن، جۆرەکانی ئیمامی غەزالی دەفەرموێ: سێ جۆرە کەس هەن بەرامبەر بە مردن و یادکردنەوەی مردن، یەکەمیان: کەسێک کە دڵی بە دونیا بەستوەتەوە و هەرگیز یادی مردن ناکات، ئەگەر یادیشی بکات ئەسەف دەخوازێت لەسەر ئەوەی کە مردن دێت و ئەو دونیایەی لە دەست دەدات، کەسی دوەم: کەسێکی تەوبەکاری نوێ، هەتا لە تەوبەکەی بەردەوام بێت هەردەم حەزی لە زیکر و یادی مردنە بەس لەوە دەترسێت مردن بەسەریدا بێت و تەوبەکەی تەواو نەبوبێت و بە تاوانەوە بگەڕێتەوە لای الله ئەوەش زۆر زیکر و یادی مردن دەکات و گوێ دەگرێت لە نەسیحەتەکانی مردن و خۆی چاک دەکات، کەسی سێیەم: ئەو کەسانەی تەواو اللەیان ناسیوە ئەوانەی لە ژیانی دونیا تێگەشتون ئەوانەی اللەیان بە ناو و سیفەتەکانیەوە ناسیوە دەزانن الله تاک و تانیایە الله ڕۆزیدەرە و ڕۆزیەک بۆ تۆی دانابێت کەس لێت نابات هەر ئەو دەتوانێت زەرەر و زیانت پێ بگەیەنێت هەر ئەو دەتوانێت سودت پێ بگەیەنێت و هەر

[1] إحياء علوم الدين (١٠٢/١٥).

ئەو دەتوانێت سودت لەسەر قەدەغە بکات حەزدەکات و هەموو دەم لە ئامادەباشیدایە بگەڕێتەوە لای الله تعالی تامەزرۆی ئەوەیەتی بگات بە لیقای الله تعالی[١].

زیکر و یادی مردن بەڕاستی زۆر گرنگە و پاڵنەرە بۆ ئەوەی چاکەمان پێ بکات و لە خراپە بمان گەڕێنێتەوە، ئەو مردنە مەحاڵە هەر پێت دەگات و حەتمیە الله تعالی لە قورئانی پیرۆز براندویەتیەوە و دەفەرموێ: ﴿قُل إِنَّ ٱلمَوتَ ٱلَّذِي تَفِرُّونَ مِنهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُم ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلغَيبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُم تَعمَلُونَ﴾ [الجمعة: ٨] واتە: بڵێ بەڕاستی ئەو مردنەی کە لێی ڕادەکەن بێگومان پێتان دەگات و توشتان دەبێ لەپاشان دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای الله زانا بەئاشکراو نهێنی ئینجا هەواڵتان پێ دەدات بەوەی کە دەتانکرد.

ئیمامی قورتوبی فەرمویەتی: ئەوانەی دڵیان ڕەقە، ئەوانەی نایەن بەرەو عیبادەت و یادی الله و دڵ نەرم نین تەوبەی تەواو بکەن، بە چەند شتێک سود و قازانجی ئەوە دەکەن بگەڕێنەوە لای الله، یەکەم: زۆر سەردانی گۆڕستان و قەبرەکان بکەن تاوەکو مردنیان بەبیر بێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «كنت نهيتكم عن زيارة القبور ألا فزوروها فإنها تذكر الآخرة[٢]» واتە: من ئێوەم قەدەغە کردبوو بچنە سەر گۆڕستان ئێستا بڕۆن تاوەکو قیامەت و مردنتان بەبیر بێتەوە، دوەم: ئامادەبون لە کۆڕ و مەجلیسە ئامۆژگاری و نەسیحەتیەکان، سێیەم: گوێ ڕاگرتن لە ژیانامەی کەسە عابید و دونیا نەویستەکانی پێشان، گوێیان لێ ڕابگری چۆن دونیایان نەویستوە و بۆ مردن خۆیان ئامادە کردوە دڵت نەرم دەبێ و دەچی بەرەو تەوبە کردن، چوارەم: باسکردن و یادکردنەوەی مردن، پێنجەم: هەرکاتێک گوتیان یەکێک لە سەرە مەرگە خۆتی پێ بگەیەنە و چەند خێرێکت پێ دەبڕێ لەوێ، (لا إله إلا الله)ی پێ بڵێ و برای

[١] إحياء علوم الدين، ج: ٤ ص: ٤٤٩.

[٢] شعيب الأرنؤوط، تخريج المسند لشعيب (١٤٢/٢١)، إسناده حسن، أخرجه أحمد (١٣٤٨٧)، وأبو يعلى (٣٧٠٧)، والبيهقي (٧٤٤٩) مطولاً.

موسڵمانتە و حەقی لەسەرتە وە تەماشاشی بکە بزانە چۆن گیانی دەکێشرێ تۆش ڕۆژێک لە ڕۆژان ئاوات بەسەر دێت[١].

پێشەوا حەسەنی بەصری دەفەرموێ: (ما ألزم عبد قلبه ذكر الموت إلا صغرت الدونيا عليه[٢]) واتە: هەرکەسێك بەردەوام یادی مردن لە دڵی خۆیدا بکات دونیای لا بچوك دەبێت.

ڕۆژێکیان موتیع کە پیاوێکی باشی ساڵح بوە قەسرێکی هەبوو بە پارەی حەڵاڵ دروستی کردبوو دەچێتە دیار قەسرەکەی و تەماشای دەکات لە هاڕژنی گریان دەدات، دەڵێن: ئەی موتیع تەماشای خانو و قەسرەکەی خۆتت کردوە بۆچی دەگریەی؟ لە وەڵامیاندا موتیع دەفەرموێ: دەزانن بۆ دەگریەم تەماشای قەسرەکەی دەکات و دەفەرموێ: (والله لولا الموت لكنت بكِ مسرورًا، ولولا ما نصير إليه من ضيق القبور لقرت بالدونيا أعيننا[٣]) واتە: ئەی قەسر و خانو ئەگەر مردن نەبوایە دڵم بە تۆ زۆر خۆش دەبوو، ئەگەر ئەوەم لە بەرچاو نەبوایە کە دەچمە تەنگایی گۆڕ دڵم خۆش دەبوو چاوەکانم ڕون دەبوو بە خۆشیەکانی دونیا.

## مردن سێ خاڵی هەیە دەبێت زۆر لێی بترسێین:

١.ئازارەکانی ڕۆح کێشان: دایکە عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە (رضي الله عنها) دەفەرموێ: پێغەمبەری پێشەوا من لە خزمەتی بوم و لە ماڵەکەی من بوو جامۆکەیەکیان لە ئاو لەلا دانابوو و پەڕۆیەکی لەناودا بوو تێی دەکرد هەندێکجار دەستیشی بە نێوچاوان و دەموچاوی موبارەکی زێڕینی پڕشنگداریدا دەهێنا و دەیفەرمووو: «لا إله إلا اللهُ، إنَّ للموتِ سَكَرَاتٍ، اللهم في الرفيق الأعلى[٤]» واتە: واتە: هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لە الله، سوێند بە الله و بە دڵنیایەوە ڕۆح کێشان زەحمەتی و ناخۆشی هەیە، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی بەرز دەکردەوە و دەیفەرمووو: یا الله بۆلای بڵندترین هاوڕێ.

[١] مختصر تذكرة، القرطبي، عبد الوهاب الشعراني.
[٢] أخرجه ابن أبي الدنيا -ذكر الموت- (ص: ١٢٩).
[٣] [موسوعة ابن أبي الدنيا ٥/٤٣٢].
[٤] صحيح البخاري (٤٤٤٩) (٤٤٣٥) (٤٤٣٦)، صحيح مسلم (٢١٩١) (٢٤٤٤)، سنن الترمذي (٣٤٩٦).

وە هەر دایکە عائیشە دەفەرمویٚ: «مَاتَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَإِنَّهُ لَبَيْنَ حَاقِنَتِي وَذَاقِنَتِي، فَلَا أَكْرَهُ شِدَّةَ الْمَوْتِ لِأَحَدٍ أَبَدًا بَعْدَ النَّبِيِّ (ﷺ)[1]» واتە: پێغەمبەری الله (ﷺ) کە وەفاتی کرد سەری لەسەر سنگم بوو دوای ئەوە هەرگیز نارەحەتی گیان کێشانم بۆ کەس پێ ناخۆش نیە.

٢. بینینی فریشتەکانی مردن (ملك الموت): بینینی (ملك الموت) ئاسان نیە ئەگەر لە تاریکە شەودا برای خۆت ببینی لەبەری ڕادەکەی و ڕادەچڵەکی، ئەگەر لە تاریکە شەودا چاوی زەقی بریسکەدار دەبینی لە هی حەیوان و ئاژەڵێک هەڵوێست دەنوێنی و پشتاوپشت دەگەڕێیتەوە، ئەگەر دیمەنێک کە هەرگیز نەتبینیبێت تەماشای دەکەی لە شوێنێکدا لەبەری هەڵدێی و ترس بەسەرتدا زاڵ دەبێ، ئەی ئەگەر (ملك الموت) ببینیت کە هەرگیز نەت بینیوە؟ ئەو فریشتانە یەکجار گەورەن جبریل کە گەورەی فریشتەکانە فریشتەی ترساندن نیە و هی موژدەدانە لەگەڵ ئەوەدا پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر وێنەی خۆی دەگێڕێتەوە کە بینیویەتی دەفەرموێت نێوان زەوی و ئاسمانی داگرتبوو شەش سەت باڵیشی هەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) لە ترسدا ماوەیەک قسەی بۆ نەدەکرا[2]، ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) بەو شێوەیە سامی لێ نیشتبێ و بترسێ تۆی بەندەی بەستە زمانی سەدەی بیست و یەکەم لەناو ئەو هەموو تاوانە و بونی سەتەلایت و موبایلەکان ئیعلام و ڕاگەیاندنە کوفریەکان و بەدواکەوتنی طاغوتان و خەڵەتاندنی بەناو موسڵمانەکان ئەو کات دەبێت ڕۆح کێشانی تۆ چۆن بێت و (ملك الموت)ت لێ بەدیار کەوێت دەبێت چ سام و هەیبەتێکی هەبێ؟

٣. موژدەت پێ دەدرێ بە چونە بەهەشت لە کاتی ڕۆح کێشانەکەت یان ئەوەیە بڕیار دەدرێ تۆ دۆزەخی: ئەبو هوڕەیرە لەسەرەمەرگدا لێی دەگێڕنەوە دەفەرمون: (بكى أبوو هريرة وقال والله ما أبكى حزنا على الدونيا ولا جزعا من فراقكم ولكن انتظر إحدى البشريين من ربى بجنة أم بنار[3]) واتە: لە کاتی مردندا ئەبو هوڕەیرە دەستی بە گریان کرد پاشان گوتی سوێند

---

[1] صحيح البخاري (٤٤٤٦) (١٣٨٩) (٣١٠٠)، سنن الترمذي (٩٧٩)، سنن النسائي (١٨٣٠) (٣٦٢٥).

[2] مسند أحمد (٣٩١٥)، صحيح البخاري (٣٢٣٢) (٤٨٥٦) (٤٨٥٧)، صحيح مسلم (١٧٤).

[3] إحياء علوم الدين (٤/٤٦٥).

بە الله ناگرێم خەمگین بم بۆ ئەوەی دونیا بەجێ دێڵم لەبەر ناخۆشی ئەوەشم نیە لە ئێوە دادەبڕێم بەڵکو من لە چاوەڕوانی دوو موژدەکەم کە ئایە موژدەم پێ دەدرێ بە بەهەشت (تاوەکو دڵخۆش ببم) یان ئەوەیە موژدەم پێ دەدرێ بە ئاگر (تاوەکو خمگین ببم).

عوبادەی کوڕی صامیتیش دەفەرموێ: «وَلَكِنَّ الْمُؤْمِنَ إذا حَضَرَهُ الْمَوْتُ بُشِّرَ بِرِضْوانِ اللَّهِ وكَرامَتِهِ، وإنَّ الكافِرَ إذا حُضِرَ بُشِّرَ بعَذابِ اللَّهِ وعُقُوبَتِهِ[1]» واتە: بڕوادار کاتێک لە سەرەمەرگدایە موژدەی پێ دەدرێ بە ڕەزامەندی الله تعالی و ڕێز لێنان، کافر و بێ بڕواش لە کاتی سەرەمەرگدا موژدەی ئەوەی پێ دەدرێ عەزابی الله تام دەکەیت و تۆڵەت لێ دەستێندرێتەوە.

[1] صحيح البخاري (٦٥٠٧)، صحيح مسلم (٢٦٨٣) (٢٦٨٤) (٢٦٨٥)، سنن الترمذي (١٠٦٦) (١٠٦٧) (٢٣٠٩).

**تەوەری یەکەم:** مردن و ژیانی دوای مردن تاوەکو زیندوبونەوە:

**پێناسەی مردن:** مردن لە زمانەوانیدا (الموت، مردن) دێت دژی (الحیاة، ژیان) لە عەرەبیدا چۆن سارد و گەرم دژ بە یەکن دەڵێی ئەوە گەرمە واتە سارد نیە یان ئەوە ساردە واتە گەرم نیە، کە گوتیشت مردن واتە ژیانی نیە و ڕۆحی لێی جیابۆتەوە لەبەر ئەوەیە لە زمانەوانیدا دەگوترێت (الموت الموتان ضد الحیاة)[1]، مردن چ (الموت)ی پێ بگوترێت چ (الموتان) هەردوکیان دژن بە ژیان[2]، وە ئەسڵ لە مردندا جێگیربونە هەروەک لە (لسان العرب) هاتوە هەرکەس و شتێک ئەگەر جێگیربوو جوڵەی لێ بڕا پێی دەگوترێت مردو، لەبەر ئەوەیە نوستنیش جوڵەت لێ دەبڕێ و هۆشت لەسەر خۆت نامێنێ دەڵێن نوستنیش جۆرێکە لە مردن[3]، جا لە زمانی عەرەبیدا ئاگر کە دەکوژێتەوە دەڵێن ئاگرەکە مرد، کاتێک ڕوناکی نامێنێ دەڵێن ڕوناکیەکە مرد، با کاتێک نامێنێ دەڵێن بایەکە مرد کەواتە مادەم ڕاوەستان و نەمان پێی دەگوترێت مردن لە زمانەوانیدا[4].

## مردن لای زانایانی ئیسلام:

ئیمامی قورتوبی دەفەرموێ: (انْقِطَاعُ تَعَلُّقِ الرُّوحِ بِالْبَدَنِ وَمُفَارَقَتُهُ، وَحَيْلُولَةٌ بَيْنَهُمَا، وَتَبَدُّلُ حَالٍ وَانْتِقَالٌ مِنْ دَارٍ إِلَى دَارٍ[5]) واتە: بچڕانی گیانە لە لاشە کە گیانەکە جیابویەوە، گیانەکە چوە لایەک و لاشەکەش لە شوێنێکدا مایەوە ئەوە دەڵێن کەسەکە مردوە و گیانی لە دەستداوە، لە حاڵێک دەگۆڕێ بۆ حاڵێکی تر لە ماڵ و ژیانێک گوێزرانەوەیە بۆ ماڵ و ژیانێکی تر.

ئیبنو قەیمی جەوزی دەڵێت: هەر مرۆڤ و گیان لەبەرێک چوار ماڵی هەیە، ماڵی یەکەم: ناو سکی دایکتە، کە زۆر تەسکە و جوڵەیەکی وات پێ ناکرێت، ماڵی دوەم: دونیایە، ماڵی سێیەم: ژیانی ناو گۆڕە، چۆن کاتێک لە دونیادا دەژیت ئەگەر بیربکەیتەوە تۆ کاتێک هەبوە

[1] لسان العرب: (٣/٥٤٧).
[2] لسان العرب، لابن منظور: (١/٧٧٤).
[3] لسان العرب: (٣/٥٤٧).
[4] لسان العرب: (٣/٥٤٧).
[5] تفسیر القرطبي سورة الملك أية ٢.

لەناو سکی دایکتدا ژیاوی چەند تەنگە لە چاو دونیا؟ دونیا چەند فراوانترە لە چاو سکی دایکت؟ ژیانی دوای مردنیش بەو شێوەیە، ژیانی دونیات دەهێنێتە پێش چاو بە قەدەر ڕەحمی دایکت پێت تەنگ دەبێت کاتێک دەچیتە ژیانی دوای مردن (بەرزەخ) بەو شێوەیە فراوانترە لەچاو ژیانی دونیادا، ماڵی چوارەم: ژیانی دوای زیندوبونەوەیە و مەیدانی حەشر و حیساب و چونە بەهەشت و دۆزەخە ئەویشیان بە ئەندازەی فراوانی ژیانی بەرزەخ کە چەند فراوانترە لە ژیانی دونیا ئەویشیان ئەوەندە فراوانترە لە ژیانی بەرزەخ و دوای مردن[1].

نوستنیش پێی دەگوترێ مردن وەکو الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٞ مُّسَمّٗىۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ [الأنعام: ٦٠] واتە: وە هەر ئەو پەروەردگارەیە کە دەتان خەوێنێ (دەتان مرێنێ) لە شەودا وە ئەشزانێ (لە ڕۆژدا) چ کارێکتان ئەنجامداوە پاشان لە ڕۆژدا لە خەو بێدارتان دەکاتەوە بۆ ئەوەی تەواو ببێ ماوەی دەیاری کراو(ی هەموو کەسێ) ئەوسا هەر بۆ لای ئەوە گەڕانەوەتان پاشان هەواڵتان پێ دەدات بەهەر کردەوەیەك کە کردوتانە.

## مردن کارێکی حەتمیە و هەموو کەس و گیانلەبەرێك دەگرێتەوە:

مردن دەبێت بەسەرتدا بێت و هەر پێی دەگەیت کەس نیە لە مردن ڕزگاری بوبێت الله تعالی دەفەرموێت: ﴿كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥۚ لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ [القصص: ٨٨] واتە: جگە لە الله هەموو شتێك لەناو دەچێ جگە لەزاتی الله بڕیار و حوکم هەر بۆ اللهیە و تەنها بۆ لای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە.

﴿كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٖ*وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ رَبِّكَ ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ﴾ [الرحمن: ٢٦-٢٧] واتە: هەرچی کەس لەسەر زەویدایە نامێنێ و تیا دەچێ * وە هەر پەروەردگارت دەمێنێ کە خاوەن شکۆی ڕێزدارە.

[1] الروح، ص: ١٥٥.

﴿كُلُّ نَفسٍ ذَآئِقَةُ ٱلمَوتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّونَ أُجُورَكُم يَومَ ٱلقِيٰمَةِ فَمَن زُحزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدخِلَ ٱلجَنَّةَ فَقَد فَازَ وَمَا ٱلحَيَوٰةُ ٱلدونيآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلغُرُورِ﴾ [ال عمران: ١٨٥] واتە: هەموو (خاوەن) گیانێک مردن دەچێژێت وە بەڕاستی بەتەواوی پێتان دەدرێت پاداشتەکانتان لە ڕۆژی دوایدا (هەستانەوەدا) ئینجا هەرکەس دورخرێتەوە لە ئاگری دۆزەخ و بخرێتە بەهەشتەوە ئەوە بەڕاستی ئەو کەسە سەرکەوتوە ژیانی دونیاش هیچ شتێک نیە بێجگە لە بەهرە و ئارەزویەکی فریودەر.

ئەگەر کەسێک ڕزگاری ببوایە لە مردن دەبوایە خۆشەویسترین کەس لەلای الله تعالی کە پێغەمبەری پێشەوایە نەمردبا وەکو شاعیر دەفەرموێ: (وَلَوْ كَانَتِ الدونيا تَدُومُ لأَهْلِهَا لَكَانَ رَسُولُ اللهِ فِيهَا مُخَلَّدُ[١]) واتە: ئەگەر دونیا بۆ هەر کەسێک بمایەتەوە دەبوایە پێغەمبەر (ﷺ) لە دونیادا هەمیشەیی بوایە.

الله تعالی دەفەرموێتە پێغەمبەریش: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾ [الزمر: ٣٠] واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بەڕاستی تۆ دەمری و ئەوانیش دەمرن.

﴿وَمَا جَعَلنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبلِكَ ٱلخُلدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلخَٰلِدُونَ﴾ [الأنبياء: ٣٤] واتە: بڕیارمان نەداوە بۆ هیچ کەسێك لە پێش تۆوە مانەوەی هەمیشەیی (نەمری) ئینجا ئەگەر تۆ بمری (دوای مردنی تۆ) جا ئایا ئەوان ژیانیان بەردەوام دەبێ و نامرن (نەخێر).

مردن شتێکی حەق و ڕەوایە بڕوات پێی هەبێ یان نەبێ هەر بەسەرتدا دێت مرۆڤ و ئینسانەکان هەم جنۆکەکانیش دەبێت بمرن، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ- لا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَنْ تُضِلَّنِي، أَنْتَ الحَيُّ الَّذِي لا يَمُوتُ، وَالْجِنُّ وَالإِنْسُ يَمُوتُون[٢]» واتە: خۆم بە گەورەیی تۆ پەنا دەدەم ئەی پەروەرگارم کە هیچ پەرستراوێکی حەق و ڕەوا نیە بێجگە لە تۆ، تۆی کە نامری و مردنت بەسەردا نایەت، جنۆکە و ئینسانەکان هەموویان دەمرن.

[١] كتاب موارد الظمآن لدروس الزمان (٥٥٦/٦) قصيدة زهدية.

[٢] صحيح مسلم (٢٧١٧)، صحيح البخاري (٧٣٨٣)، مسند أحمد (٢٧٤٨).

ئەو مردنە هەر لە سکی دایکمانەوە بۆمان دانراوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ مَلَكًا فَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ، وَيُقَالُ لَهُ: اكْتُبْ عَمَلَهُ، وَرِزْقَهُ، وَأَجَلَهُ، وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ، ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ الرُّوحُ[1]» واتە: هەریەکێ لە ئێوە کە الله تعالی دروستی دەکات چل ڕۆژ لە سکی دایکیدا بە (نوتفە) تۆمەیی کۆدە کرێتەوە و دەمێنێتە، لە پاشدا دەبێت بە پارچە خوێنێکی مەیو چل ڕۆژیش بەو شێوەیە دەمێنێتەوە، لە پاشدا دەبێت بە پارچە گۆشتێ چل روژیش بەو شێوەیە دەمێنێتەوە، ئینجا الله تعالی فەرمان دەکات بەو مەلائیکەیە کە ڕۆح دەکات بە بەریا ئەم چوار وشەیە بنوسێت: ڕزقی، و کار و کردەوەی، و ئەجەل و ئاکامی، لە پاشدا بۆی دەنوسێت کامەران و بەختەوەرە یان بەدبەخت و بەدکارە، لە پاشدا ڕۆح دەکات بە بەریا.

## هەرکەس و گیانلەبەرێك لە کاتی ئەجەلی خۆی دەبێت بمرێت:

ئەجەل و کاتی هەموو شتەکان دیاریکراوە لەلای الله تعالی و گۆڕانی بەسەردا نایەت، هیچ کەسێک ناتوانێت لەو ئەجەلە ڕزگاری ببێت، کە الله تعالی فەرموی فڵانە کەس دەبێت بمرێت لەو چرکەدا دەبێت بمرێت ئەگەر هەموو دونیا لە دەوری بێت و پاسەوانی لێبکات ئەگەر هەموو پزیشکەکان لە دەوری کۆبوبێتەوە و نەخۆش بێت هەرچارەی ئەو کەسەی پێ ناکرێت ئیلا مردن دەیگاتێ و گیانی دەردەچێ و دەبێ بمرێ.

الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ كِتَٰبٗا مُّؤَجَّلٗاۗ﴾ [ال عمران: ١٤٥] واتە: هیچ کەسێک نەبوە کە بمرێت مەگەر بە فەرمانی الله کە نوسراوە و دیاری کراوە.

﴿أَيۡنَمَا تَكُونُواْ يُدۡرِككُّمُ ٱلۡمَوۡتُ وَلَوۡ كُنتُمۡ فِي بُرُوجٖ مُّشَيَّدَةٖۗ﴾ [النساء: ٧٨] واتە: لەهەر شوێنێك بن مردن پێتان دەگات با لەناو قەڵا و کۆشکی بەرز و قایمیشدابن.

[1] صحيح البخاري (٣٢٠٨) (٣٣٣٢) (٦٥٩٤)، صحيح مسلم (٢٦٤٣) (٢٦٤٥)، سنن أبي داود (٤٧٠٨).

﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُم لَا يَستَأخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَستَقدِمُونَ﴾ [الأعراف: ٣٤] واتە: وە بۆ هەموو ئوممەتێ کاتێکی دیاری کراو هەیە (بۆ مردن و سزادانیان) ئینجا کاتێ ماوە(ی مردن یا سزا)کەیان هات ساتێك دواناکەون و پێشیش ناکەون.

﴿قُل إِنَّ ٱلمَوتَ ٱلَّذِي تَفِرُّونَ مِنهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُم﴾ [الجمعة: ٨] واتە: بلّێ بەڕاستی ئەو مردنەی کە لێی ڕادەکەن بێگومان پێتان دەگات و توشتان دەبێ.

ئوم حەبیبە کە خوشکی موعاویەیە و کچی ئەبو سوفیانە -رضي الله عنها- دەفەرموێ: «اللَّهُمَّ أَمْتِعْنِي بِزَوْجِي رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، وَبِأَبِي أَبِي سُفْيَانَ، وَبِأَخِي مُعَاوِيَةَ. قَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): قَدْ سَأَلْتِ اللَّهَ لِآجَالٍ مَضْرُوبَةٍ، وَأَيَّامٍ مَعْدُودَةٍ، وَأَرْزَاقٍ مَقْسُومَةٍ، لَنْ يُعَجِّلَ شَيْئًا قَبْلَ حِلِّهِ، أَوْ يُؤَخِّرَ شَيْئًا عَنْ حِلِّهِ، وَلَوْ كُنْتِ سَأَلْتِ اللَّهَ أَنْ يُعِيذَكِ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ، أَوْ عَذَابٍ فِي الْقَبْرِ؛ كَانَ خَيْرًا وَأَفْضَلَ[1]» واتە: یا اللە تام و چێژی ئەوەم پێ ببەخشە کە من هەر هاوسەری پێغەمبەری اللەبم (ﷺ)، وە تاموچێژی ئەوەم پێ ببەخشە باوکم ئەبو سوفیان بێت و بمێنێ لەگەڵمدا، وە برایەکەشم موعاویە[2]، گوتی: پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: تۆ ئەی ئوم حەبیبە داوات لە اللە کرد بۆ چەند ئەجەلێک کە بڕاوەتەوە، چەند ڕۆژانێکی دونیایە کە دەبڕێتەوە و دەژمێردرێن، چەند ڕزق و ڕۆزیەکیشە لەلای اللە بڕاوەتەوە، هیچێکیان هەتا فەرمان و ئەمری اللە دەرنەچێت ناگاتە شوێنی خۆی، هەر یەکێکیش لەوانەی داوات کرد لەگەڵت بژین ئەجەلی هەریەکێکیان بێت تاخیر نابێت، ئەگەر داوات لە اللە بکردبا پەنای دابای لە ئاگری دۆزەخ، یان عەزابی قەبر؛ ئەوە بۆ تۆ باشتر و پلەدارتر بوو.

## ئەجەلمان لێ دیار نیە هەتا پێمان دەگات:

ئێمە نازانین کەی دەمرین ئایە چەند چرکە و سەعاتێکی ترە ڕۆژێکی ترە چەند ساڵێکی ترە هەریەکێک لە ئێمە ئەجەلمان دیاریکراوە و ناشزانین چ کاتێک پێی دەگەین ئەوە غەیبە و

[1] صحيح مسلم (٢٦٦٣)، مسند أحمد (٣٧٠٠) (٣٧٤٧) (٣٧٦٨).

[2] لەو کاتەدا وای گوت کە ئەو ئایەتەی گوێ لێبوو: ﴿نَحنُ قَدَّرنَا بَينَكُمُ ٱلمَوتَ وَمَا نَحنُ بِمَسبُوقِينَ﴾ [الواقعة: ٥٦] واتە: ئێمە لەناوتاندا مردنمان داناوە وە کەس پێش دەسەڵاتی ئێمە ناکەوێ.

لەلای اللهیە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ﴾ [لقمان: ٣٤] واتە: بەڕاستی تەنها لای اللهیە زانیاری (کاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی وە هەر الله باران دەبارێنێ تەنها الله دەزانێ بەوەی لە منداڵدانی ( دایکان)دایە[١] وە هیچ کەس نازانێ سبەینێ (لە داهاتودا) چی دەکات وە هیچ کەس نازانێ لە چ شوێن و زەوییەکدا دەمرێ بەڕاستی الله زانا و ئاگادارە.

پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ: «مِفْتاحُ الغَيْبِ خَمْسٌ لا يَعْلَمُها إلّا اللَّهُ: لا يَعْلَمُ أَحَدٌ ما يَكونُ في غَدٍ، ولا يَعْلَمُ أَحَدٌ ما يَكونُ في الأرْحامِ، ولا تَعْلَمُ نَفْسٌ ماذا تَكْسِبُ غَدًا، وما تَدْرِي نَفْسٌ بأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ، وما يَدْرِي أَحَدٌ مَتى يَجِيءُ المَطَرُ[٢]» واتە: کلیلی غەیب پێنج شتە مەگەر تەنها الله بیانزانێت: هیچ کەسێک نازانێت سبەینێ چی دەبێت، هیچ کەسێکیش نازانێت چی لە منداڵداندا دەبێت، کەسیش نازانێت کە سبەینێ چی دەکات، هیچ کەسیش نازانێت لەکوێدا دەمرێت، هیچ کەسیش نازانێت کەی باران دێت.

لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «إذا أراد اللهُ قبضَ عبدٍ بأرضٍ جعلَ لهُ فيها حاجةً[٣]» واتە: ئەگەر الله بیەوێ ڕۆحی هەر کەسێک لە هەر زەویەک بکێشێت

[١] لێمان دەپرسن ئێستا دونیا بەرەو پێشەوە چوە سۆنەر هەیە و بە سۆنەردا دەزاندرێ ئایە نێرە یان مێیە ئەو کۆرپەلەی ناو رەحمی دایکی، لە شەریعەتی ئیسلام زانایانی ئیسلام فتوایان بەم شێوەیە داوە دەفەرمون: جائیز نیە بۆ (دکتۆرەکەش) بۆ (خاوەن کۆرپەلەکەش) سەدا سەد جەزمی بکات بڵێ ئەوە نێرە یان مێیە، لەبەر ئەوەی هەندێکجار درۆش دەرچوە ڕاستیش دەرنەچوە سۆنەرەکە، بەڵام با دکتۆرەکە بڵێ ئێمە بەو شێوەیە پێشبینی دەکەین بە گوێرەی عیلم و طوبی جیازەکە وا پیشان دەدات ئەوە نێرینەیە و مێینە نیە بەو شێوەیە بیروباوەڕی سەلامەتە دکتۆرەکە، ئەویش لەدوای چەند مانگێک بە تەواوی دەزانێت، لە یەکەم چرکەدا کاتێک دڵۆپە ئاوی پیاو یەک دڵۆپە ئاو ملیۆنەها نوتفە لە خۆوە دەگرێت یەکێک لەو نوتفانە دەبێتە منداڵ و لەگەڵ هێلکۆکەی ئافرەتدا دەیپیتێنێت لەو کاتەدا کەس عیلمی پێی نیە نە دکتۆرێک دەیزانێت و نە عیلمی نوێش دەزانێت ئەوە چیە و دەبێتە چی و چی لێ دەردەچێ والله أعلم.

[٢] صحيح البخاري (١٠٣٩) (٤٦٢٧) (٤٦٩٧)، مسند أحمد (٤٧٦٦) (٥١٣٣) (٥٢٢٦).

[٣] حكم الحديث: إسناده صحيح، رجاله ثقات، مسند أحمد (١٥٥٣٩)، سنن الترمذي (٢١٤٧).

ئەوە کارێکی دەهێنێتە پێش هەتاوەکو کەسەکە بەدوای ئەو کارەدا بچێت و لەوێدا ئەجەل لێی میوان دەبێت.

**پرسێك:** حیکمەت لە مردندا چییە؟

**وەڵام:** حیکمەت لە مردندا بۆ چەند خاڵێک دەگەڕێتەوە:

١.مردن ئەوپەڕی هێز و توانای الله تعالی دەردەخات یەکێکە لە نیشانەکانی گەورەیی الله تعالی، مردن شتێکە زۆر جێگای سەرسوڕمانە کەسێک کە لەگەڵ تۆدا دەژی کە ئەجەلی هات لەناکاودا گیانی دەردەچێت.

٢.الله تعالی کە مردن و ژیانی دروستکردوە بۆ تاقیکردنەوەی ئێمەیە، هەروەکو دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ﴾ [الملك: ٢] واتە: ئەو پەروەردگارەی کە مردن و ژیانی دروستکرد بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کامەتان کار و کردەوەی چاکترە وە هەر ئەوە باڵادەست و لێ خۆشبوو.

٣.الله تعالی مرۆڤی وا دروست نەکردوە لاشە و جەستەکەی لە ژیانی دونیادا هەمیشەیی بێت، بەو شێوازەی دروستکردوە کە کاتێک بە تەمەندا دەچێت پەکی بکەوێت، ئەوەش وات لێدەکات کۆتایت پێ دەهێنێت و دەتباتە ژیانێکی تر، بە لاشە و جەستەیەکی تر زیندوت دەکاتەوە ئەو هەمیشەیی بێت و کۆتایی پێ نەیەت.

٤.تۆ لەزەت دەکەیت لە نیعمەت و خۆشیەکان بەتەواوەتی، کاتێک دەزانیت کۆتایی هاتنی بەدوایە هەوڵی ئەوە دەدەی تام و چێژی تەواو لە حەڵاڵەکان بکەیت وە لەسەر زەویدا بەو شێوەیە بژیت الله لە خۆت ڕازی بکەیت چونکە دەزانیت ڕۆژێک لەناو دەچی و مردنی بەدوادا دێت.

٥.پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «الدونيا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ، وجَنَّةُ الكافِرِ[1]» واتە دونیا زیندانیە بۆ ئیمانداران، وە بەهەشتە بۆ کافرەکان.

[1] صحيح مسلم (٢٩٥٦)، سنن الترمذي (٢٣٢٤)، سنن ابن ماجه (٤١١٣).

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل-رحمه الله- کە تازە لە سجن دەرهاتبوو دوای ماوەیەکی کەم وەفات دەکات، عەبدوڵای کوڕی دەبینێت وا باوکی خوێن دەڕشێنێتەوە کاتێک بۆ قەزای حاجە دادەنیشت، خوێنی دادەبەزاند لەبەر تەعزیب و ناخۆشیەکانی ناو سجن کە تەحەمولی کردبوو ئەو ئیمامە بەڕێزە، عەبدوڵای کوڕیشی لەبەرامبەری دانیشت و چاوی فرمێسکی کرد، فەرموی: بابە گیان سوێند بە الله من کوڕی گەورەی تۆم لەوەتەی فامم کردوە نەمبینیوە تۆ ڕۆژ و شەوێک بحەسێیتەوە من بینیومە شەوان یان شەو و نوێژت کردوە یان خەریکی عیلم و زانستی بوی، بە ڕۆژ بینیومە یان دەرز و وانەت وتوەتەوە یان چوی سوڵحت لەنێوان خەڵکدا کردوە یان کەسابەتی حەڵاڵت کردوە، بینیومە لەسەر فتوایە حەقەکانت سجن کرایت و تەعزیب درایت جوێن و قسەی ناخۆشت پێ گوتراوە یان عارەقت ڕشتوە یان خوێنت لێ هێنراوە، بابەگیان نەمبینی ڕۆژێک بحەسێیتەوە، سۆزی کوڕ و باوکایەتی دەنوێنم بۆت، ئیمامی ئەحمەد فەرموی: ڕۆڵەی شیرینیم وەرە با فرمێسکەکانت بسڕمەوە ژیانی ئیماندار نابێت حەسانەوەی هەبێ، ئەو هەموو ماندوبونە بۆ ئەوەیە چونکە ئەوە ژیانی دونیایە و الله ژیانی دونیای بۆ تاقیکردنەوە داناوە، هەموی بۆ ئەوەیەتی باوکت یەکەم چرکە کە (ملك الموت) لێی میوان دەبێت بۆ ئەوەی گیانی بکێشێت، هەرکاتێک منیان برد لەناو گۆڕە تەنگ و تاریکەکەی دایاننام لەوێدا الله تعالى ئیسراحەتی هەمیشەیم پێشکەش بکات و بە نسیبم ببێت و بحەسێمەوە.

بەڵێ مردن بۆ ئیماندار حەسانەوەیە لە ناخۆشی و زەحمەتیەکانی دونیا وەکو الله تعالى دەفەرموێ: ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ﴾ [ال عمران: ١٩٨] واتە: ئەوەی کە لای اللهیە چاکترە بۆ پیاو چاکان.

وە سەبارەت بە کافرەکان دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ [ال عمران: ١٧٨] واتە: هەرگیز واگومان

نەبەن ئەوانەی کەبێ باوەڕن ئەو مۆڵەت دانی ئێمە بۆ ئەوان قازانجە بۆیان بەڕاستی ئێمە مۆڵەتی ئەوان ئەدەین بۆ ئەوەی گوناحی زیاتر بکەن. وە بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی ڕیسواکەر.

سەبارەت بە شەهیدەکانیش دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢا بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ﴾ [ال عمران: ١٦٩] واتە: هەرگیز وا گومان مەبەن ئەوانەی کە کوژران لە ڕێی اللهدا مردون (نەخێر وانیە) بەڵکو ئەوانە زیندون لای پەروەردگاریان ڕۆزی دەدرێن.

## تەنها پێغەمبەران سەرپشککراون لەنێوان هەڵبژاردنی ژیانی دونیا و مردنیان:

دایکە عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «إِنَّهُ لَمْ يُقْبَضْ نَبِيٌّ قَطُّ، حَتَّى يَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الجَنَّةِ، ثُمَّ يُخَيَّرُ، فَلَمَّا نَزَلَ بِهِ وَرَأْسُهُ عَلَى فَخِذِي، غُشِيَ عَلَيْهِ سَاعَةً، ثُمَّ أَفَاقَ، فَأَشْخَصَ بَصَرَهُ إِلَى السَّقْفِ، ثُمَّ قَالَ: اللهُمَّ الرَّفِيقَ الأَعْلَى، قُلْتُ: إِذًا لاَ يَخْتَارُنَا، وَعَرَفْتُ أَنَّهُ الحَدِيثُ الَّذِي كَانَ يُحَدِّثُنَا بِهِ، قَالَتْ: فَكَانَتْ تِلْكَ آخِرَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا النَّبِيُّ (ﷺ)، قَوْلُهُ: اللهُمَّ الرَّفِيقَ الأَعْلَى، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا﴾ [النساء: ٦٩][1]» واتە: هیچ پێغەمبەرێک گیانی نەکێشراوە هەتا شوێنی خۆی لە بەهەشتدا بینیوە، دواتر سەرپشککراوە لە نێوان ئەوەی کە گیانی بکێشرێت یان ماوەیەکی تر بمێنێتەوە لە ژیاندا، پاشان چاوی بەرز کردەوە و سەری لەسەر کۆشی من بوو، ماوەیەک لە هۆش خۆی چوو، کاتێک بەهۆش خۆی هاتەوە، چاوی هەڵبڕیبوە سەقفی ماڵەکەمان، پاشان دەیفەرموو: یا الله بۆ لای بڵندترین هاوڕێ، وتم: ئەو کات زانیم پێغەمبەر (ﷺ) ئێمەی هەڵنەبژارد و نەیویست تەمەنی درێژبێتەوە، و زانیم ئەمە ئەو فەرمودەیەتی کە لە کاتی ساغیدا پێهانی دەفەرمو، کۆتا وشە کە هەر دوبارەی دەکردەوە دەیفەرمووو: یا الله بۆ لای بڵندترین هاوڕێ، وە گوێم لێبوو دەیفەرمووو: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا﴾ [النساء: ٦٩] واتە: وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی الله

[1] صحيح البخاري (٤٤٣٧) (٤٤٣٥) (٤٤٣٦)، صحيح مسلم (٢١٩١) (٢٤٤٤)، سنن الترمذي (٣٤٩٦).

و پێغەمبەر بکات جا ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن کە اللە بەهرەی ڕشتوە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان وە ئەوانە چ هاوڕێ و هاوەڵێکی چاکن.

## کاتی سەرە مەرگ سەخترین چرکەیە لە ژیانی مرۆڤدا:

لەبەر چەند خاڵێک کاتی سەرەمەرگ سەخترین ساتی ژیانی مرۆڤە:

١.چونکە دەگوازرێیتەوە لە ژیانێکەوە کە بە چاوی سەر بینیوتە و دەستت داوە لە شتەکان و تام و بۆنت کردوە و بیستوتە، بۆ ژیانێکی تر کە تەنها بیستوتە و تامت نەکردوە و لەگەڵی نەژیاوی و شتێکی نامۆیە لەلات

٢.لەکاتی سەرەمەرگدا هەر مرۆڤێک بە باش و بە خراپ فریشتەکان دەبینێت، بە بینینیان دەزانێت حیسابی ڕۆشتوە، ئەگەر باشبێ ژیانی دوای ڕۆح کێشانەکەی بەختەوەری بێت ئەوە هەمیشەییە و ئەگەر بەدبەختیش بێت دوبارە هەمیشەییە، وەکو اللە تعالی دەفەرموێ: ﴿وَلَو أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَا فِي ٱلأَرضِ جَمِيعًا وَمِثلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفتَدَواْ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلعَذَابِ يَومَ ٱلقِيَٰمَةِ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَم يَكُونُواْ يَحتَسِبُونَ﴾ [الزمر: ٤٧] واتە: ئەگەر بەراستی هەرچی لەم زەویەدایە و ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێت هی ستەمکاران و کافران بێ لە بەر سزای توندی قیامەت ئامادەن بیکەنە فیدیەی خۆیان تا رزگار ببن وە لەلایەن اللەوە بۆیان دەرکەوت شتیوا کە ئەوان بیریان لێ نەکردۆتەوە و گومانیان بۆی نەچوە.

٣.ئەو مرۆڤە لە عومریدا ئەوەی کۆی کردوەتەوە لە ژیان و پارە و هاوسەر و منداڵەکان و لە دەوروبەری و لەو عیلم و زانستی و پەرتوک و کیتابانەش کە ئەگەر هەیبوبێ لە هەر هەموی دابڕانە.

٤.مردن موسیبەتە دەزانی قیامەت دێت بە تایبەت ئەگەر کردەوەی زۆر چاکت نەبوبێت لەسەر تۆبەکاری نەمردبی، لەبەر ئەوەیە دەگێڕنەوە ستالین ئەو کابرا بێ بڕوایە سەردەمێک سەرۆکی ئیتیحادی سۆفیەتی بوو، ئەو پیاوەبوو دەیگوت اللە بونی نیە، ئەو پیاوە بوو کە لەشکری سوری هەبوو، دەیگوت ئەگەر دونیا بکەمە پێنج بەش چوار بەشیان

قەتڵ و عام بکەم و خوێنی هەمویان بڕژێنم یەک بەشیان بێتە سەر فکرە و بیروبۆچونی ئێمە کە شوعیەت و ستالینزمیەتە پێم ئاساییە، ستالین ئەو پیاوەبوو کە ناوی دەهات دەبوایە سەربازەکان تەحیەی بۆ بکەن و سەلامی بۆ وەربگرنەوە ئەگینا عقوبەی دەدان و تۆڵەی لێ دەستاندنەوە، بەڵام کچەکەی دەگێڕێتەوە دەڵێ لە سەرەمەرگدا باوکم لە نەخۆشخانە دانرابوو نەخۆش کەوتبوو، تەنها کەتیبەیەک لە دەبابە و مودەرەعە حیمایەتی ئەو نەخۆشخانەی دەکرد، هەر لە دەرگای یەکەمی نەخۆشخانەکە هەتا دەگەشتە ژورەکەی باوکم شازدە سەیتەرەی موخابەرایەتیان دانابوو، هەموو کەسێک بۆی نەبوو هاتوچۆی بکات و بیّت و بچێت، (لەناو ئەو هەموانە منیش دەڵێم (ملك الموت) ئەوەی ڕۆح کێشانی بەدەستە بەناو هەمواندا ڕۆیی و حیسابی بۆ کەسیان نەکرد)، پاشان کچەکەی دەگێڕێتەوە و دەڵێ بینیم باوکم لە هۆش خۆی چو بوو بەڵام بینیم چاوی هەڵبڕیبوە ئاسمان و دەستەکانی بەرز دەکردەوە و دەتگوت دەپاڕێتەوە و شتێک دەڵێت، هەستمان پێی نەدەکرد شەقی لە ڕانەکانی خۆی دەدا، بە دڵنیاییەوە ئەوە ئەو کاتە بوە کە فریشتەکانی بینیوە زانیویەتی ئەو قسە پڕوپوچانەی کارل مارکسی گەندەڵی بۆگەن هەموی درۆ بوە کە گوتویەتی الله بونی نیە، فریشتەکانی بینیوە زانیویەتی تازە کار لە کار ترازا مەجالی ئەوە نەماوە تەوبەی لێ قبوڵ ببێت ئێستا گیانە پیسەکەی دەکێشرێ دەگەڕێنرێتەوە لای الله تعالى و تۆڵەی لێ دەستێندرێتەوە.

لەبەر ئەوەیە سەرەمەرگ یەکجار بێزار و ناخۆشە بە بینینی فریشتەکان یان بە تەوەقوع نەکردنی ئەو شتانەی کە لە مێشک و دڵتدایە و هەندێکجار الله تعالى دەیهێنێتە پێشت، وەکو دەفەرموێ: ﴿وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَم يَكُونُواْ يَحتَسِبُونَ﴾ [الزمر: ٤٧] واتە: وە لەلایەن اللهوە بۆیان دەرکەوت شتی وا کە ئەوان بیریان لێ نەکردۆتەوە و گومانیان بۆی نەچوە.

٥.تەمەنی هەرە درێژی سەردەمی خۆمان و ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە سەد و پەنجا ساڵ تێپەڕی نەکردوە، بەڵام ژیانی دوای مردن کە لە سەرەمەرگدا تۆ بۆت یەکلا دەبێتەوە و

دەیبینی بەختەوەری یان بەدبەختی بە هەزارەها ساڵە و بێ کۆتایە، هەنگاونانە بۆ ژیانێک کە هەرگیز کۆتایی بەسەردا نایەت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «أعمارُ أمَّتي ما بينَ السِّتِّينَ والسَّبعينَ وأقلُّهم من يجوزُ ذلِكَ[1]» واتە: تەمەنی ئومەتی من لەنێوان شەست تا حەفتا ساڵە وە کەمیان هەیە لە حەفتا ساڵی تێپەڕ بکەن.

## ئامادەبونی شەیتان لەکاتی سەرەمەرگ و ڕۆحدانی ئینسان:

شەیتانی ئیبلیسی نگریس لەگەڵ دار و دەستەکەی (جنۆکە شەیتانیەکان) خۆیان ئامادە دەکەن لەو کاتە ترسناکەدا بۆ زۆر کەس دێنە سەری دەیانەوێ لە خشتەی بەرن ئاخر چرکەی ژیانێتی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «إنَّ الشَّيْطانَ يَحْضُرُ أَحَدَكُمْ عِنْدَ كُلِّ شيءٍ مِن شَأْنِه[2]» واتە: شەیتان لە هەموو ئیش و کارەکانی ئێوە ئامادە دەبێت وە هەر شتێکیشت بەسەربێت (مردنیش لە هەموی ترسناکتر و خەتەرناکترە شەیتان لەوێدا ئامادە دەبێت).

زانایان فەرمویانە لە کاتی سەرە مەرگدا شەیتان دێت و وازت لێ ناهێنێت خۆی دەهێنێتە سەر وێنەی دایکت یان باوکت دەڵێت من ئامۆژگاری کاری تۆم وەرە ئەو دینەی لەسەری بوی دینی موحەمەد (ﷺ) ڕاست نیە وەرە ببە جولەکە ببە دیان کافر بەوە بە دینی پێغەمبەر (ﷺ)، قورِت بەسەر ئەگەر لەوکاتەدا بەقسەی شەیتان بکەیت، نابێ وابزانیت ئەوە دایک و باوکە، هەرکەسێک بێت مادەم ڕێگات لێ ون دەکات پشتی تێ بکە و بە لەعنەتی بکە، ئەگەر لە کۆڕ و مەجلیسە نەسیحەتیەکان (دینیەکان) ئامادە بوبی لە ژیانی دونیادا وە پیاوێکی باش بوبی و عیلم و زانستیت هەبوبێ و خاوەن تەقوا و عیبادەت بوبی ئەوە لەو کاتەدا دەزانیت ئەوە شەیتانی ئیبلیسی نگریسە یان دار و دەستەکەی ئەوە لەعنەتی لێدەکەیت و لەخۆتی دور دەخەیتەوە.

---

[1] هذا حديث حسن غريب من حديث محمد بن عمرو، عن أبي سلمة، عن أبي هريرة، عن النبي صلى الله عليه وسلم، لا نعرفه إلا من هذا الوجه، وقد روي عن أبي هريرة من غير هذا الوجه. حكم الحديث: حسن، سنن الترمذي (٣٥٥٠)، سنن الترمذي (٢٣٣١)، سنن ابن ماجه (٤٢٣٦).

[2] صحيح مسلم (٢٠٣٣)، سنن الترمذي (١٨٠٢)، سنن ابن ماجه (٣٢٦٩) (٣٢٧٠) (٣٢٧٩).

لەبەر ئەوەیە ئەو دۆعایە دەبێ هەردەم بخوێنین کە اللە تعالی دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ﴾ [ال عمران: ٨] واتە: ئەڵێن ئەی پەروەردگارمان لای مەدە (لە ڕێی ڕاست) دڵەکانمان دوای ئەوەی کە ڕێنمونیت کردین وە پێیان ببەخشە لە لای خۆتەوە بەزەییەک (میهرەبانیەک) بەڕاستی هەر تۆی بەخشندە.

ئیمامی ئەحمەد لەسەرەمەرگدایە و شەیتان وازی لێناهێنێت بۆخۆی بۆمان دەگێڕێتەوە، عەبدوڵای کوڕی دەفەرموێ: باوکم لە سەرەمەرگ بوو منیش لە خزمەت باوکمدا بوم باوکم ماوە ماوە کە لە هۆش خۆی دەچوو منیش لەبن گوێچکەی کە دەمگوت (لا إله إلا الله) دەڵێ باوکم لە وەڵامدا دەیگوت نا هێشتا نا هێشتا! دەڵێ منیش زۆرم پێ سەیر بوو کاتێک بەهۆش خۆی هاتەوە گوتم: باوکە گیان ئەوە من چەند جارێک لە پشت سەری بەرێزت بوم و پێمدەگوتی (لا إله إلا الله) تۆ هەر دەڵێی نا هێشتا نا هێشتا! ئەوە چییە و مەبەستت لێی چیە؟ دەڵێ ئەویش گوتی: (إبليس قائم جذائي، عاض على أنامله، يقول لي: يا أحمد فتني، و أنا أقول له: لا بعد، حتى أموت[1]) واتە: ئەوە شەیتانە کوڕم وا هاتوە لەبەر پێم ڕاوەستاوە ڕوی لە من کردوە، و پەنجەی خۆی دەگەزێ، و دەڵێ: لە دەستم چوی قوتارت بوو ئەحمەد دەچی بەرەو بەهەشت، دەڵێ منیش دەڵێم: نا هێشتا نا هێشتا، ماومە تاوەکو ڕۆحم دەرنەچێ و نەمرم لەسەر (لا إله إلا الله) هێشتا قوتارم نەبوە تۆ دەتەوێ لەخشتەم بەری ئەی شەیتان (ئەوە وەڵامی ئەو دەدەمەوە).

ئیمامی قورتوبیش دەفەرموێ: لە مامۆستاکەی خۆم (أبوو العباس أحمد بن عمر القرطبي) بیست گوتی برای مامۆستاکەم (أبوو جعفر أحمد موحەممەد القرطبي) لە شاری قورتوبە لە سەرەمەرگدا بوو ئێمەش لە خزمەتیدا بوین پێیان دەگوت بڵێ (لا إله إلا الله)[2]، ئەویش لە

---

[1] أبو نعيم في الحلية (٩/١٨٣)، والذهبي في السير (١١/٣٤١) وقال: هذه حكاية غريبة وتفرد بها ابن علم، فالله أعلم.

[2] (کە ئەوە سونەتە لە دەوروبەری ئەو کەسەی لە سەرەمەرگدا بێت ئەو قسە و وشە بگوترێ تاوەکو ئەویش بەبیری بێتەوە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (عن أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) صحيح مسلم (٩١٦)، سنن أبي داود (٣١١٧)، سنن الترمذي (٩٧٦). واتە: ابوو سعيد

وەڵامدا دەیگوت: نەخێر! نەخێر! لەدوای ئەوەی بەهۆش خۆی هاتەوە و ئەوەمان پێگوت، گوتی: وەڵاهی ئەوە شەیتان بوو! هاتبوو یەکیان لەلای دەستە ڕاستم بوو، یەکیان لەلای دەستە چەپم بوو، ئەوەی دەستە ڕاستم دەیگوت: من باوکتم ڕۆڵەی شیرینم باشی تۆم دەوێت، بمرە لەسەر جولەکایەتی! باشترین دینداری و دین هی جولەکەکانە! ئەوەی لای دەستە چەپەیشم دەیگوت: لەسەر نەسرانیەت بمرە! ئەو باشترین ئاینە! منیش لە وەڵامی ئەو دوو شەیتانە دەمگوت: نەخێر نەخێر لەسەر ئیسلام دەمرم[1].

مەرج نیە هەموو کەسێک لە سەرەمەرگدا شەیتان بێتە سەری وەکو إبن تيمية-رحمه الله- دەفەرموێ: (أن الشيطان أحرص ما يكون على إغواء الإنسان وقت موته؛ واستدلَّ بالحديث الذي في الصحيح: «الأعمال ب اللهتيمها».

وقال (ﷺ): «إن العبد ليعملُ بعمل أهل الجنَّة حتى ما يكون بينه وبينها إلا ذراع، فيسبقُ عليه الكتاب، فيعملُ بعملِ أهل النار فيدخلُها، وإن العبد ليعملُ بعمل أهل النار حتى ما يكون بينه وبينها إلا ذراع، فيسبقُ عليه الكتاب، فيعمل بعمل أهل الجنَّة فيدخلها».

ولهذا رُوِيَ: أن الشيطان أشد ما يكون على ابن آدم حين الموت، يقول لأعوانه: دونكم هذا، فإنه إن فاتكم لن تظفروا به أبدًا[2]).

واتە: لە هەموو کات زیاتر پێ دادەگرێ شەیتان بۆ ئەوەی ئینسان و مرۆڤەکان گومڕا بکات لە کاتی سەرەمەرگدا؛ ئەو حەدیسە سەحیحەش بە بەڵگە دەهێنێتەوە: ((کار و کردەوە بە کۆتاییە).

الخدری دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لا الة الا الله) بدەن بەگوێی مردووەکانتاندا. واتە: ئەوانەی کەلە سەرەمەرگدان.

[1] القرطبي رحمه الله "التذكرة" باب ما جاء أن الميت يحضر الشيطان عند موته وجلساؤه في الدنيا وما يخاف من سوء الخاتمة.

[2] مجموع الفتاوى: (٢٥٦/٤)، نقلاً من القيامة الصغرى، ص: ٢٩-٣٠.

یان پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «کەسی وەها هەیە لەئێوە کار و کردەوەی ئەهلی بەهەشت دەکات تاوەکو نێوانی ئەو و نێوانی بەهەشت ئەوەندەی باسکێکی دەمێنێت بچێتە ناوی، نوسراوەکەی ناو سکی دایکی بەپێشی دەکەوێت، کار و کردەوەی ئەهلی دۆزەخ دەکات دەچێتە ناو دۆزەخ، وە کەسی وەهاشتان هەیە کار و کردەوەی ئەهلی دۆزەخ دەکات تاوەکو نێوانی ئەو و نێوانی دۆزەخ ئەوەندەی باسکێکی دەمێنێت، نوسراوەکەی ناو سکی دایکی بەپێشی دەکەوێت، وە کار و کردەوەی ئەهلی بەهەشت دەکات وە دەچێتە بەهەشت».

یان ڕیوایەت کراوە: شەیتان دەڵێتە جنۆکە شەیتانیەکان: لە خەڵکەکە بگەڕێن، بڕۆن خەریکی ئەو کەسانەبن کە لە سەرەمەرگدان، ئاگاتان لێیان بێت خۆ ئەگەر لە دەستمان بچن لەسەر (لا إله إلا الله) و ئیمان بمرن ئەوە لە دەستمان دەچن هەتا هەتایی و جارێکیتر پێیان ناوێرین.

دەرگای تەوبە ڕاستە داناخرێ هەتا ڕۆح دێتە گەردنت، بەڵام ئایە تۆ تەوبەت بە نسیب دەبێت یاخود نا؟ ئەگەر لە سەرەتادا هەوڵی بۆ بدەیت و ئەمڕۆ تەوبە بکەیت باشترە لە بەیانی و لە دوو بەیانی و دوای نەخەیت و کەمتەرخەمی لێنەکەیت نەوەکو پێی ڕانەگەیت، چونکە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلتَّوبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَة ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيب فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيهِم وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا * وَلَيسَتِ ٱلتَّوبَةُ لِلَّذِينَ يَعمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلمَوتُ قَالَ إِنِّي تُبتُ ٱلـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُم كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ أَعتَدنَا لَهُم عَذَابًا أَلِيمًا﴾ [النساء: ١٧-١٨] واتە: بێگومان وەرگرتنی تەوبە لای الله تەنها بۆ ئەوانەیە کە گوناح دەکەن بە نەفامی پاشان پەشیمان دەبنەوە بە زوویی (پێش مردن) ئا ئەوانە الله گەڕانەوەیان لێ وەردەگرێت اللەش هەمیشە زانای دانایە * پەشیمانی (وەرگرتن) نیە بۆ ئەوانەی تاوانی زۆر دەکەن هەتا کاتی سەرە مەرگی یەکێکیان دێ دەڵێت: بەڕاستی من ئێستا تەوبەم کرد وە بۆ ئەوانەش نیە کە دەمرن بە بێ بڕوایی ئەوانەی (باسکران) ئامادەمان کردوە بۆیان سزایەکی ئازاردەر.

پێغه‌مبه‌ریش (ﷺ) فه‌رمویه‌تی: «إنَّ اللهَ يَقبَلُ توبةَ العبدِ ما لم يُغَرْغِرْ[1]» واته‌: الله ته‌وبه‌ی عه‌بده‌كان قبوڵ ده‌كات مادەم گیان نه‌گه‌شتبێته‌ گه‌ردنیان.

## ناخۆشیه‌كانی گیاندان و ڕۆح كێشان:

سه‌ره‌مه‌رگ بۆ هه‌موو كه‌سێک ناخۆشی و ئازاری هه‌یه‌، كه‌س نیه‌ له‌ ئازاری سه‌ره‌مه‌رگ قوتاری ببێت به‌ڵام ڕه‌نگه‌ هه‌ندێک كه‌س هه‌بێ ئازاری ڕۆكێشانه‌كه‌ی زۆر كه‌م بێت به‌ڵام بڕوادار له‌به‌ر ئیمانی وه‌ ئه‌وانه‌ی له‌پێناو الله شه‌هید ده‌بن له‌سه‌ریان زۆر كه‌م ده‌بێته‌وه‌ به‌ڵام به‌قه‌ده‌ر تۆزێک هه‌ر تامی ڕۆح كێشان ده‌كه‌ن، وه‌ پێغه‌مبه‌ری پێشه‌واش (ﷺ) له‌سه‌ره‌تادا كه‌ باسمان كرد ئه‌ویش تامی هه‌ندێک له‌ ڕۆح كێشانی كرد، ئه‌وه‌ سونه‌تی اللهیه‌ و به‌سه‌ر هه‌مومان دێت، الله تعالى ده‌فه‌رموێ: ﴿وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ﴾ [ق: ١٩] واته‌: ناڕه‌حه‌تی و بێهۆشی مردن دێت له‌گه‌ڵ ڕاستیه‌كاندا (پێی ده‌گوترێ) ئه‌مه‌ ئه‌و (مردنه‌)یه‌ كه‌ خۆت لێ ده‌پاراست و لاده‌دا.

ئیلا ئه‌و كه‌سه‌ی له‌ پێناو الله تعالى شه‌هید ده‌بێ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌فه‌رموێ: «الشهيدُ لا يَجِدُ ألَم القتْلِ إلَّا كما يَجِدُ أحدُكم مَسَّ القرصَةِ[2]» واته‌: كه‌سێک له‌ پێناوی الله شه‌هیدبێ ئازاری كوشتنه‌كه‌ی و گیان كێشانه‌كه‌ی ئیلا به‌قه‌ده‌ر قنوچكێک ده‌ی ئێشێ[3].

## سه‌ره‌مه‌رگ و ڕۆحدانی بڕوادار و كافر و بێ بڕوایان:

الله تعالى ده‌فه‌رموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ [يونس: ٦٢] واته‌: ئاگادار بن بێگومان دۆستانی الله ترسیان له‌سه‌ر نیه‌ (له‌ كاتی سه‌ره‌مه‌رگدا) خه‌فه‌تیش ناخۆن (له‌وه‌ی به‌جێیان هێشتوه‌ له‌ دونیا).

---

[1] هذا حديث حسن غريب. حكم الحديث: حسن، حدثنا محمد بن بشار، قال: حدثنا أبو عامر العقدي، عن عبد الرحمن بن ثابت بن ثوبان، عن أبيه، عن مكحول، عن جبير بن نفير، عن ابن عمر، عن النبي صلى الله عليه وسلم بمعناه، حكم الحديث: حسن، سنن الترمذي (٣٥٣٧)، سنن ابن ماجه (٤٢٥٣)، مسند أحمد (٦١٦٠. ٦٤٠٨).

[2] سنن الدارمي (٢٤٥٢)، سنن الترمذي (١٦٦٨)، سنن النسائي (٣١٦١).

[3] زانایان ده‌فه‌رمون ئه‌وه‌ ئازاری ڕۆح كێشانه‌.

بەڵام وەلیەکان کێن؟ هەر ئەو کەسە وەلیە کە باوکی شێخ بوە و ئەویش بەچکە شێخە! نەخێر، ئەوانە وەلی نین، ئەگەر ڕێگای پێغەمبەر (ﷺ) و الله تعالی یان نەگردبێتە بەر ئەگەر گوناح و تاوان بکەن الله تعالی، بڕاندویەتیەوە سیفەتی وەلیەکان چیە فەرمویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ * لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدونيا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ لَا تَبدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلفَوزُ ٱلعَظِيمُ﴾ [يونس: ٦٣-٦٤] واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لە الله دەترسن * هەر بۆ ئەوانە مزگێنی لە ژیانی دونیادا و لە دوارۆژیشدا گوڕان نیە بۆ وتە (و بەڵێنە)کانی الله هەر ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە.

هەندێک لە موفەسیرین دەفەرمون: ﴿لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدونيا﴾ یان بە خەونی باش بینینە کە موسڵمان لە ژیانی دونیای خەونی باش ببینێ بەو هۆیەوە موژدەی بۆ دێت لەلایەن الله تعالی، وە هەندێکیشیان دەفەرمون: نەخێر مەبەست پێی ئەوەیە لە کاتی سەرەمەرگدا فریشتەکان موژدەی لێخۆشبونی الله تعالی و چونە بەهەشت بە ئیماندارەکە دەبەخشن، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «إن المؤمن إذا حضره الموت جاءه الملائكة بيض الوجوه بيض الثياب فقالوا اخرجي أيتها الروح الطيبة إلى روح وريحان ورَبَّ غير غضبان فتخرج تسيل كما تسيل القطرة من في السقاء[1]» واتە: بڕوادار کە دێتە سەرەمەرگ فریشتەکان دێنە سەری هەتا چاوی حوکم دەکات ئەو فریشتانە دەموچاویان دەبریسکێتەوە و سپی و ڕوگەشن پێی دەڵێن ئەی وەرە دەرەوە گیانی پاک و بێگەرد بڕۆ بەر ڕەحمەتی الله تعالی و بەرفراوانی بڕۆ بەر لێخۆشبونی الله تعالی بڕۆوە بگەڕێوە لای الله تعالی کە تورە نیە ڕۆحەکە دەردەچێ لە لاشەی ئەو کەسە بڕوادارە هەروەکو چۆن دۆلکەیەک شۆڕکەیتەوە چەند بە ئاسان لێی دەتکێت و دێتە خوار ئاوا بە ئاسانی ڕۆح و گیانەکە دەچێتە دەستی فریشتەکان.

الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلقَاهِرُ فَوقَ عِبَادِهِۦ وَيُرسِلُ عَلَيكُم حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلمَوتُ تَوَفَّتهُ رُسُلُنَا وَهُم لَا يُفَرِّطُونَ﴾ [الأنعام: ٦١] واتە: ئەو (الله) زاڵ و دەسەڵاتدارە بەسەر

[1] حكم الحديث: إسناده صحيح على شرط الشيخين، مسند أحمد (٢٥٠٨٩) (٨٧٦٩) (٢٤٢٦٨)، صحيح البخاري (٧١٣١)، صحيح مسلم (٥٨٤) (٩٠٣) (٩٠٥).

بەندەکانیدا و فریشتانێکتان بۆ دەنێرێت (کە چاودێر و پارێزەر و نوسەری کردەوەکانتانن) تا کاتی مردنی یەکێکتان دێت فریشتەکانمان گیانی دەکێشن کە هیچ سستی و کەمتەرخەمیەك ناکەن لە کارەکانیاندا[١].

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمویەتی: «إنَّ العبدَ المؤْمن إذا كان في انْقطاعٍ من الدونيا، وإقْبالٍ من الْآخِرَة، نزل إليه من السَّماءِ ملائكةٌ بِيضُ الوجُوه، كأَنَّ وجوهَهُمُ الشمسُ، معهُمْ كفنٌ من أكْفانِ الجنَّة، وحَنُوطٌ من حَنُوطِ الجَنَّة، حتى يَجْلِسُوا منه مَدَّ البَصَر، ثُمَّ يَجِيءُ (ملك الموت) حتى يَجلِسَ عندَ رأسِه فيَقولُ: أيَّتُها النَّفْسُ الطَّيِّبَةُ اخْرُجِي إلى مغْفِرةٍ من اللَّهِ ورِضْوانٍ، فتخْرُجُ تَسِيلُ كما تسِيلُ القَطْرَةُ من فِي السِّقاءِ، فيأخذُها فإذا أخذها لم يدَعوها في يدِه طرفةَ عينٍ حتّى يأخذوها فيجعلوها في ذلك الكفنِ[٢]» واتە: بەڕاستی بەندەی ئیماندار ئەگەر گەیشتە کاتی دابڕان لە دونیا، و ڕوکردن لە دوارۆژ، هەندێك فریشتەی ڕومەت سپی ڕومەتیان وەکو خۆر وایە، لە ئاسمانەوە دادەبەزن بۆلای، کفنیان پێیە لە کفنی بەهەشت، وە بۆنی خۆشیان پێیە لە بۆنی بەهەشت، وە لە لایدا دادەنیشن تاوەکو چاو بڕبکات، پاشان فریشتە ی گیان کێشان[٣] دێت تاوەکو لەلای سەریەوە دادەنیشێت و پێی دەڵێت: ئەی گیانە پاکەکە وەرە دەرەوە بۆلای لێخۆشبون و ڕازیبونی پەروەردگار، گیانی دێتە دەرەوە و دادە چۆڕێت هەروەکو چۆن دڵۆپە ئاوێك لە دەمی کونەیەکەوە دادەچۆڕێت، پاشان فریشتەی گیان کێشان گیانەکە دەبات، جا ئەگە ر بردی فریشتەکانی تر کە بە دەوریدا دانیشتون بە ئەندازەی چاو تروکاندێك نایهێڵن بەدەستیەوە تاوەکو لـێی وەردەگرن و یەکسەر دەیخەنە نێو ئەو کفنەوە و ئەو بۆنە خۆشەوە.

[١] زانایان دەفەرمون: ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەرکەسێک بگات بە سەرەمەرگ فریشتە دێنە سەری.

[٢] حكم الحديث: إسناده صحيح رجاله رجال الصحيح، مسند أحمد (١٨٥٣٤) (١٨٥٣٥) (١٨٥٣٦)، سنن أبي داود (٣٢١٢) (٤٧٥٣)، سنن النسائي (٢٠٠١).

[٣] فریشتەی گیان کێشان کە لەناو ئێمە بەناوبانگە بە ئیزڕائیل هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە ناوی ئیزڕائیل بێت، بەڵام بەڵگەی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئەوەیە ناوی براوە بە (ملك الموت).

ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بڕوادار فریشتەکان دێن دەوری لێ دەدەن هەتاوەکو چاوی حوکم دەکات، ئەو فریشتانەی کە موژدەیان بۆ هێناوە و دەموچاویان گەشاوەیە وە کفنی بەهەشتیان بۆ هێناوە و (حَنُوطْ)یشیان بۆ هێناوە کە خۆشترین بۆنە بۆ ئەوەی لێی بدەن.

کافر و بێ بڕوا ئەویش بەهەمان شێوە فریشتە دێنە سەری کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «وإنَّ العبدَ الكافِرَ إذا كان في انقِطاعٍ من الدونيا، وإقبالٍ من الآخِرةِ، نزل إليه من السماءِ ملائكةٌ سُودُ الوجُوهِ معَهُمُ المُسُوحُ، فيجلِسُونَ منه مَدَّ البَصَرِ، ثُمَّ يَجيءُ (ملك الموت) حتى يَجْلِسَ عِنْدَ رَأْسِهِ فَيَقُولُ: يا أَيَّتُها النَّفْسُ الْخَبِيثَةُ اخْرُجِي إلى سَخَطٍ من اللَّهِ وغَضَبٍ، فَتَفْرَّقُ في جَسَدِهِ فَيَنتَزِعُها كما يُنتَزَعُ السَّفُّودُ من الصُّوفِ المَبْلُولِ[1]» واتە: بەڕاستی بەندەی کافر (وە لە ریوایەتێکی تردا: خراپەکار) ئەگەر گەیشتەکاتی دابڕان لە دونیا، و ڕوکردن لە دوارۆژ، هەندێك فریشتەی (توند و تیژ) لە ئاسمانەوە دادەبەزن بۆ لای ڕومەتیان ڕەشە و کفنیان پێیە لە ئاگر، لە لایدا دادەنیشن تاوەکو چاو بڕ بکات، پاشان فریشتەی گیان کێشان دێت تاوەکو لەلای سەریەوە دادەنیشێت و پێی دەڵێت: ئەی گیانە پیسەکە وەرە دەرەوە بۆلای خەشم و قین و تورەیی الله، ڕۆحەکەی بە لاشەیدا بڵاودەبێتەوە و فریشتەی گیان کێشانیش ڕایدەکێشێتە دەرەوە هە روەکو چۆن شیشێکی زۆر قولاپدار لە خوریەکی تەڕدا ڕابکێشرێت (لەگەڵ ئە وەدا هەموو دەمار و ڕەگ و ماسولکەکانی پارچە پارچە دەبێت و دەبڕێن).

الله تعالى یش باسی کردوە کەسی بڕوادار فریشتەی موژدەدەر دێنە سەری دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ * نَحۡنُ أَوۡلِيَآؤُكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَشۡتَهِيٓ أَنفُسُكُمۡ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ * نُزُلٗا مِّنۡ غَفُورٖ رَّحِيمٖ﴾ [فصلت: ٣٠-٣٣] واتە: بەڕاستی ئەوانەی گوتیان الله پەروەردگارمانە و لەپاشان ڕاست (لەسەر ئایین) بەردەوام بون فریشتەکان پۆل پۆل دێنە لایان (کاتی مردن یان زیندو بونەوە) (پێیان دەڵێن) کە مەترسن و خەفەت مەخۆن

[1] حكم الحديث: إسناده صحيح رجاله رجال الصحيح، مسند أحمد (١٨٥٣٤) (١٨٥٣٥) (١٨٥٣٦)، سنن أبي داود (٣٢١٢) (٤٧٥٣)، سنن النسائي (٢٠٠١).

وه مژده‌بێ لێتان به‌و به‌هه‌شته‌ی كه به‌ڵێنتان پێ درابوو * ئێمه له‌ژیانی دونیا و له ڕۆژی دوایدا دۆستی ئێوه‌ین وه له‌و (به‌هه‌شته‌دا) هه‌رچی حه‌زی لێ بكه‌ی بۆتان ئاماده‌یه وه هه‌رچی داوا بكه‌ن له‌وێدا له خزمه‌تاندایه * ڕێز لێنان و میوانداریه له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگاری لێبورده‌ی میهره‌بانه‌وه.

سه‌باره‌ت به كه‌سی كافریش الله تعالى فه‌رمویه‌تی: ﴿وَلَو تَرَىٰٓ إِذ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلمَلَٰٓئِكَةُ يَضرِبُونَ وُجُوهَهُم وَأَدبَٰرَهُم وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلحَرِيقِ * ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَت أَيدِيكُم وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلعَبِيدِ﴾ [الأنفال: ٥٠-٥١] واته: وه ئه‌گه‌ر ده‌تبینی كاتێ فریشته‌كان گیانی بێ باوه‌ڕان ده‌كێشن له ده‌موچاو و پاشیان ده‌ده‌ن و (پێیان ده‌ڵێن) بچێژن سزای ئاگری سوتێنه‌ر * ئه‌و (ئازار و سزایه) له‌به‌ر ئه‌وكاره خراپانه‌یه له پێشه‌وه ده‌تانكرد وه وه بێگومانیشبن هه‌رگیز الله غه‌در له به‌نده‌كانی خۆی ناكات.

له ئایه‌تێكی تریشدا فه‌رمویه‌تی: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلمَوتُ قَالَ رَبِّ ٱرجِعُونِ * لَعَلِّيٓ أَعمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكتُ كَلَّآ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا وَمِن وَرَآئِهِم بَرزَخٌ إِلَىٰ يَومِ يُبعَثُونَ﴾ [المؤمنون: ٩٩-١٠٠] واته: بێ بڕوایان هه‌ر درێژه به‌كاری خراپ و بێ بڕوایی خۆیان ده‌ده‌ن تا كاتێ مردن یه‌خه‌ی یه‌كه به‌یه‌كه‌یان ده‌گرێت و ئه‌حواڵی ئاخیره‌تی بۆ ئاشكرا ده‌بێ ئه‌وسا ئه‌ڵێ: په‌روه‌ردگارم! بمگێڕه‌وه بۆ دونیا * به‌ڵكو كرده‌وه‌ی چاك بكه‌م (له بری ئه‌وه‌ی نه‌مكردوه) له‌و ته‌مه‌نه‌ی له‌ده‌ستم چوو نه‌خێر بێگومان ئه‌مه‌(ی ده‌یڵێ) ته‌نها قسه‌یه‌كه ئه‌و ده‌یڵێ (ئه‌گه‌ر بگه‌ڕێته‌وه بۆ دونیا هه‌روه‌ك جاران ده‌بێت) و له به‌رده‌میاندا به‌رزه‌خێك (به‌ربه‌ستێك) هه‌یه تا ئه‌و ڕۆژه‌ی زیندو ده‌كرێنه‌وه.

پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) به بڕواداره ڕاسته‌قینه‌كان فه‌رمویه‌تی: «مَن أَحَبَّ لِقاءَ اللَّهِ أحَبَّ اللَّهُ لِقاءَهُ، ومَن كَرِهَ لِقاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقاءَهُ. قالَتْ عائِشَةُ أوْ بَعْضُ أزْواجِهِ: إنّا لَنَكْرَهُ المَوْتَ، قالَ: ليسَ ذاكِ، ولَكِنَّ المُؤْمِنَ إذا حَضَرَهُ المَوْتُ بُشِّرَ برِضْوانِ اللَّهِ وكَرامَتِهِ، فليسَ شيءٌ أحَبَّ إلَيْهِ ممّا أمامَهُ؛ فأحَبَّ لِقاءَ اللَّهِ، وأَحَبَّ اللَّهُ لِقاءَهُ، وإنَّ الكافِرَ إذا حُضِرَ بُشِّرَ بعَذابِ اللَّهِ وعُقُوبَتِهِ، فليسَ شيءٌ أكْرَهَ

إِلَيْهِ مِمّا أمامَهُ؛ كَرِهَ لِقاءَ اللَّهِ، وكَرِهَ اللَّهُ لِقاءَهُ[1]» واتە: هەر کەسێك پێی خۆش بێت بە دیداری الله شاد بێت اللەش پێی خۆشە بە دیداری ئەو کەسە شاد بێت، وە هەر کەسێك پێی خۆش نەبوو بە دیداری الله شاد بێت اللەش پێی خۆش نیە بە دیداری ئەو کەسە شاد بێت. عائیشە یان هەندێک لە هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویان: ئێمە مردنمان پێ خۆش نیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەوە مردن پێی مەبەست نیە (هەموو کەسێک مردنی پێ ناخۆشە)، بەڵام بڕوادار گەر گەشتە سەرەمەرگ موژدەی پێ دەدرێ بە ڕەزامەندی الله و ڕێزی بۆی، هیچ شتێک هێندەی ئەوە لەلای خۆشەویست و دڵگیر نابێ ئەوەی لەپێشێتی لەدوای ئەوەی کە موژدەکەی پێ دەدرێ؛ ئەو کات حەزدەکات و تامەزرۆی ئەوەی دەبێ بگات بە دیداری الله، اللەش حەزدەکات بە دیداری بگات، بەڵام کافر لە سەرەمەرگدا موژدەی عەزابی الله و تۆڵەسەندنەوەی پێ دەدرێ، هیچ شتێک نیە هێندەی ئەوە پێی ناخۆش بێت کە لەپێشێتی و پێی دەگات؛ حەز بە دیداری الله ناکات، اللەش حەزی ئەوەی نیە بگات بە دیداری.

لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «إذا وُضِعَتِ الجنازَةُ، واحْتَمَلَها الرِّجالُ على أَعْناقِهِمْ، فإنْ كانَتْ صالِحَةً، قالَتْ: قَدِّمُونِي، وإنْ كانَتْ غيرَ صالِحَةٍ، قالَتْ: يا ويْلَها أَيْنَ يَذْهَبُونَ بها؟ يَسْمَعُ صَوْتَها كُلُّ شيءٍ إلّا الإنْسانَ، ولو سَمِعَهُ صَعِقَ[2]» واتە: کاتێ جەنازە دانرا، و پیاوان کردیانە سەر شانیان، ئەگەر پیاو چاک بێت، دەڵێ: پێشم بخەن پێشم بخەن، وە ئەگەر پیاو چاک نەبێت، دەڵێ: ئەی هاوار بۆ کوێ دەمبەن؟ هەموو شتێک گوێی لە دەنگیەتی جگە لە مرۆڤ، ئەگەر مرۆڤ گوێی لێبێت بێهۆش دەبێت.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «إذا خَرَجَتْ رُوحُ الْمُؤْمِنِ تَلَقّاها مَلَكانِ يُصْعِدانِها. قالَ حَمّادٌ: فَذَكَرَ مِن طِيبِ رِيحِها وذَكَرَ المِسْكَ. قالَ: ويقولُ أهْلُ السَّماءِ: رُوحٌ طَيِّبَةٌ جاءَتْ مِن قِبَلِ الأرْضِ، صَلّى اللَّهُ عَلَيْكِ وعلى جَسَدٍ كُنْتِ تَعْمُرِينَهُ، فيُنْطَلَقُ به إلى رَبِّهِ عزَّ وجلَّ، ثُمَّ يقولُ: انْطَلِقُوا به إلى آخِرِ

[1] صحيح البخاري (٦٥٠٧)، صحيح مسلم (٢٦٨٣) (٢٦٨٤) (٢٦٨٥)، سنن الترمذي (١٠٦٦) (١٠٦٧) (٢٣٠٩).
[2] صحيح البخاري (١٣١٤) (١٣١٦) (١٣٨٠)، سنن النسائي (١٩٠٩)، مسند أحمد (١١٣٧٢) (١١٥٥٢).

الأجَلِ[1]» واتە: کاتێ گیانی ئیماندار دەردەچێت، دوو فریشتە پێشوازی لێ دەکەن و بەرزی دەکەنەوە. (حماد کە یەکێکە لە ڕاویەکان) دەڵێ: جا باسی بۆنخۆشی و باسی میسکی کرد (کە لەو گیان و ڕۆحە پاکەوە دەبیسرێت) بۆیە نیشتەجێکانی ئاسمان دەڵێن: گیانێکی پاك و چاکە و لە زەویەوە هاتوە، دەك (سەڵاتی) اللهت لەسەر بێت[2]، لەسەر ئەو لاشەیەش کە بەتۆ ئاوەدان بوو. ئەوسا دەبرێت بۆ لای پەروەردگاری، ئەویش دەفەرموێت: (بیبەن بۆ ئەوپەڕی شوێنی دیاری کراوی خۆی).

لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمویەتی: «قال: فَيَصْعَدُونَ بها فلا يَمُرُّونَ –يعني– بها على مَلَأٍ من الملائكةِ إلا قالوا: ما هذا الرُّوحُ الطَّيِّبُ؟ فيقولونَ: فلانُ ابنُ فلانٍ بأَحْسَنِ أسمائِهِ التي كانوا يُسَمُّونَهُ بها في الدونيا، حتى يَنْتَهُوا بها إلى السماءِ الدونيا، فَيَسْتَفْتِحُونَ له، فيُفْتَحُ لهم، فيُشَيِّعُهُ من كلِّ سماءٍ مُقَرَّبُوها، إلى السماءِ التي تَلِيها، حتى يُنْتَهَي به إلى السماءِ السابعةِ، فيقولُ اللهُ عَزَّ وجَلَّ: اكْتُبُوا كتابَ عَبْدِي في عِلِّيِّينَ ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ * كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ * يَشۡهَدُهُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ﴾ [المطففين: ١٩-٢١] فيُكْتَبُ كتابُه في عِلِّيِّينَ، ثم يُقالُ: أَعِيدُوهُ إلى الأرضِ، فإني وَعَدْتُهُم أني،﴿مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ﴾ [طه: ٥٥][3]» واتە: پاشان دەیبەنە سەرەوە بۆ ئاسمان و ئەو ڕۆحە تێناپەڕێنن بەلای هیچ کۆمەڵە فریشتەیەکدا ئیلا دەڵێن: ئەوا ئەم ڕۆحە پاکە هی کێیە؟ ئەو فریشتانەش کە ڕۆحەکەیان پێیە دەڵێن: ئەمە ڕۆحی (فڵان)ی کوڕی (فڵان)ە ناوی دەبەن بە جوانترین ناوی کە لە دونیادا ناویان پێی دەبرد، تاوەکو دەیگەینە ئاسمانی دونیا، داوا دەکەن دەرگای ئاسمانی بۆبکرێتەوە، دەرگای بۆ

[1] صحيح مسلم (٢٨٧٢)، سنن النسائي (١٨٣٣)، سنن ابن ماجه (٤٢٦٢).

[2] سەڵات لەلای زانایان بە دوو واتا دێت:

١. الله ڕەحمەت پێ بکات.

٢. لە سەحیحی بوخاری هاتوە ئەبو عالیە دەفەرموێ: «والصَّلاةُ من اللهِ تعالى على العَبدِ ثناؤه عليه عند مَلائِكته» واتە: سەڵات لەلایەن الله تعالى لەسەر عەبد بە واتای ئەی پەروەردگار بە فڵانە کەس هەڵ بڵێ و مەدحی بکە لەلای فریشتەکان.

[3] حكم الحديث: إسناده صحيح رجاله رجال الصحيح، مسند أحمد (١٨٥٣٥) (١٨٥٣٦) (١٨٦١٤) (١٨٦٢٥)، سنن أبي داود (٣٢١٢) (٤٧٥٣)، سنن النسائي (٢٠٠١).

دەکرێتەوە، پاشان فریشتە نزیکەکانی هەموو ئاسمانێك شوێنی ئەو ڕۆحە دەکەون، بۆ ئەو ئاسمانەی کە بە دوایدا دێت، تاوەکو دەیگەیەننە ئاسمانی حەوتەم، پاشان الله عز وجل دەفەرموێت: کتێبی بەندەکەم لە (علیین)دا بنوسن یەکسەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ * كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ * يَشۡهَدُهُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ﴾ [المطففين: ١٩-٢١] واتە: جا تۆ چوزانییت ئەو جێگا بەرزە چیە؟ * دەفتەرێکی نوسراو(ی ئەمەندە بەفەڕە) * فریشتە نزیکەکانی الله دەیکەنەوە و ئەیبینن و ئامادەی ئەبن، واتە نامەی کردەوەکان لای فریشتەکان هەڵگیراوە. جا کتێبەکەی لە کتێبی بەرزدا دەنوسرێت، پاشان الله تعالی دەفەرموێت: ڕۆحەکە بگێڕنەوە بۆ زەوی،﴿مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ﴾ [طه: ٥٥] واتە: چونکە بەڕاستی من بەڵێنم پێ داون کە بە ڕاستی من لەو زەویە دروستیانم کردوە، و دەشیان گێڕمەوە بۆ ناوی و جارێکی تریش لە زەوی دەریان دەهێنمە دەرەوە.

سەبارەت بە کەسی کافریش پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: «قالَ: وإنَّ الكافرَ إذا خَرَجَتْ رُوحُهُ، قالَ حَمّادٌ: وذَكَرَ من نَتْنِها، وذَكَرَ لَعْنًا، ويقولُ أهْلُ السَّماءِ: رُوحٌ خَبِيثَةٌ جاءَتْ من قِبَلِ الأرْضِ. قالَ: فيُقالُ: انْطَلِقُوا به إلى آخِرِ الأجَلِ، قالَ أبو هُرَيْرَةَ: فَرَدَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) رَيْطَةً كَانَتْ عَلَيْه عَلَى أَنْفِهِ هَكَذَا[1]» واتە: کافریش کە گیانی دەردەچێت (حماد) دەڵێت (ابوهریرە) باسی بۆگەنی کرد و نەفرینیشی لێ کرد، خەڵکی ئاسمان دەڵێن: گیانێکی پیسە لە زەویەوە هاتوە، پاشان فەرمان دەدرێت: ببەن بۆ ئەوپەڕی ئەو شوێنەی کە بۆی دیاری کراوە. جا (ابوهریرە) دەڵێ: پێغەمبەر پارچە قوماشێکی بەسەر شانەوە بوو لوتی خۆی پێ گرت.

لە فەرمودەکەی بەڕائی کوڕی عازبیش پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «فإذا أخذها، لم يَدَعُوها في يَدِهِ طَرْفَةَ عينٍ حتى يَجْعَلُوها في تِلْكِ الْمُسُوحِ، ويخرجُ منها كأَنْتَنِ ريحِ جيفَةٍ وُجِدَتْ على وجهِ الأرضِ، فيَصْعَدُونَ بها فلا يَمُرُّونَ بها على مَلَأٍ من الملائكةِ إلا قالوا: ما هذا الرُّوحُ الخَبِيثُ؟ فيقولونَ: فلانُ ابنُ فلانٍ بأَقْبَحِ أسمائِهِ التي كان يُسَمَّى بها في الدونيا، حتى يُنْتَهَي به إلى السماءِ

[1] صحيح مسلم (٢٨٧٢)، سنن النسائي (١٨٣٣)، سنن ابن ماجه (٤٢٦٢).

الدونيا، فيُسْتَفْتَحُ له، فلا يُفْتَحُ له، ثم قرأ رسولُ الله (ﷺ) ﴿لا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوابُ السَّماءِ وَلا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِياطِ﴾ فيقولُ اللهُ عَزَّ وجَلَّ: اكْتُبُوا كتابَه في سِجِّينَ في الأرضِ السُّفْلى، ثم يُقالُ: أَعِيدُوا عَبْدِي إلى الأرضِ فإني وَعَدْتُهُمْ أني،﴿مِنها خَلَقنَـٰكُم وَفِيهَا نُعِيدُكُم وَمِنها نُخرِجُكُم تَارَةً أُخرَىٰ﴾ [طه: ٥٥]، فتُطْرَحُ رُوحُهُ من السماءِ طَرْحًا حتى تَقَعَ في جَسَدِهِ ثم قرأ: ﴿وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّما خَرَّ مِنَ السَّماءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكانٍ سَحِيقٍ﴾ [الحج: ٣١][1]» واتە: پاشان فریشتەی گیان کێشان گیانەکە دەبات، جا ئەگەر بردی فریشتەکانی تر کە بە دەوریدا دانیشتون بە ئەندازەی چاو تروکاندنێك نایهێڵن بە دەستیەوە تاوەکو لـێی وەردەگـرن و یەکسەر دەیخەنە ناو ئەو کفنە ئاگریـــنەوە، بۆنێکی گەنیوی لـێ دێتە دەرەوە وەك گەنیوترین بۆنی لاکێکی تۆپیو کە لەسەر ڕوی زەویدا هەبوبێت، پاشان دەیبەنە سەرەوە بۆ ئاسمان و ئەو ڕۆحە تێناپەڕێنن بە لای هیچ کۆمەڵە فریشتەیەکدا ئیلا دەڵێن: ئەوا ئەم ڕۆحە پیسە هی کێیە؟ ئەو فریشتانەش کە ڕۆحەکەیان پێیە دەڵێن: ئەمە ڕۆحی (فلان)ی کوڕی (فلان)ـە، ناوی دەبەن بە ناشیرین ترین ناوی کە لە دونیادا ناویان پێی دەبرد، تاوەکو دەیگەیەننە ئاسمانی دونیا، داوا دەکەن دەرگای ئاسمانی بۆ بکرێتەوە، دەرگای بۆ ناکرێتەوە، پاشان پێغەمبەری الله (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿لا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوابُ السَّماءِ وَلا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِياطِ﴾ [الأعراف: ٤٠] واتە: دەرگاکانی ئاسمان ناکرێتەوە بۆ بێ باوەڕان و ناشچنە ناو بەهەشتەوە تاوەکو وشتر نەچێت بە کونە دەرزیدا. پاشان الله تعالی دەفەرموێت: کتێبەکەی لە(سجين)دا لە خوارترین تەبەقەی زەویدا بنوسن، پاشان الله تعالی دەفەرموێت: ڕۆحەکە بگێڕنەوە بۆ زەوی،﴿مِنها خَلَقنَـٰكُم وَفِيهَا نُعِيدُكُم وَمِنها نُخرِجُكُم تَارَةً أُخرَىٰ﴾ [طه: ٥٥] چونکە بە ڕاستی من بەڵێنم پێ داون کە بەڕاستی من لەو زەویە دروستیانم کردوە و دەشیان گێڕمەوە بۆ ناوی و جارێکی تریش لە زەوی دەریان دە هێنمە دەرەوە، پاشان ڕۆحەکەی لە ئاسمانەوە فڕێدەدرێتە

[1] حكم الحديث: إسناده صحيح رجاله رجال الصحيح، مسند أحمد (١٨٥٣٥) (١٨٥٣٦) (١٨٦١٤) (١٨٦٢٥)، سنن أبي داود (٣٢١٢) (٤٧٥٣)، سنن النسائي (٢٠٠١).

خوارەوە تاوەکو دەکەوێتە ناو لاشەکەی، پاشان پێغەمبەی الله (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾ [الحج: ٣١] واتە: جا هەر کەس هاوبەش بۆ الله دابنێ ئەوە وەك ئەوە وایە لە ئاسمان کەوتبێتە خوارەوە پاشان باڵندە (لە هەوادا) بەپەلە بیفڕێنێ (پارچە پارچە بێت) یا بایەکی توند بیبات بۆ جێگایەکی زۆر دور (چۆڵەوانی).

گوشینی گۆڕ هەمومان دەگرێتەوە بەڵام بۆ بڕوادار وەکو خۆشەویستێک وایە کە کەسێکی لەمێژەوە نەبینیوە زۆر بە توندی لە باوەشی خۆی بیگوشێت ئەگەر ئازاریشی پێ بگات بەڵام لایەنە مەعنەویەکەی خۆشی دەبینێت، زانایان دەفەرمون گوشینی گۆڕ بۆ بڕواداره ڕاستەقینەکان ئەو جۆرە گوشینەیە بەڵام بۆ کافر و مونافیقەکان گوشینێکە خۆی لە خۆیدا عەزابێکە هەتاوەکو کۆڵەکەی سینگیشی دەشکێنێت پەراسوەکانی لێک هەڵدەوەشێتەوە.

بەو فەرمودەیە ئەوە دەسەلمێندرێت قەبر تاریک و ترسناکە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «أَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ كَانَتْ تَقُمُّ الْمَسْجِدَ-أَوْ شَابًّا- فَفَقَدَهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَسَأَلَ عَنْهَا-أَوْ عَنْهُ- فَقَالُوا: مَاتَ، [ماتت] قَالَ: (أَفَلَا كُنْتُمْ آذَنْتُمُونِي). قَالَ: فَكَأَنَّهُمْ صَغَّرُوا أَمْرَهَا أَوْ أَمْرَهُ، فَقَالَ: (دُلُّونِي عَلَى [قبرها] قَبْرِهِ). فَدَلُّوهُ فَصَلَّى عَلَيْهَا، ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ هَذِهِ الْقُبُورَ مَمْلُوءَةٌ ظُلْمَةً عَلَى أَهْلِهَا، وَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُنَوِّرُهَا لَهُمْ بِصَلَاتِي عَلَيْهِمْ[1]» واتە: ئافرەتێکی ڕەش پێست،-یان لاوێك- گسکی مزگەوتی دەدا پێغەمبەر (ﷺ) چاوی بۆ گێڕا (دیار نەبو) هەواڵی پرسی، گوتیان: مرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (نەدەبوو ئاگادارتان بکردمایە؟). پێدەچو ئەوان بەکەمیان زانیبێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (گۆڕەکەیم نیشان بدەن) ئەوانیش نیشانیاندا ئەویش نوێژی لەسەر کرد، پاشان فەرموی: (ئەم گۆڕانە پڕن لە تاریکی بۆ نیشتەجێکانی، بێگومان الله تعالی بە نوێژ کردنی من لەسەریان بۆیان ڕوناك دەکاتەوە).

[1] صحيح مسلم (٩٥٦)، صحيح البخاري (٤٥٨) (٤٦٠) (١٣٣٧)، سنن أبي داود (٣٢٠٣).

بەو فەرمودەیەش ئەوە دەسەلمێندرێت گوشینی گۆڕ بۆ هەموو کەسێکە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «هَذَا الَّذِي تَحَرَّكَ لَهُ الْعَرْشُ، وَفُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَشَهِدَهُ سَبْعُونَ أَلْفًا مِنَ الْمَلَائِكَةِ، لَقَدْ ضُمَّ ضَمَّةً، ثُمَّ فُرِّجَ عَنْهُ[1]» واتە: ئەو کەسەی (واتە سەعدی کوڕی موعاز) کە عەرش لەبەر مردنی جوڵا و دەرگای ئاسمانەکانی بۆ کرایەوە، حەفتا هەزار لە فریشتەکانیش ئامادەی بون، لە گۆڕەکەیدا جارێک گوشرا، پاشان دەروی لێ کرایەوە (گوشینەکەی نەما).

لە فەرمودەیەکی تردا فەرمویەتی: «إِنَّ لِلْقَبْرِ ضَغْطَةً، وَلَوْ كَانَ أَحَدٌ نَاجِيًا مِنْهَا نَجَا مِنْهَا سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ[2]» واتە: قەبر گوشینێکی هەیە، ئەگەر کەسێکی نەگوشی بوایە سەعدی کوڕی موعاز نەجاتی دەبو.

قەبر بەڕاستی جێگای ئەوەیە زۆر لێی وردبیتەوە یەکەم هەنگاوە لەو هەنگاوانەی بەرەو دوارۆژت دەبات لە دونیات تەواو دادەبڕێنێت مەنزڵگایەکە ئەگەر ئەوێت لەسەر خۆت فراوان و ڕوناک کرد بردوتەوە لە قیامەتیش بە تەواوەتی لەسەرت خۆش دەبێت و بەهەشت بە دەست دەهێنیت، ئەگەر لەوێش قوتارت نەبوو و عەزاب درایت و تاریکایت بەسەرداهات و ڕوناک نەبووەوە ئەوکات قوڕت بەسەر دەبێت مەیدانی حەشر و حیساب تەنگترە و جەهەنەم و عەزاب ناخۆشتریشە بۆت.

دەگێڕنەوە لە عوسمانی کوڕی عەفان: (كان عثمانُ إذا وقَف على القبرِ بكى حتى تُبَلَّ لحيتُه، فقيل له، تذكُرُ الجنةَ والنارَ فلا تبكي، وتبكي من هذا؟! فقال إن النبيَّ (ﷺ) قال: إن القبرَ أول منازلَ الآخرةِ، فإن نجا منه، فما بعدَه أيسَرُ، وإن لم يَنجُ منه، فما بعدَه أشدُّ منه. قال: وقال رسولُ اللهِ (ﷺ): ما رأيتُ مَنظرًا قَطُّ إلا والقبرُ أفظَعُ منه[3]) واتە: ڕاوەستا لەسەر قەبرێک لە هاڕژنی گریانیدا تاوەکو ڕیشی هەموی تەڕ کرد، پاشان پێی گوترا، ئەی عوسمان تۆ بۆ بەو شێوەیە گریایت بۆ باسی بەهەشت و دۆزەخت بۆ بکرێت بەو شێوەیە ناگریەیت؟! پاشان فەرموی

[1] حكم الحديث: صحيح، سنن النسائي (٢٠٥٥).

[2] حكم الحديث: حديث صحيح، وهذا إسناد اختلف فيه على شعبة، مسند أحمد (٢٤٢٨٣) (٢٤٦٦٣).

[3] شعيب الأرنؤوط، تخريج شرح السنة (١٥٢٣)، إسناده حسن.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: گۆر یەکەم مەنزڵگایە لە شوێنەکانی دواڕۆژت، هەرکەسێک قوتاری ببێت لە گۆڕەکەی (ڕزگاری ببێت لە ناخۆشیەکان)، ئەوەی لەدوای گۆڕەکەی دێت ئەوی لەسەر سوکتر دەبێت، ئەگەر کەسەکەش قوتاری نەبوو لە گۆڕەکەی، ئەوە ئەوەی لەدوای ئەو دێت ناخۆشتر و زەحمەتترە، پاشان فەرموی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: هیچ شتێکم نەبینیوە دیمەن و وێنەی ناخۆشتر و ترسێنەرتربێت لە گۆڕ.

کاتێک لاشەی مردو لەناو گۆڕ دادەنرێت یەکەم جار پرسیارەکانی قەبر ڕوو دەکاتە ئەو کەسەی کە مردوە چ کەسی باوەڕدار چ کەسی بێ بڕوا.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «إِذَا قُبِرَ الْمَيِّتُ أَوْ قَالَ: أَحَدُكُمْ أَتَاهُ مَلَكَانِ أَسْوَدَانِ أَزْرَقَانِ يُقَالُ لِأَحَدِهِمَا: الْمُنْكَرُ، وَلِلْآخَرِ: النَّكِيرُ، فَيَقُولَانِ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟ فَيَقُولُ مَا كَانَ يَقُولُ: هُوَ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ محمدا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. فَيَقُولَانِ: قَدْ كُنَّا نَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُولُ هَذَا. ثُمَّ يُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ سَبْعُونَ ذِرَاعًا فِي سَبْعِينَ، ثُمَّ يُنَوَّرُ لَهُ فِيهِ، ثُمَّ يُقَالُ لَهُ: نَمْ. فَيَقُولُ: أَرْجِعُ إِلَى أَهْلِي فَأُخْبِرُهُمْ؟ فَيَقُولَانِ: نَمْ كَنَوْمَةِ الْعَرُوسِ الَّذِي لَا يُوقِظُهُ إِلَّا أَحَبُّ أَهْلِهِ إِلَيْهِ. حَتَّى يَبْعَثَهُ اللَّهُ مِنْ مَضْجَعِهِ ذَلِكَ، وَإِنْ كَانَ مُنَافِقًا قَالَ: سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ، فَقُلْتُ مِثْلَهُ: لَا أَدْرِي، فَيَقُولَانِ: قَدْ كُنَّا نَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُولُ ذَلِكَ. فَيُقَالُ لِلْأَرْضِ: الْتَئِمِي عَلَيْهِ. فَتَلْتَئِمُ عَلَيْهِ، فَتَخْتَلِفُ فِيهَا أَضْلَاعُهُ، فَلَا يَزَالُ فِيهَا مُعَذَّبًا، حَتَّى يَبْعَثَهُ اللَّهُ مِنْ مَضْجَعِهِ ذَلِكَ[1]» واتە: هەرکاتێ مردو یان یەکێکتان خرایە ناو گۆڕەوە و نێژرا دوو مەلائیکەی ڕەشی دەم و چاوشین دێنەلای یەکێکیان پێی دەگوترێ: مونکەر، ئەوی تریشیان پێی دەگوترێ: نەکیر، دەفەرمون: تۆ لە ژیانی دونیادا دەبارەی ئەو پیاوە-واتە پێغەمبەری الله (ﷺ)- چیت دەگوت؟ دەڵێ بەندە و پێغەمبەری اللهیە، (أشهد أن لا إله إلا الله، وأن محمدا عبده ورسوله). دەفەرمون: ئێمە زانیومانە کە تۆ ئەمە دەڵێی. لە پاشدا گۆڕەکەی حەفتا گەز بە حەفتا گەز بۆ فراوان دەکرێت، پاشان بۆی روناك دەکرێتەوە، لە پاشدا پێی دەگوترێ: بخەوە. دەڵێ: با بگەڕێمەوە هەواڵ بدەم

[1] حديث أبي هريرة حديث حسن غريب، حكم الحديث: حسن، سنن الترمذي (١٠٧١)، سنن النسائي (١٨٣٣)، سنن ابن ماجه (٤٢٦٢) (٤٢٦٨).

بە کەسوکارەکەم؟ دەفەرموون: بخەوە وەک خەوتنی ئەو زاوایەی کە لە پەردەدایە جگە لە خۆشەویسترین کەسی کەسێکی تر خەبەری ناکاتەوە. ئیتر بەردەوام لەسەر ئەو حاڵەتەیە هەتا الله تعالی لەو جێگایەدا کە تێیدا ڕاکشاوە زیندوی دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر دوڕو و مونافیق بوو دەڵێ: نازانم گوێم لێبوو خەڵک شتێکیان دەگوت منیش وەک ئەوەم دەگوت، دوو مەلائیکەکە دەفەرمون: ئێمە زانیومانە کە تۆ ئەمە دەڵێی، بە زەوی دەفەرمون: خۆتی لێ بهێنەوە یەک. زەوی خۆی لێ دەهێنێتەوە یەک، پەراسوەکانی بەناو یەکدا دێن، ئیتر بەردەوام لەسەر ئەو حاڵەتەیە هەتا پەروەردگار زیندوی دەکاتەوە لەو جێگایەدا.

لە فەرمودەکەی بەڕائیش سەبارەت بە کەسی بڕوادار فەرمویەتی: «فيَأتيهِ مَلَكانِ، فيُجْلِسانِه، فيَقولانِ له: مَن ربُّكَ؟ فيقولُ: رَبِّيَ اللهُ، فيَقولانِ له: ما دِينُكَ؟ فيَقولُ: دِينِيَ الإسلامُ، فيَقولانِ له: ما هذا الرجلُ الذي بُعِثَ فِيكُمْ؟ فيَقولُ: هو رسولُ اللهِ، فيَقولانِ له وما عِلْمُكَ؟ فيَقولُ: قَرأتُ كِتابَ اللهِ فآمَنتُ به وصَدَّقْتُ، وفي رواية: فيَنتهِرُه فيَقولُ: مَن ربُّكَ؟ ما دِينُكَ؟ مَن نَبيُّكَ؟ وهي آخِرُ فِتنةٍ تُعرَضُ على المؤمنِ، فذلك حين يقولُ اللهُ عزَّ وجلَّ: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدونيا وَفِي الْآخِرَةِ﴾ [إبراهيم: ٢٧] فيُنادي مُنادٍ في السماءِ: أن صَدَقَ عَبْدِي، فأَفْرِشُوهُ من الجنةِ، وأَلْبِسُوهُ من الجنةِ، وافْتَحُوا له بابًا إلى الجنةِ، قال: فيَأْتيهِ من رَوحِها وطِيبِها، ويُفْسَحُ له في قبرِه مَدَّ بَصَرِه، قال: ويَأْتِيهِ- وفي روايةٍ: يُمَثَّلُ له- رجلٌ حَسَنُ الوجهِ، حَسَنُ الثيابِ، طَيِّبُ الرِّيحِ، فيقولُ: أَبْشِرْ بالذي يَسُرُّكَ، أَبْشِر برِضْوانٍ من اللهِ، وجَنّاتٍ فيها نعيمٌ مُقيمٌ، هذا يومُكَ الذي كنتَ تُوعَدُ، فيقولُ له: وأنت فبَشَّرَكَ اللهُ بخيرٍ مَن أنت؟ فوَجْهُكَ الوجهُ يَجِيءُ بالخيرِ، فيَقولُ: أنا عملُكَ الصّالحُ، كنتَ واللهِ سَريعًا في طاعةِ اللهِ، بَطيئًا عن مَعصيةِ اللهِ، فجَزاكَ اللهُ خيرًا، ثُمَّ يُفتَحُ له بابٌ مِن الجنَّةِ، وبابٌ مِن النّارِ، فيُقالُ: هذا كان مَنزِلَكَ لو عَصَيتَ اللهَ، أبدَلَكَ اللهُ به هذا، فإذا رَأى ما في الجنَّةِ، قال: ربِّ، عَجِّلْ قيامَ السّاعةِ؛ كَيما أرجِعَ إلى أهلي ومالي، فيُقالُ له: اسكُنْ[1]» واتە: ئینجا دوو فریشتەی (توند ڕاچەڵکێنەر) دێن بۆ لای،

[1] حكم الحديث: إسناده صحيح رجاله رجال الصحيح، مسند أحمد (١٨٥٣٥) (١٨٥٣٦) (١٨٦١٤) (١٨٦٢٥)، سنن أبي داود (٣٢١٢) (٤٧٥٣)، سنن النسائي (٢٠٠١).

و ڕایده‌چه‌ڵکێنن و دایده‌نیشێنن، پاشان پێی ده‌ڵێن: کێ په‌روه‌ردگارته‌؟ ئه‌ویش ده‌ڵێت: په‌روه‌ردگارم اللهیه‌، پاشان پێی ده‌ڵێن: ئاینت چییه‌؟ ئه‌ویش ده‌ڵێت: ئیسلام ئاینمه‌، پاشان پێی ده‌ڵێن: ئه‌و پیاوه‌ کێیه‌ که‌ له‌ نێوتاندا نێردرابو؟ ئه‌ویش ده‌ڵێت: نێردراوی اللهیه‌، پاشان پێی ده‌ڵێن: چۆن زانیت؟ ئه‌ویش ده‌ڵێت: کتێبه‌که‌ی الله (قورئانم) خوێندەوه‌ و باوه‌ڕم پێهێنا و به‌ڕاستم زانی، ئه‌مه‌ش دواین تاقیکردنه‌وه‌یه‌ ڕوبه‌ڕوی باوه‌ڕدار ده‌کرێته‌وه‌، ئه‌وه‌یه‌ که‌ الله تعالى له‌ باره‌یه‌وه‌ ده‌فه‌رموێت: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدونيا وَفِي الْآخِرَةِ﴾ [إبراهيم: ٢٧] واته‌: ئه‌وانه‌ی که‌ بڕوایان هێناوه‌ الله دامه‌زراویان ده‌کات به‌هۆی ئه‌و وته‌ جێگیر و نه‌گۆڕاوه‌ (که‌ شایه‌تمانه‌) له‌ ژیانی دونیادا و له‌ڕۆژی دواییشدا وه‌ الله سته‌م کارانیش گومڕا ده‌کات وه‌ الله هه‌رچی بیه‌وێ ده‌یکات. پاشان بانگ کارێك بانگ ده‌کات له‌ ئاسمانه‌وه‌ به‌نده‌که‌م ڕاستی کـــرد، ڕایخـــه‌ن بۆی له‌ فه‌رشـــی به‌هه‌شـــت، بیپـــۆشن له‌ پۆشاکی به‌هه‌شت، ده‌رگایه‌کی بۆ بکـــه‌نه‌وه‌ به‌ره‌و به‌هه‌شت، له‌ خۆشی و بۆنی به‌هه‌شتی بۆ دێت، و گۆڕه‌که‌ی بۆ فراوان ده‌کرێته‌وه‌ تاوه‌کو چاو بڕبکات، پیاوێکی ڕومه‌ت جوانی، پۆشاك جوانی، بۆن خۆشی بۆ ده‌نوێنرێت و دێت بۆلای، و پێی ده‌ڵێت: مژده‌ت لێبێت به‌وه‌ی که‌ پێت خۆشه‌، مژده‌ت لێبێت به‌ ڕه‌زامه‌ندی الله و باخانێك له‌ به‌هه‌شتدا که‌ خۆشگوزرانی به‌رده‌وامی تێدایه‌، ئه‌مه‌ ئه‌و ڕۆژه‌یه‌ که‌ به‌ڵێنت پێی ده‌درا، ئه‌ویش پێی ده‌ڵێت: وه‌ تۆش الله موژده‌ی خێرت بداتێ، تۆ کێیت؟ ڕومه‌تت ڕومه‌تێکه‌ خێر و خۆشی دێنێت، ئه‌ویش ده‌ڵێت: من کرده‌وه‌ چاکه‌کانتم، سوێند به‌ الله به‌ تۆم نه‌زانیوه‌ ئیلا ئه‌وه‌ نه‌بێت که‌ په‌له‌ و ده‌ست پێشخه‌ریت کردوه‌ له‌ گوێڕایه‌ڵی اللهدا ، و له‌سه‌رخۆ و خاویش بویت له‌ سه‌رپێچی اللهدا، الله پاداشتی خێرت بداته‌وه‌، پاشان ده‌رگایه‌کی بۆ ده‌کرێته‌وه‌ له‌ به‌هه‌شته‌وه‌ و ده‌رگایه‌کیشی بۆ ده‌کرێته‌وه‌ له‌ دۆزه‌خه‌وه‌، و پێی ده‌گوترێت: ئه‌مه‌ جێگاکه‌ت بوو له‌ دۆزه‌خدا ئه‌گه‌ر سه‌رپێچی اللهت بکردایه‌، الله گۆڕیویه‌تیه‌وه‌ بۆت به‌م جێگایه‌ له‌ به‌هه‌شتدا، جا ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی بینی که‌ له‌ به‌هه‌شتدایه‌، ده‌ڵێت: په‌روه‌ردگارم هاتنی ڕۆژی قیامه‌ت پێش بخه‌، بۆ ئه‌وه‌ی بگه‌ڕێمه‌وه‌ بۆ لای ماڵ و که‌س و کارم، پێی ده‌گوترێت: ئارام بگره‌.

سەبارەت بە کەسی بێ بڕواش فەرمویەتی: «ويَأْتِيهِ مَلَكانِ شَدِيدا الانتهارِ، فَيَنْتَهِرانِهِ، ويُجْلِسانِهِ، فيَقُولانِ: مَن ربُّكَ؟ فيقولُ: هاه هاه لا أَدْرِي، فيقولانِ: مادِينُكَ؟ فيقولُ: ها هاه لا أَدْرِي، فيقولانِ: فما تَقُولُ في هذا الرجلِ الذي بُعِثَ فيكم؟ فلا يَهْتَدِي لاسْمِه، فيُقالُ: موحەممەد! فيقولُ: هاه هاه لا أَدْرِي سَمِعْتُ الناسَ يقولونَ ذاك! قال: فيُقالُ: لا دَرَيْتَ، ولا تَلَوْتَ، فيُنادِي مُنادٍ من السماءِ أن: كَذَبَ، فأَفْرِشُوا له من النارِ، وافْتَحُوا له بابًا إلى النارِ، فيَأْتِيهِ من حَرِّها وسَمُومِها، ويُضَيَّقُ عليه قَبْرُهُ حتى تَخْتَلِفَ فيه أضلاعُه، ويَأْتِيهِ وفي روايةٍ: ويُمَثَّلُ له رجلٌ قبيحُ الوجهِ، قبيحُ الثيابِ، مُنْتِنُ الرِّيحِ، فيقولُ: أَبْشِرْ بالذي يَسُوؤُكَ، هذا يومُكَ الذي كنتَ تُوعَدُ، فيقولُ: وأنت فَبَشَّرَكَ اللهُ بالشرِّ مَن أنت؟ فوجهُك الوجهُ يَجِيءُ بالشرِّ! فيقولُ: أنا عملُكَ الخبيثُ، فواللهِ ما عَلِمْتُ إلا كنتُ بطيئًا عن طاعةِ اللهِ، سريعًا إلى معصيةِ اللهِ، فجزاك اللهُ شرًّا، ثم يُقَيَّضُ له أَعْمى أَصَمُّ أَبْكَمُ في يَدِهِ مِرْزَبَّةٌ! لو ضُرِبَ بها جبلٌ كان ترابًا، فيَضْرِبُهُ ضَرْبَةً حتى يَصِيرَ بها ترابًا، ثم يُعِيدُهُ اللهُ كما كان، فيَضْرِبُهُ ضَرْبَةً أُخْرى، فيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُهُ كلُّ شيءٍ إلا الثَّقَلَيْنِ، ثم يُفْتَحُ له بابٌ من النارِ، ويُمَهَّدُ من فُرُشِ النارِ، فيقولُ: رَبِّ لا تُقِمِ الساعةَ[1]» واتە: ئینجا دوو فریشتەی (توند ڕاچەڵەکێنەر) دێن بۆ لای، و ڕایدەچەڵەکێنن، و دایدەنیشێنن، پێی دەڵێن: کێ پەروەردگارتە؟ ئەویش دەڵێت: چی چی نازانم، پێی دەڵێن: ئاینت چییە؟ ئەویش دەڵێت: چی چی نازانم، پێی دەڵێن: چی دەڵێیت سەبارەت بەو پیاوەی کە لە نێوانتاندا نێردرابو؟ ناوەکەی نادۆزێتەوە، پێی دەڵێن: مەبەستمان (موحەممەد)ە! ئەویش دەڵێت: چی چی نازانم، دەمبیست خەڵك دەیوت (موحەممەد) نێردراوی اللهیە. پێی دەگوترێت: ئایا نەتزانی و نەشتخوێندەوە؟ ئینجا بانگ کارێك بانگ دەکات لە ئاسمانەوە: درۆی کرد، ڕایخەن بۆی لە فەرشی ئاگر، بیپۆشن بە پۆشاکی ئاگر، دەرگایەکی بۆ بکەنەوە بەرەو ئاگری دۆزەخ، جا لە گەرمی و هەڵم و بۆقاوی ئاگری دۆزەخی بۆ دێت، وە گۆڕەکەی لـێ تەنگ دەکرێتەوە تاوەکو پەراسوەکانی دەچن بەیەکدا و تێکدەشکێن، لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموی: پیاوێکی ڕومەت

[1] حكم الحديث: إسناده صحيح رجاله رجال الصحيح، مسند أحمد (١٨٥٣٥) (١٨٥٣٦) (١٨٦١٤) (١٨٦٢٥)، سنن أبي داود (٣٢١٢) (٤٧٥٣)، سنن النسائي (٢٠٠١).

ناشیرین و پۆشاك ناشیرینی بۆن گەنیوی بۆ دەنێردرێت، و پێی دەڵێت: موژدەت لێبێت بەوەی کە پێت ناخۆشە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە بەڵێنت پێی دەدرا، ئەویش پێی دەڵێت: وە تۆش الله مژدەی خراپت بداتێ، تۆ کێیت؟ ڕومەتت ڕومەتێکە خراپە دێنێت، ئەویش دەڵێت: من کردەوە پیسەکانتم، سوێند بە الله بە تۆم نەزانیوە ئیلا ئەوە نەبێت کە خاو و سست بویتە و کەمتەرخەمیت کردوە لە گوێڕایەڵی اللەدا و پەلە و دەست پێشخەریشت کردوە لە سەرپێچی اللەدا، الله پاداشتی خراپت بداتەوە، پاشان فریشتەیەکی کوێر و کەڕ و لاڵی بۆ ڕادەسپێردرێت کە گورزێکی بە دەستەوەیە ئەگەر پێی بدرێت لە شاخێك دەیکات بە خۆڵ جا یەك گورزی لـێدەدات تاوەکو دەیکات بە خۆڵ پاشان الله تعالی دەیگێڕێتەوە بۆ دۆخەکەی جـارانی پاشان دوبارە گـورزێـکی تری لـێدەدات جا هاوارێـك دەکات هەموو شتێك دەیبیسێت تەنها مرۆڤـ و جنۆکە نەبێت، پاشان دەرگایەکی بۆ دەکرێتەوە لە دۆزەخەوە و بۆی ڕادەخرێت لە فەرشی ئاگر، جـا ئەگـەر ئەوەی بیـنی دەڵـێت: پەروەردگـارم با ڕۆژی قیامەت نەیەت.

ئامۆژگاریم بۆ ئەو برایانەی کە هاتوچۆی مزگەوت دەکەن و لەناو جەماوەردا دەژین، ئاگاتان لە خۆتان بێت! ئەو سێ خاڵە زۆر گرنگە مەڵێ من جوابی قەبرم پێ دەدرێتەوە ئەگەر ناوی الله تعالی ش بزانی دەبێت ناوی پێغەمبەریش (ﷺ) بزانیت و ئاینی ئیسلامیش شارەزابیت و ئیشیشی پێ بکەیت لەو شتانەی کە ئیشی پێ ناکرێت لەناو جەماوەردا کە خۆشی پێ موسڵمانە کەسەکە، دەبینی بۆی دەچیتە سوڵحێک کاتێک بە شەریعەتی ئیسلام دەردەکەوێ دەبێ ئەو تۆڵەی لێ بستێندرێتەوە یان پارە بژمێرێت ئەو کات بە شەریعەتی ئیسلام نایکات، ئەوە چ جۆرە موسڵمانیەتیەکە؟ ئەوکات وەڵامت پێ نادرێتەوە لەناو قەبر با بشڵێی من لەسەر ئیسلامم، ئەگەر تۆ شکێندرایشیتەوە حوکمی ئیسلام بوو پارەشت پێ ژمێردرا الله تعالی دەفەرموێ هەردەبێ پێی ڕازی بیت و لە دڵیشتدا پێت خۆشبێت ئەوە موسڵمانیەتیە[1]، یان

---

[1] ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ [النساء: ٦٥] واتە: نەخێر (وانیە کە خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن) سوێند بە

ئافرەتان و خوشکانمان کاتێک میرات دابەش دەکرێت لە بن گوێچکەیان دەخوێندرێ دەڵێن کاکە ئێمە بە شەرع چەندمان دەکەوێت؟ مامۆستا پێی دەڵێ نیو هێندەی برایەکەت دەبەی، دەڵێ ئەی بە قانون؟! دەڵێ بە قانونیش یەکسانیان کردوە، قانونە دەستکردەکان (کوفریەکان ئەوروپیەکان) ئەوان دەڵێن کچ و کوڕ ئەوەندەی یەک دەبەن، دەڵێ دەی من بە قانون ئیش دەکەم بەو شێوەیە باشترە بۆ من! بەو شێوەیەت زەرەرترە خوشکی خۆم لەبەر ئەوەی قسەکەت کوفرە و پێی لە ئیسلام دەردەچی، واتای ئەوەیە ئایەتی اللەت ڕەتکردەوە و بە ئایەتی الله ڕازی نەبوی بە حوکمی دەستکردی مرۆڤ ڕازی بویت، ئەوکات وەڵامی گۆڕت پێ نادرێتەوە و لەسەر ئیسلام نەڕۆیشتی و هەر دەبێ لەسەری خۆت بدەیت و بڵێی هاه هاه لا أدري.

## ئەوانەی پرسیاری ناو گۆڕیان لێ ناکرێت و عەزابی قەبر نابینن:

١.پێغەمبەران: إبن تيمية-رحمه الله- دەفەرموێ: زانایان ئیختلاف و جیاوازیان تێیدا هەیە ئایە پێغەمبەران پرسیاری ناو گۆڕیان لێدەکرێت یاخود نا، بەڵام ڕای دروست ئەوەیە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لەبەر ئەو دوو بەڵگە پرسیاری ناو گۆڕیان لێ ناکرێت و عەزابی قەبر نابینن:

- پێغەمبەران پلەدارترن لەوانەی دەکوژرێن لەپێناو الله و شەهید دەبن، جا بە بەڵگەی یەکلا کەرەوە و ڕاست و دروستیش پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی و یەکلای کردۆتەوە ئەوانەی دەکوژرێن و شەهید دەبن و الله بە شەهیدیان قبوڵ دەکات ئەوانە عەزابی قەبر نایانگرێتەوە و پرسیاری قەبریشیان لێ ناکرێت: «أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا بَالُ الْمُؤْمِنِينَ يُفْتَنُونَ فِي قُبُورِهِمْ إِلَّا الشَّهِيدَ؟ قَالَ: كَفَى بِبَارِقَةِ السُّيُوفِ عَلَى رَأْسِهِ فِتْنَةً[١]» واتە: پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ)، بۆچی بڕواداران تاقی دەکرێنەوە لە

پەروەردگارت بڕوادار نین تا تۆ نەکەنە دادوەر لەهەر ئاژاوە و دووبەرەکیەکی نێوانیاندا لەپاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بە هیچ بێزاریەک لەو بڕیارەی تۆ داوتە و مل کەچ نەکەن بە مل کەچیەکی تەواو.

[١] عبد الحق الإشبيلي،الأحكام الوسطى (٢/٣٥٥)، سكت عنه [وقد قال في المقدمة: وإن لم تكن فيه علة كان سكوتي عنه دليلا على صحته.

گۆڕەکانیان جگە لە شەهید نەبێت؟ فەرموی: تیشکی شمشێرەکان لەسەر سەریان بەسە بۆ تاقیکردنەوە.

- پێغەمبەران پرسیار دەربارەی خۆیان دەکرێت، لەوانە پێغەمبەری ئێمە (ﷺ) کە یەکێک لە پرسیارەکانی ناو گۆڕ ئەوەیە دەڵێت پێغەمبەرەکەت کێیە؟ زانایان دەفەرمون خۆ پێغەمبەران دەربارەی خۆیان پرسیاریان لێ ناکرێت.

٢.ڕاستگۆکان: وەکو ئەبو بەکری سدیق کە بەبێ دوو دڵی پێغەمبەری بە ڕاست زانیوە لە هەموو ئیش و هەواڵێک کە پێغەمبەر داییبێت، ئەوانەش پلەیان لە شەهیدەکان بەرزترە، هەندێکیش لە زانایان دەفەرمون ئەوانیش وەکو تێکڕای خەڵکی تر لەبەر بەڵگە گشتیەکان لەسەر ئەوەی پرسیار هەیە لەناو گۆڕدا پرسیاریان لێدەکرێت، بەڵام ئەو ڕایە پەسندترە کە لە سەردەمیەکان عوسەیمینیش بە دروستی دەزانێت کە پرسیار لەوانیش ناکرێت.

٣.ئەوانەی کە شەهید دەبن لەپێناو الله: زانایان ئیختیلافێکی وایان تێیدا نیە و دەفەرمون شەهیدەکان دەپارێزرێن لە عەزابی ناو گۆڕ و ئەگەری عەزابیان نابێت، چونکە: «أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا بَالُ الْمُؤْمِنِينَ يُفْتَنُونَ فِي قُبُورِهِمْ إِلَّا الشَّهِيدَ؟ قَالَ: كَفَى بِبَارِقَةِ السُّيُوفِ عَلَى رَأْسِهِ فِتْنَةً[1]» واتە: پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ)، بۆچی بڕواداران تاقی دەکرێنەوە لە گۆڕەکانیان جگە لە شەهید نەبێت؟ فەرموی: تیشکی شمشێرەکان لەسەر سەریان بەسە بۆ تاقیکردنەوە.

٤.سەنگەرنشینی لە مەیدانی جەنگ و جیهاد: ئەوانەن کە بەرگری دەکەن ڕۆح و گیانیان خستۆتە سەر دەستیان، لە ئەگەری ئەوەدا هەرکاتێک دوژمنان هێرش بکەن بۆ سەر خاکی موسڵمانان و بۆ سەر موسڵمانان ئەوان بەرپەچیان دەدەنەوە و لە ئامادە باشیدان، هەریەکێک لەوان وەفات بکات و بمرێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «رِباطُ يَومٍ ولَيْلَةٍ

[1] عبد الحق الإشبيلي، الأحكام الوسطى (٢/٣٥٥)، سكت عنه [وقد قال في المقدمة: وإن لم تكن فيه علة كان سكوتي عنه دليلا على صحته.

خَيْرٌ من صِيامِ شَهْرٍ وقِيامِهِ، وإنْ ماتَ جَرَى عليه عَمَلُهُ الذي كانَ يَعْمَلُهُ، وأُجْرِيَ عليه رِزْقُهُ، وأَمِنَ الفَتّانَ[1]» واتە: ئەگەر یەک شەو و ڕۆژ کەسێک سەنگەر نشین بێت خێری زیاترە لەوەی مانگێک ئەو کەسە شەوەکان زیندو بکاتەوە و شەو و نوێژی تێدا ئەنجام بدات بە ڕۆژیش تێیدا بە ڕۆژو بێت، ئەگەر مردیش و لەو سەنگەرنشینیەدا بوو ئەوە کردەوەکانی بۆی دەچێتە ناو گۆڕ بە تەواوی عەمەلەکانی بۆ دەنوسرێت و حیسابی ئەوەی بۆ ناکرێت مردوە و دابڕاوە لە عەمەل و کردەوەکان، وە ڕزق و ڕۆزیەکەیشی بۆی دەچێتە ناو گۆڕ و لە فیتنە و پرسیارەکانی ناو گۆڕ ئەمین دەبێت.

٥.منداڵ و شێتەکان: زانایان بون بە دوو بەش:

- بەشێکیان دەفەرمون بەڵێ شێت و منداڵیش پرسیاریان لێ دەکرێت لە ناو گۆڕدا، لەبەر ئەوەی بەڵگە و دەلیلەکان نەیگوتوە شێت یان منداڵ دەپارێزرێن و پرسیاری ناو گۆڕیان لێ ناکرێت ئەگەر بێو لە ژیاندا ئەوانە تەکلیف و ئەرکی شەرعیان لەسەر نەبوە یان هەڵگیراوە (شێتی تەواو لەگەڵ منداڵ)، بەڵام بۆ قیامەت و دوارۆژیان بۆچونی دروست ئەوەیە کە تاقی دەکرێنەوە لە مەیدانی حەشر و حیسابدا، ئەو کات لە دوای تاقیکردنەوەکە بڕیار دەدرێت لەسەریان ئایە بەهەشتین یان دۆزەخین یان تۆڵەیان لێ دەستێندرێتەوە، دەڵێن مادەم بەو شێوەیەیە کەواتە ئەوانەش پرسیاریان لێ دەکرێت لەناو گۆڕیش چونکە ناو گۆڕ یەکەم مەنزڵگایە لە مەنزڵگا و شوێن و ژیانی دوارۆژدا (پێشەوا أبي حكيم الهمداني، أبوو حسن بن عبد ليل، کۆمەڵێک لە موجتەهیدانی مەزهەبی ئیمامی شافیعی) ئەوە ڕاو بۆچونیانە، أبوو الحسن الأشعري ش ئەوەی ڕیوایەت کردوە و لەلای خۆشیەوە ئەو بۆچونەی پێ هەڵبژاردەیە و تەواوە، ئیمامی إبن تيميةش لە نەس و دەقەکانی بەو شێوەیە دەفەرموێ، ئیمامی أحمدیش ئەوە دەخوێندرێتەوە و جێگیرە لێی کە شێت و منداڵەکانیش پرسیاری ناو گۆڕیان لێ دەکرێت لە ڕۆژی دوایدا.

[1] صحيح مسلم (١٩١٣)، سنن الترمذي (١٦٦٥)، سنن النسائي (٣١٦٧) (٣١٦٨).

• بەشێکی تر لە زانایان بۆچونیان ئەوەیە دەڵێن نە منداڵ نە شێتی تەواو پرسیاری ناو گۆڕ نایانگرێتەوە و پرسیاریان لێ ناکرێت، چونکە لە دونیادا ئەوان ئەرکی شەرعیان لەسەر هەڵگیراوە، مادەم خاوەن ئەرکی شەرعی نەبون لە دونیادا لە نێو گۆڕیشدا لێپرسینەوە لەسەر کار و کردەوەکانیان نیە، لێپرسینەوە لە کەسێک دەکرێت کە ئەرکی شەرعی لەسەر بێت ئەوەش پێشەوایان (القاضي أبو يعلى، إبن عبديل، کۆمەڵێکی تر لە زانایان ئەوە بۆچونیانە).

٦.ئەو کەسانەن کە لە شەو و ڕۆژی هەینیدا وەفات دەکەن: بەڵام کەسەکە بەو مەرجەی موسڵمان بێت نەک کەسێکی بێدین یان جولەکە یان کافر یان مونافق و دەغەڵ و دوڕو، ئەگەر بڕوای بە ئیسلام نەبێ ئەو کەسە لە شەو و ڕۆژی هەینیدا بمرێ یان نەمرێ هیچ قیمەتی نیە و عەزابەکەی لەسەر لاناچێت، بەڵام کەسی موسڵمان ئەگەر هەندێک لە تاوانەکانیشی هەبێ مادەم لە شەو و ڕۆژی هەینیدا وەفات بکات ئەو کەسە لە پرسیار و عەزابی ناو گۆڕ پارێزراو دەبێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، أَوْ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ إِلَّا وَقَاهُ اللَّهُ فِتْنَةَ الْقَبْرِ[1]» واتە: هەر موسڵمانێک لە ڕۆژی جومعەدا یان لە شەوەکەیدا بمرێت الله تعالى لە تاقیکردنەوەی گۆڕ دەیپارێزێت[2].

٧.هەر موسڵمانێک بە نەخۆشی سک ئێشە وەفات بکات: «عَبْدَ اللَّهِ بْنَ يَسَارٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا وَسُلَيْمَانُ بْنُ صُرَدٍ وخَالِدُ بْنُ عُرْفُطَةَ، فَذَكَرُوا أَنَّ رَجُلًا تُوُفِّيَ مَاتَ بِبَطْنِهِ، فَإِذَا هُمَا يَشْتَهِيَانِ أَنْ يَكُونَا شُهَدَاءَ جَنَازَتِهِ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِلْآخَرِ: أَلَمْ يَقُلْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): مَنْ يَقْتُلْهُ بَطْنُهُ فَلَنْ يُعَذَّبَ فِي قَبْرِهِ؟ فَقَالَ الْآخَرُ: بَلَى[3]» واتە: عەبدوڵای کوڕی یەسار دەڵێ: من دانیشتبوم لەگەڵ

[1] هذا حديث غريب. وهذا حديث ليس إسناده بمتصل؛ ربيعة بن سيف إنما يروي عن أبي عبد الرحمن الحبلي، عن عبد الله بن عمرو، ولا نعرف لربيعة بن سيف سماعا من عبد الله بن عمرو. حكم الحديث: حسن، سنن الترمذي (١٠٧٤)، مسند أحمد (٦٥٨٢) (٦٦٤٦) (٧٠٥٠).

[2] تاریخی هیجری کە موسڵمان ئیش بەوە دەکات کە بانگی مەغریب بانگیدا ڕۆژێکی نوێ دەست پێ دەکات، واتە شەوەکە سەرەتا دەست پێ دەکات.

[3] حكم الحديث: صحيح، سنن النسائي (٢٠٥٢)، سنن الترمذي (١٠٦٤)، مسند أحمد (١٨٣١٠) (١٨٣١١) (١٨٣١٢) (٢٢٥٠٠).

سولەیمانی کوڕی سوڕەد و خالیدی کوڕی عورتوفە، باسی پیاوێکیان کرد بەهۆی سک ئێشەوە مرد، حەزیان دەکرد ئامادەی جەنازەکەی ببن، یەکێکیان بەوی تری وت: ئایە پێغەمبەری الله (ﷺ) نەیفەرموو: هەرکەس بەهۆی سک ئێشەوە بمرێ هەرگیز لە گۆڕەکەیدا سزا نادرێ؟ ئەوی تریان گوتی: بەڵێ وایە.

زانایان دەفەرمون سک ئێشە نەخۆشی و ناخۆشیەکی یەکجار زۆرە تەحەمولی دەوێت لەبەر ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ بڕوادار بەو شێوەیەی فەرموە کە ئەگەر بە سک ئێشە وەفات بکات لە عەزابی قەبر پارێزراو دەبێت.

**پرسێك:** ئایە کافر و بێ بڕوایان و ئومەتانی پێشتریش لێپرسینەوەیان هەیە لەناو قەبردا؟

**وەڵام:** زانایان بونە بە دوو کۆمەڵ لەو مەسەلەیەشدا:

- هەندێکیان دەفەرمون پرسیار لە خەڵکانی پێشتر و ئومەتەکانی پێشتر لە کافر و بێ بڕوایان ناکرێت، لەوانە: (پێشەوا الحكيم الترمذي، ابن عبد البر، جلال الدين السيوطي).
- بەڵام بۆچونی زۆرینەی زانایان لەوانە: (عبد الحق الإشبيلي، ابن قيم الجوزية، ئیمامی القرطبي، السفاريني، لەسەردەمیەکانیش کە زۆر پێی لەسەر دادەگرێت (محمد بن صالح العثيمين-رحمهم الله-) دەفەرمون بەڵکو ئومەتەکانی پێشتریش پرسیاریان لێ دەکرێت، ئەوەش بۆچونی دروستی زانایانە.

## جێگیربونی خۆشی و ناخۆشی و عەزابی قەبر:

فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بە موتەواتیرەوە هاتوە کە لەناو گۆڕدا مرۆڤ لە دوای مردنی ژیانی ناو گۆڕی یان عەزاب دەدرێت و ناخۆشی دەبینێت یان ناز و نیعمەتی لەگەڵ دەکرێت و لەسەری فراوان دەبێت و دەکەوێتە خۆشی[1].

---

[1] فەرمودەی موتەواتیر: هەر کۆمەڵێک لەسەردەمی سەحابە و تابعی و تابعی تابعی هەتا دەگاتە سەر ئیمامە بەڕێزەکان و فەرمودە ناسەکانی وەکو ئیمامی بوخاری و ئیمامی موسلیم و ئیمامی ترمزی و ئەوانە (کە فەرمودەیان جێگیر کردوە و و نوسیویانەتەوە و بڵاندویانەتەوە) لە هەر چینێک کۆمەڵێک لەوانە حەدیسەکەیان گێڕابێتەوە بەوانە دەڵێن موتەواتیر.

ئیمامی تەحاوی لە مەتنی عەقیدەی تەحاوی کە باسی عەزاب و نیعمەت و خۆشیەکانی ناو گۆڕ دەکات، ئەو پیاوە دەفەرمویٚ[1]: (قَد تَواتَرَتِ الأخبارُ عَن رَسولِ اللَّهِ (ﷺ) في ثُبوتِ عَذابِ القَبرِ ونَعيمِه لِمَن كانَ لِذلك أهلًا) واتە: بە موتەواتیری هەواڵ و خەبەر و فەرمودەکان هاتوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆ جێگیربونی عەزاب و ناخۆشیەکان و خۆشی و نیعمەتەکانی

---

دوو جۆرە موتەواتیرمان هەیە:

١. لەفزی: لە چینی سەحابیەکان و تابعیەکان و تابعی تابعی لە هەر چینێک لەو چینانە کۆمەڵێکی زۆر لە ڕاوی هەبن (واتە ئەو کەسانەی حەدیسەکەیان گێڕاوەتەوە و ڕیوایەتیان کردوە) و ئەو خەڵکانە مەرجەکانیان لێ بێتەجێ کە ڕاستگۆبن، هەرگیزاو هەرگیز عەقڵ قبوڵی ئەوە نەکات ئەو کۆمەڵە کەسە بە یەک دەنگیەوە کۆببنەوە لەسەر درۆیەک، هەندێک لە زانایان دەفەرمون دەبێت ژمارەیان حەوت بێت، هەندێک دەڵێن ژمارەیان دەبێت، هەندێک دەڵێن زیاتر، هەندێکیش دەڵێن ژمارە مەرج نیە گرنگ ئەوەیە ژمارەیەک بێت لە سێ زیاتربن و جێگای متمانە بن و عەقڵ بڵێ ئەو کەسانە کۆنابنەوە لەسەر درۆ، ئەگەر لە لەفز و وشەکاندا لەگەڵ مانادا دەقاودەق کت و مت فەرمودەکان وەکو یەک بون ئەوە ئەوکات پێیدەگوترێت موتەواتیری لەفزی.

٢. مەعنەوی: ئەگەر لە هەموو ڕێگاکان حەدیسەکە لە مانادا تێک بکەنەوە تەنها لەفز و وشەکانیان لێک جیاواز بێت (زمانی عەرەبی فراوانە) و بەخۆیەوە هەڵبگرێت ئەوە پێی دەڵێن موتەواتیری مەعنەوی.

موتەواتیر چ لەفزی بێت چ مەعنەوی زانایانی فەرمودەناس یەک دەنگن لەسەر ئەوەی دەبێت وەربگیرێت، سەحیحی و زەعیفی و مەوزوعی ئەو ناگرێتەوە، بەڵکو ئەو لەو حەدیسانەیە دەبێت سەتا سەت جێگیری بکەیت و (قطعي الثبوت)ن و دەبێت بڕوات پێی هەبێت، ئەوەی بڕوای بە حەدیسە موتەواتیرەکان نەبێت لە ئیسلام دەردەچێ.

[1] ئیمامی تەحاوی ئەو پیاوە بەڕێزەی کە لە سەرەتادا لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی بوە و لە تەمەنی نۆزدەساڵیدا چوەتە سەر مەزهەبی ئەبو حەنیفە کە خوارزای ئیمامی موزەنیە، ئیمامی موزەنی گەورە قوتابی ئیمامی شافیعی بوە، و دایکی ئیمامی تەحاویش لە خزمەت ئیمامی شافیعی لەگەڵ برایەکەی ئیمامی موزەنی دەرس و وانەی خوێندوە، ئیمامێکی بەڕێز و سەنگین و جێگای متمانەیە.

کیتابەکەشی کە دەربارەی عەقیدە نوسیویەتی بە یەکدەنگی زانایان بە پەرتوکێکی ڕاست و دروستی عەقیدە دانراوە، لە کۆنەوە تا بە ئێستا گەشتوە هەر مەنهەج بوە لەلای زانایان و وانەی لەسەر خوێندراوە و بە دەیەها شەرح و ڕاڤەش کراوە، باشترین شەرحیش شەرحی (إبن أبي العز الحنفي)ە ، کە شەرحێکی زۆر جوان و کورت و پوختی کردوە، (إبن أبي العز الحنفي) قوتابی إبن تيمية بوە و لە سەردەمی ابن الجوزي ژیاوە لەسەر ئیسلام و عەقیدە و بیروبڕوا و حەقبێژی چەندین جار لەسەر مینبەر لە وانەکان دورخراوەتەوە، و چەندین جاریش زیندانی کراوە و گیراوە، بەڵام باکی پێی نەبوە، هەر پێی لەسەر حەقیقەت و ڕاستیەکان داگرتوە.

ناو گۆڕ بۆ ئەو مردوانەی کە ئەهلبن ئەوەی ئەهلی عەزاب بێت عەزاب دەدرێت ئەوەی ئەهل بێت بۆ خۆشی خۆشی دەدرێتێ.

(وسُؤالُ المَلَكينَ) واتە: وە پرسیارەکانی هەردو فریشتەکانیش (بە حەدیسی موتەواتیر جێگیرە).

(فيَجِبُ اعتِقادُ ثُبوتِ ذلك والإيمانُ به) واتە: پێویستە ئێمە بیروبڕوامان وابێت (ئەوە جێگیر بکەین و ئیمان و بیروبڕوایش بەوە بێنین) کە پرسیاری ناو گۆڕ هەیە وە عەزاب و ناز و نیعمەتیش لەناو گۆڕدا هەیە.

(ولا نَتَكَلَّمُ في كَيفيَّتِه) واتە: وە قسەیش ناکەین لە چۆنیەتیەکەی چونکە غەیبە و نادیارە.

**ڕونکردنەوە:** نابێ لەخۆمانەوە بڵێین عەزابەکەی ناو قەبر بەو شێوەیە یان خەیاڵ بکەین بڵێین باشە ئەوە گۆڕستانێک لە فڵانە شوێنە بۆچی لە ئێمە هیچ دیار نیە ئەگەر قەبرەکە لەسەری ئەوەندە فراوان بوە ئەو زەویە چۆن بەشی کردوە بۆ کەسە بڕوادارەکە یان ئەگەر لەو ژیانە خۆشە و ناز و نیعمەتەکانیدایە ئێمە بۆچی هەستی پێ ناکەین و نایبینین ئەوانە نابێت بڵێین هی عەزابەکەش بە هەمان شێوە ئیلا مەگەر الله تعالى یان پێغەمبەر (ﷺ) چۆنیەتیەکیان بۆ ئێمە دیاری کردبێ.

(إذ لَيسَ لِلعَقلِ وُقُوفٌ على كَيفيَّتِه لِكَونه لا عَهدَ لَه به في هَذِه الدَّارِ) واتە: عەقڵ ناتوانێت بیخوێنێتەوە و چۆنیەتیەکەی بزانێت چونکە شتە غەیبیەکانی ژیانی ناو گۆڕ ئەو نازانێ و شارەزای نیە و نەیبینیوە و غەیبە نابێ بە عەقڵ قسەی تێدا بکات.

**ڕونکردنەوە:** بۆ نمونە ئەگەر شتێکی سەر ڕوی زەوی تۆ نەت بینیبێت یان هاو وێنەی ئەوت نەبینیبێت بۆ ئەوەی بیسەلمێنین کە عەقڵ ئەگەر شتێکی نەبینیبێت تەسویر کردنی شتەکەی لەسەر زەحمەت دەبێت یان هاو نمونەی ئەوەی نەبینیبێت بەهەڵەدا دەچێت لەبەر ئەوەیە زانایان دەفەرمون نابێت عەقڵ قسە بکات لە شتە غەیبیەکان مادەم شەرع قسەی

لێکردوە دەبێت تەسلیمی بێت عەقڵ و بڕوای پێ بێنێت، مادەم هەواڵەکە ڕاست بێت و لە اللەوە بێت یان لە حەدیسی سەحیحی پێغەمبەر بێت (ﷺ).

کاتی خۆی دەگێڕنەوە یەکێ لە باوکی ئەو کەسانەی کە شوعی بوە (هەر لە کوردستانی خۆمان ئەو کاتەی کە شوعیەت تازە هاتبوە کوردستان) دەچێتە ئیتیحادی سۆفیەتی لەوێ کۆمپیوتەر دەبینێت، کە دێتەوە باوکی دەڵێت کوڕم چویت ئەو سەفەرەت کردوە (باوکەکەش بەستە زمان بوە سادە بوە نەیزانیوە کوڕەکەی کافر بوە و بەدوای فکر و بۆچونێک کەوتوە کە شوعیەتە و کوفرە و بڕوا نەبونە بە الله تعالی، چونکە کاتی خۆی شوعیەکان فێڵیان لە خەڵک دەکرد دەیانگوت شوعیبە و نوێژیش بکە کێشەی چیە شوعیایەتی هیچ کاتێک ڕێ لە نوێژ ناگرێت، بەس بۆ ئەوەیان بوو بە درۆ هەتا لە ڕێت لابدەن و بتکەنە شوعی و جەماوەریان زیاد بکەن، پاشان هێواش هێواش فێری ئەوەت بکەن کە بڕوات نەمێنێت بە الله تعالی و شتە پەنهانەکان) ئەو کوڕە شوعیە دێتەوە و باوکی لێی دەپرسێت کوڕم چیت بینی؟ تۆ چویە ئەو وەڵاتە و سەفەرت کرد بەخێر بێیتەوە، بەخێرهاتنەوەی لێ دەکات، ئەویش دەڵێت باوکە وەڵا شتێکی سەیر و سەمەرەم بینی، کۆمپیوتەرم بینی، کۆمپیوتەر تۆ پارەت هەیە دەوڵەمەندی و ساڵانە دەغڵ و دانی باشت هەیە و حەیوان و ئاژەڵیشت هەیە، خۆزگە کۆمیوتەرێکت بۆ من کڕیبایە و لەو وڵاتە بۆم بهاتبایەوە زۆر سود و قازانجم لێی دەبینی، ئەویش دەڵێ کوڕم کۆمپیوتەر چیە؟! ئەویش نازانێت چۆن بۆی وەسف بکات، هەرشتێک نەبینراوبێت وەسفی ئاسان نیە و عەقڵ ئاسان قبوڵی ناکات و وێنای ناکات، ئەویش دەڵێت باوکە چیت پێ بڵێم، کتێبخانەی مامۆستات بینیوە لە حوجرە؟ ئەویش دەڵێ بەڵێ، چەند کیتابی تێدایە؟ ئەویش دەڵێ وەڵا چەند سەت کتابێکی ڕەنگە تێدابێت، ئەی کتێبخانەی ناو مزگەوتت بینیوە؟ بەڵێ، هی فەقیەکانت بینیوە؟ بەڵێ، ئەی هی دە گوندی تر بێنیتە لای یەک هەر هەموی کۆ بکەیتەوە هی دە مەلای تر و دە حوجرەی تر دە فەقێی تر ئەو کتێبخانانە هەموی کۆ بکەیتەوە هەموی تیایە کۆمپیوتەر، باوکەکەیش هاواری لێ هەڵدەستێ و شەقێک لە ڕانی خۆی دەدات، دەڵێ کوڕم ئەو قسەیەی تۆ دەیکەیت کۆمپیوتەر بە عەمەل

نایەت، واتای وایە دەبێت ئێمە شوێنێ خەوتنیشی بۆ چۆڵ بکەین و جێیەکی بۆ بگرین و حەرەسی بۆ بگرین، جێیەکی زۆرمان لێ دەگرێت چونکە بە تەسەوری ئەو باوکە بەستە زمانە عەقڵ نایخوێنێتەوە و شتەکەی نەبینیوە و نمونەی ئەوەشی لەبەرچاو نیە، هەر شتەکە غەیبە لەو، یەکسەر دێتە ناو عەقڵ و مێشکی ئەو وادەزانێت دە مەکتەبەی وەکو هی مامۆستا و حوجرە و ئەوانە لەدوای یەک ڕیز بکەیت لێرەوە تا ئەوسەری کۆڵانی مزگەوت دەگرێتەوە، ئەی دەبێ بە چەند وڵاخ و ئەسپیش ڕای بکێشین هەتاوەکو دەیهێنینە ئێرە؟ ئەی چۆن دەڕوات لەسەر عەرز؟ لە پاشان ئەویش گوتی باوکە ئەوەندە گەورە نیە هەر لە ژورەکەی خۆم جێی دەبێتەوە، کۆمپیوتەری ئەوکات هی ساڵی پەنجا و شەستەکان مەترێک بە مەترێک یان شاشەکەی تۆزێک بچوکتر بوە، گوتی هەر ئەوەنەیە باوکەی گیان ئەوەندە دور و درێژی مەکەوە، ئەوە باوکەکە نەیزانی.

کەواتە زانایان دەڵێن و ئێمەش دەڵێین هەرکەسێک عەقڵ بەکار بێنێت لە شتە غەیبی و نادیارەکان چونکە نەیبینیوە مادەم شتەکە شەرعی بێت بەو شێوەیە بە هیلاک دەچێت وەکو باوکی ئەو شوعیە کە باوکی خۆی بەهەڵەدا برد چونکە عەزابی قەبریش غەیبن ئەوەی الله بۆ ئێمەی باس کردبێت یان پێغەمبەر (ﷺ) باسی کردبێت لە حەدیسی سەحیح ئێمە بۆمان هەیە باسی بکەین و چۆنیەتیەکەی دەربڕین، ئەگەرنا نابێت عەقڵی تێدا بەکار بێنین، زانایان دەفەرمون عەقڵی سەلیم ئەوەیە خۆی نەدا لە شتە غەیبیەکان، ئەگەرنا توشی بێعەقڵایەتی دەبێت و کەم و کورتی توش دەبێت، ئەو کات قسە و هەڵوێستێک دەڵێت و دەکات کە الله و پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕازی نین.

(والشَّرعُ لا يأتي بما تُحيلُه العُقولُ) واتە: وە شەرعیش شتێک ناڵێ و ناهێنێ کە عەقڵ قبوڵی نەبێ.

(ولَكنَّه قَد يأتي بما تَحارُ فيه العُقولُ، فإنَّ عَودةَ الرُّوحِ إلَى الجَسَدِ لَيسَ على الوَجهِ المَعهودِ في الدونيا) واتە: گەڕانەوەی گیان بۆ لاشە و جەستەی مردو بۆ ناو گۆڕەکەی وەکو ئەوە نیە

کەسەکە خەوتوە گیانی لێی جیابۆتەوە و دەچێ خەون دەبینێ و دوایی دەگەڕێتەوە وەکو ژیانی دونیا نیە و تایبەتی ترە.

(بَل تُعادُ الرُّوحُ إلَيه إعادةً غَيرَ الإعادةِ المألوفةِ في الدونيا[1]) واتە: بەڵکو گیانەکە دەگەڕێتەوە بۆبەر لاشەکەی بە گەڕانەوەیەکی جگە لە گێڕانەوەی ژیانی دونیا کە بۆی دەگەڕێتەوە.

**ڕونکردنەوە:** ئەو ژیانێکی ترە و پەیوەندی نیە بە ژیانی دونیاوە و قۆناغێکی ترە وەکو إبن القیم فەرموی چۆن کاتێک لە دونیادا دەژیت ئەگەر بیربکەیتەوە تۆ کاتێک هەبوە لەناو سکی دایکتدا ژیاوی چەند تەنگە لە چاو دونیا؟ دونیا چەند فراوانترە لە چاو سکی دایکت؟ ژیانی دوای مردنیش بەو شێوەیە، ژیانی دونیات دەهێنێتە پێش چاو بە قەدەر ڕەحمی دایکت پێت تەنگ دەبێت کاتێک دەچیتە ژیانی دوای مردن (بەرزەخ) بەو شێوەیە فراوانترە لەچاو ژیانی دونیادا.

هەر لە شەرحی عەقیدەی تەحاوی لە شوێنێکی تردا فەرمویەتی: (واعلَمْ أنَّ عَذابَ القَبرِ هو عَذابُ البَرزَخِ حق، فكُلُّ من مات وهو مُستَحِقٌ لِلعَذابِ نالَه نَصيبُه مِنه، قُبِرَ أو لَم يُقْبَرْ، أكَلَتْه السِّباعُ أوِ احتَرَقَ حَتَّى صارَ رَمادًا ونُسِفَ في الهَواءِ، أو صُلِبَ أو غَرِقَ في البَحرِ؛ وصَلَ إلَى رُوحِه وبَدَنِه مِنَ العَذابِ ما يَصِلُ إلَى المَقبورِ.

وما ورَدَ من إجلاسِه واختِلافِ أضلاعِه ونَحوِ ذلك فيَجِبُ أن يُفهَمَ عَنِ الرَّسولِ (ﷺ) مُرادُه من غَيرِ غُلُوٍّ ولا تَقصيرٍ[2]) واتە: بزانی ئەی کەسی بڕوادار عەزابی قەبر و ژیانی دوای مردن شتێکی ڕەوایە و جێگیرە، هەرکەسێک بمرێت و موستەحەق بێت بۆ عەزابدان ئەو بەشە عەزابەی دەگاتێ، ئەو کەسە گۆڕ و قەبری دیاربێت یان دیار نەبێت هەر عەزابەکەی پێ دەگات، ئەگەر بێتو دڕندەش خواردبێتی شی بوبێتەوە و لەناو لاشە و جسمی دڕندەش یان سوتێندرابێت هەتا بوبێتەوە خۆڵەمێش بە هەوادا ڕۆشتبێت پاشماوەی جەستەکەشی، یان لە

[1] یُنظر: شرح الطحاوية (ص: ٣٨٩).
[2] یُنظر: شرح الطحاوية (ص: ٣٩٠).

خاچ درابێت یان لەناو بەحریشدا خنکابێت و بوبێتە خۆراکی ماسیەکان؛ چۆن عەزاب و خۆشیەکان دەگاتە یەکێک شاردرابێتەوە ژێر خاک کرابێت و لەناو گۆڕدا دانرابێت ئەو کەسانەی باسیشمان کرد هەر حاڵێک لەو حاڵانەی بەسەر هاتبێت ئەویش بەو شێوەیە عەزاب و خۆشیەکانی پێ دەگات وەک ئەو کەسانە.

وە ئەو بەڵگە و نمونانەش کە هاتنەوە لە فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە مردو دادەنرێت لەناو گۆڕەکەی پرسیاری لێدەکرێت یان پەراسوەکانی لەسەر یەک دەڕوا ئەو کەسەش دەگرێتەوە ئەگەر جەستەکەشی نەمابێت غەرقیش بوبێت لە ئاودا یان پارچە پارچەش بوبێت یان سوتابێت و بوبێتە خۆڵەمێش و نمونەی ئەوانە ئێمە دەبێ تێبگەین لە فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەبێ ئەوەی زێدەڕۆیی لەسەر بکەین یان کورت هەڵبێنین تێیدا.

## تاقم و کۆمەڵەکان لە بڕوابون بە عەزابی ناو گۆڕ:

١. ئەهلی سوننە و جەماعە: یەکدەنگن لەسەر ئەوەی عەزاب و ناخۆشیەکانی ناو گۆڕ بونی هەیە.

٢. مولحید و بێ بڕواکان: هەندێک لە ئەهلی فەلسەفەش ئەوانەی فەلسەفەی یۆنان و بێ بڕوایانیان گرتبوە بەر لە موسڵمانان لەسەر ڕێبازی ئەوانن، و بڕوایان وایە عەزابی ناو گۆڕ بونی نیە، و ژیانی دوای مردن هیچ بونی نیە لە خۆشی و ناخۆشیەکان، جا ئەوانەش بە حیسابی خۆیان ئەوە بە بەڵگە دەهێننەوە دەڵێن بڕۆ هەر گۆڕێک هەڵبدەیتەوە هیچت بەرچاو ناکەوێت و هیچت لێ دیار نابێت، بێ ئاگان لەوەی ژیانی دوای مردن جیاوازە لەگەڵ ژیانی ئێستا، شتێکی غەیبە و الله تعالی هەموو جارێک پێمان نیشان نادات بەڵام جار و بارێک هەبوە پێی نیشان داوین و ڕوش دەدات، ئەوەش لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە مانیع نیە خەڵک لەسەر ڕوی زەوی هەندێک لە عەزاب و ناخۆشی و دیمەنەکانی ناو گۆڕ ببینن.

٣. خەواریجەکان و هەندێک لە موعتەزیلەکان لەوانەش (ضرار بن عمرو، بشر المريسي): ئەوانە ڕایان وایە کە عەزابی قەبر نیە، دەڵێن چونکە پێمان وایە بەڵگە و دەلیلەکان عەزابی قەبر جێگیر نیە، بەڵام زۆربەی موعتەزیلەکان وەک ئەهلی سونە و جەماعە بڕوایان وایە عەزابی قەبر هەیە و مردو گەر مرد و شایەنی عەزاب بوو عەزاب دەدرێت.

## ئەو ئایەتانەی قورئان کە ئاماژە دەکەن بە عەزابی قەبر:

١. الله تعالى فەرمویەتی: ﴿وَلَو تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي غَمَرَٰتِ ٱلمَوتِ وَٱلمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيدِيهِم أَخرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُ ٱليَومَ تُجزَونَ عَذَابَ ٱلهُونِ﴾ [الأنعام: ٩٣] واتە: ئەگەر لەوکاتەدا کە ستەمکاران لە نارەحەتی و پەلەقاژەی مەرگدان ببینی چۆن گرفتاربون فریشتەی گیانکێشانیش دەستیان لێدەکەنەوە (درێژ دەکەن) و لێیان دەدەن پێیان دەڵێن دەگیانی خۆتان لەجەستەتان دەربهێنن و بینێرنە لای قار و تورەیی الله تعالى پێشیان دەڵێن: وا ئەمڕۆش بەئەوپەڕی سەرشۆڕیی و ریسواییەوە جەزرەبە و تۆڵە دەدرێن.

ئەم ئایەتە زانایان دەفەرمون بەڵگەیە لەسەر ئەوەی الله تعالى لە سەرەمەرگدا عەزاب و ناخۆشی و ئازارەکانی گیان کێشان تام دەکات بەوانەی کە بێ بڕوان یان زاڵم و ستەم کارن یان تاوان کارن.

٢. الله تعالى فەرمویەتی: ﴿سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَينِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ﴾ [التوبة: ١٠١] واتە: دوجار سزایان دەدەین دواتریش دەگەڕێنرێنەوە بۆ ناو سزایەکی گەورە واتە دۆزەخ.

ئەم ئایەتەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی الله فەرمویەتی ئێمە بێ بڕوایان سزا دەدەین دوجار پاشان دەیانگەڕێنینەوە بۆ عەزابێکی مەزن و گەورە، ئیمامی بوخاری لە سەحیحەکەی خۆیدا تۆماری کردوە کە زانایان وایان لێکداوەتەوە:

- عەزابی یەکەمجار: مەبەست پێی کافر و دوڕوەکانە لە دونیادا ئەویش بە دەستی موسڵمانان کە هەندێک جار دەگیرێن ئاشکرا دەبن لێیان دەدرێت دەکوژرێن و ماڵیان بە غەنیمەت دەگیرێ.

• عەزابەکەی دوەمیش: عەزابی ناو گۆڕە، ئەو زانایانەی بەو شێوەیان فەرموە لەوانە (حەسەنی بەصری-رحمه الله-) کە دەفەرموێ: ﴿سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيۡنِ﴾ واتە: (عذاب في الدونيا، وعذاب في القبر[1]).

ئیمانی طەبەریش دەفەرموێ: (والأغلب أن إحدى المرتين عذاب القبر، والأخرى تحتمل أحد ما تقدم ذكرهم من الجوع أو السبي أو القتل أو الإذلال أو غير ذلك[2]) واتە: عەزابێکیان گرنگ ئەوەیە مەبەست پێی عەزابی قەبرە لە دوو عەزابەکە، عەزابەکەی تریشیان ڕەنگە ئەوەبێت کە لە دونیادا الله تعالی هەندێکجار برسیان دەکات یان دەبنە تاڵانی و دەگیرێن بە دەست موسڵمانان یان دەکوژرێن یان زەلیل دەکرێن یان جگە لەو عەزاب و ناخۆشیانەش.

٣. الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ * ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ﴾ [غافر: ٤٥-٤٦] واتە: وە سزای سەخت هات و دار و دەستەی فیرعەونی گرتەوە * بەیانیان و ئێواران دەبرێنە دیاری ئاگری دۆزەخ ڕۆژێکیش قیامەت هەڵدەستێت (فەرمان دەدرێ) دار و دەستەی فیرعەون بخەنە سەخترین سزاوە.

زانایان دەفەرمون ئەوە مەبەست لێی ناو گۆڕە واتە دار و دەستەی فیرعەون بەیانیان و ئێواران شوێنی خۆیان دەبینن دەبرژێنرێن.

ئیمامی قورتوبی لە تەفسیری ئەو ئایەتە: (وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ) دەفەرموێ: (وَالْجُمْهُورُ عَلَى أن هذا العرض في البرزخ. احتج بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ فِي تَثْبِيتِ عَذَابِ الْقَبْرِ) واتە: جمهوری زانایان لەسەر ئەوەن ئەو نمایش کردنە لە بەرزەخ و ژیانی دوای مردنە. ئەوەش بەڵگەیە بۆ جێگیر کردنی عەزابی قەبر.

[1] تفسير إبن كثير في هذه الأيه ﴿سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيۡنِ﴾.
[2] تفسير الطبري في هذه الأية (سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيۡنِ).

٤. ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْآخِرَةِ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ﴾ [إبراهيم: ٢٧] واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە الله دامەزراویان دەکات بە وتەی بەڕێ و جێ (کە شایەتمانە) لە ژیانی دونیادا و لەڕۆژی دوایشدا وە الله ستەم کارانیش گومڕا دەکات وە الله هەرچی بیەوێ دەیکات.

## ئەو فەرمودانەی کە ئاماژە دەکەن بە عەزابی قەبر:

١. «إذا أُقْعِدَ المُؤْمِنُ في قَبْرِهِ أُتِيَ، ثُمَّ شَهِدَ أنْ لا إلَهَ إلّا اللَّهُ وأنَّ محمدا رَسولُ اللَّهِ، فَذلكَ قَوْلُهُ: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بالقَوْلِ الثّابِتِ﴾ [إبراهيم: ٢٧]. حَدَّثَنا موحەممەد بنُ بَشّارٍ، حَدَّثَنا غُنْدَرٌ، حَدَّثَنا شُعْبَةُ بهذا- وزادَ- ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ [إبراهيم: ٢٧] نَزَلَتْ في عَذابِ القَبْرِ[١]» واتە: کاتێک ئیماندار دادەنیشێنرێت لە گۆڕدا پاشان شایەتومان دێنێت و دەڵێ هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق جگە لە الله موحەممەدیش پێغەمبەری اللەیە (ﷺ) ئەوە دەقی ئەو فارمایشتەی الله تعالى یە کە دەفەرموێ: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ﴾ [إبراهيم: ٢٧] واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە الله دامەزراویان دەکات بە وتەی بەڕێ و جێ. لە ڕیوایەتێکی تر ئەو زیادەیە هاتوە: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ﴾ [إبراهيم: ٢٧] لەسەر عەزابی قەبر دابەزیوە.

٢. «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ يَهُودِيَّةً دَخَلَتْ عَلَيْهَا، فَذَكَرَتْ عَذَابَ القَبْرِ، فَقالَتْ لَهَا: أعَاذَكِ اللَّهُ مِن عَذَابِ القَبْرِ، فَسَأَلَتْ عَائِشَةُ رَسولَ اللَّهِ (ﷺ) عن عَذَابِ القَبْرِ، فَقالَ: نَعَمْ، عَذَابُ القَبْرِ قالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: فَما رَأَيْتُ رَسولَ اللَّهِ (ﷺ) بَعْدُ صَلَّى صَلَاةً إلَّا تَعَوَّذَ مِن عَذَابِ القَبْرِ[٢]» واتە: جارێ ژنێکی جولەکە هات بۆلام، باسی عەزابی قەبری کرد، پێی گوتم: الله پەنات بدات لە عەزابی قەبر، پرسیارم لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد لەسەر عەزابی قەبر، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: بەڵێ عەزابی قەبر هەیە، لەدوای ئەوە پێغەمبەرم

[١] صحيح البخاري (١٣٦٩) (٤٦٩٩)، صحيح مسلم (٢٨٧١)، سنن أبي داود (٤٧٥٠) (٤٧٥٣).
[٢] صحيح البخاري (١٣٧٢) (١٠٤٩) (١٠٥٥)، سنن النسائي (١٣٠٨)، موطأ مالك (٥٠٩).

بینی هەرجارێک نوێژی کردبا لە دۆعای دوای ئەتەحیات خۆی بە الله دەپاراست لە عەزابی قەبر.

لە ڕیواتێکی تردا هاتوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «عَذابُ القَبْرِ حَقٌّ» واتە: عەزابی قەبر حەق و ڕاستە.

٣. «عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: دَخَلَتْ عَلَيَّ عَجُوزَانِ مِنْ عُجُزِ يَهُودِ الْمَدِينَةِ، فَقَالَتَا: إِنَّ أَهْلَ الْقُبُورِ يُعَذَّبُونَ فِي قُبُورِهِمْ. قَالَتْ: فَكَذَّبْتُهُمَا، وَلَمْ أُنْعِمْ أَنْ أُصَدِّقَهُمَا، فَخَرَجَتَا، وَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ). فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ عَجُوزَيْنِ مِنْ عُجُزِ يَهُودِ الْمَدِينَةِ دَخَلَتَا عَلَيَّ، فَزَعَمَتَا أَنَّ أَهْلَ الْقُبُورِ يُعَذَّبُونَ فِي قُبُورِهِمْ. فَقَالَ: صَدَقَتَا، إِنَّهُمْ يُعَذَّبُونَ عَذَابًا تَسْمَعُهُ الْبَهَائِمُ. قَالَتْ: فَمَا رَأَيْتُهُ بَعْدُ فِي صَلَاةٍ إِلَّا يَتَعَوَّذُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ[1]» واتە: دایکە عائیشە دەفەرموێ: دوو پیرەژن لە پیرەژنەکانی جولەکەی مەدینە هاتن بۆلام، گوتیان: بەڕاستی ئەوانەی لە گۆڕستانن سزا دەدرێن لەناو گۆڕەکانیان. دەڵێت: بە درۆیانم دانا و نەمتوانی بڕوایان پێ بکەم، ئەوان ڕۆیشتن پێغەمبەری الله (ﷺ) هات بۆلام، وتم: ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ)، دوو پیرەژن لە پیرەژنەکانی مەدینە گوتیان: ئەوانەی لە گۆڕستانن سزا دەدرێن لەناو گۆڕەکانیان، فەرموی: ڕاستیان کرد ئەوانە، بە جۆرێک سزا دەدرێن تەنانەت هەموو ئاژەڵەکانیش دەیبیستن، عائیشە دەڵێت: پاشان نەمبینی نوێژێک بکات ئیلا پەنای دەگرت بە سزای ناو گۆڕ.

٤. «أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا تَقُولُ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) خَطِيبًا، فَذَكَرَ فِتْنَةَ الْقَبْرِ الَّتِي يَفْتَتِنُ فِيهَا الْمَرْءُ، فَلَمَّا ذَكَرَ ذَلِكَ ضَجَّ الْمُسْلِمُونَ ضَجَّةً[2]» واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەر (ﷺ) هەڵسایەوە دەستی کرد بە وتاردان، باسی فیتنە و پرسیارەکانی ناو گۆڕی کرد کە مرۆڤ توشی دەبێت، موسڵمانان زۆر شڵەژان و لە تاوان هاواریان لێ هەڵسا.

[1] صحيح البخاري (٦٣٦٦)، صحيح مسلم (٥٨٦)، سنن النسائي (٢٠٦٦) (٢٠٦٧)، مسند أحمد (٢٤١٧٨) (٢٥٧٠٦).
[2] صحيح البخاري (١٣٧٣) (٨٦) (١٨٤)، سنن النسائي (٢٠٦٢)، موطأ مالك (٥١٠).

هەر هەمان فەرمودە ئیمامی نەسائی ئەوەنەی بۆ زیاد کردوە «حَالَتْ بَيْنِي وَبَيْنَ أَنْ أَفْهَمَ كَلَامَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَلَمَّا سَكَنَتْ ضَجَّتُهُمْ قُلْتُ لِرَجُلٍ قَرِيبٍ مِنِّي: أَيْ-بَارَكَ اللَّهُ لَكَ- مَاذَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي آخِرِ قَوْلِهِ؟ قَالَ: قَدْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي الْقُبُورِ قَرِيبًا مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ» واتە: بە جۆرێک بوو بە بەربەست لە نێوان من و ئەوەی تێبگەم لە وتەی پێغەمبەری الله (ﷺ)، کاتێ هات و هاواریان نەما بە پیاوێک لە نزیک خۆمم گوت: الله بەرەکەت بڕێژێ بەسەرتدا، پێغەمبەری الله (ﷺ) لە کۆتا وتەکەیدا چی فەرموو؟ گوتی: فەرموی: بێگومان وەحیم بۆ هاتوە ئێوە توشی فیتنە دەبن لەناو گۆڕەکانتان نزیکە لە فیتنەی دەجال.

واتە چۆن دەجال تاقیکردنەوەیەکی گەورەیە و کەم کەس هەیە بتوانێت لێی دەربچێت مەگەر ئیمانێکی تەواو پۆلاین و قایمی هەبێت عەزابی ناو قەبریش وایە.

**پرسێك:** ئایە پێغەمبەر (ﷺ) گوێبیستی عەزابی قەبر بوە؟

**وەڵام:** بەڵێ لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە جێگیرە پێغەمبەر (ﷺ) گوێبیستی عەزابی قەبر بوە، زەیدی کوڕی ثابیت دەگێڕێتەوە و دەڵێ: «بَيْنَمَا النَّبِيُّ (ﷺ) فِي حَائِطٍ لِبَنِي النَّجَّارِ، عَلَى بَغْلَةٍ لَهُ، وَنَحْنُ مَعَهُ، إِذْ حَادَتْ بِهِ، فَكَادَتْ تُلْقِيهِ وَإِذَا أَقْبُرٌ سِتَّةٌ، أَوْ خَمْسَةٌ، أَوْ أَرْبَعَةٌ، قَالَ: كَذَا كَانَ يَقُولُ الْجُرَيْرِيُّ. فَقَالَ: مَنْ يَعْرِفُ أَصْحَابَ هَذِهِ الْأَقْبُرِ؟ فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا. قَالَ: فَمَتَى مَاتَ هَؤُلَاءِ؟ قَالَ: مَاتُوا فِي الْإِشْرَاكِ. فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ الْأُمَّةَ تُبْتَلَى فِي قُبُورِهَا، فَلَوْلَا أَنْ لَا تَدَافَنُوا لَدَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُسْمِعَكُمْ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ الَّذِي أَسْمَعُ مِنْهُ. ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ، فَقَالَ: تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ النَّارِ. قَالُوا: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ النَّارِ. فَقَالَ: تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ. قَالُوا: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ. قَالَ: تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الْفِتَنِ، مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ. قَالُوا: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الْفِتَنِ، مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ. قَالَ: تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ. قَالُوا: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ[١]» واتە: لەکاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) لەباخەکەی (بنو نجاردا) بەسەر هێسترەکەیەوە بوو، ئێمەش لە خزمەتیدا بوین، لە پڕ هێسترەکەی سڵەمیەوە، و خەریك بوو بیخاتە خوارەوە

[١] صحيح مسلم (٢٨٦٧)، مسند أحمد (٢١٦٥٨).

سەیرمان کرد شەش، یان یان پێنج، یان چوار قەبر (لەو ناوەدابون)، پێغەمبەر (ﷺ) پرسی (کێ مردوی ئەم گۆڕانە دەناسێ؟). پیاوێك گوتی: من. پێغەمبەر (ﷺ) پرسی: (کەی ئەوانە مردون؟) کابرا گوتی: لەسەردەمی شیرکدا مردون. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (بەڕاستی ئەم خەڵکە توشی سەختی و ناخۆشی دەبن لە گۆڕەکانیاندا، ئەگەر لەبەرئەوە نەبێت کە نەوەکو یەکتر نەنێژن، لە الله دەپاڕامەوە کەدەنگی سزای ناو گۆڕ وەك من ببیستن. پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ڕوی تێکردین و فەرموی: (پەنا بگرن بە الله لە سزای ئاگر) هەموو گوتیان: پەنا دەگرین بە الله لە سزای ئاگر، ئیجا فەرموی: (پەنا بگرن بە الله لە سزای ناوگۆڕ) هەموو گوتیان: پەنا دەگرین بە الله لە سزای ناوگۆڕ، پاشان فەرموی: (پەنا بگرن بە الله لە فیتنەی ئاشکرا و پەنهان). هەموو گوتیان: پەنا دەگرین بە الله لە فیتنەی ئاشکرا و پەنهان، لەوەودوا فەرموی: (پەنا بگرن بە الله لە فیتنە و ئاشوبی دەجال) هەموو گوتیان: پەنا دەگرین بە الله لە فیتنە و ئاشوبی دەجال.

لە حەدیسێکی تردا ئەبو ئەیوب -الله لێی ڕازی بێت- دەڵێت: «خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَسَمِعَ صَوْتًا، فَقَالَ: يَهُودُ تُعَذَّبُ فِي قُبُورِهَا[١]» واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دوای خۆرئاوابون چوە دەرەوە گوێی لەدەنگێك بوو، فەرموی: ئەوە جولەکەکانن لە گۆڕەکانیاندا سزا دەدرێن.

لە حەدیسێکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ: أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لَا يَسْتَتِرُ مِنَ الْبَوْلِ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ[٢]» واتە: ئەم دوانە سزا دەدرێن، و لەسەر تاوانی گەورە سزا نادرێن، بەڵکو یەکێکیان خۆی نەدەپاراست لە میز، و ئەوی تریان خەریکی دوو زمانی بوو.

[١] صحيح مسلم (٢٨٦٩)، صحيح البخاري (١٣٧٥)، سنن النسائي (٢٠٥٩).

[٢] صحيح البخاري (٢١٨) (٢١٦) (١٣٦١)، صحيح مسلم (٢٩٢)، سنن أبي داود (٢٠).

**پرسێك:** ئایە دەشێ هەندێکجار دیمەنی ئەو کەسانەی عەزاب دراون ئێمە ببینین بۆ ئەوەی پەند و وانەی لێ وەربگرین؟

**وەڵام:** بەڵێ دروستە، وەکو إبن تیمیة -رحمه الله- دەفەرموێ: (فَقَدْ يُكْشَفُ لِكَثِيرِ مِنْ أَبْنَاءِ زَمَانِنَا يَقَظَةً وَمَنَامًا وَيَعْلَمُونَ ذَلِكَ وَيَتَحَقَّقُونَهُ وَعِنْدَنَا مِنْ ذَلِكَ أُمُورٌ كَثِيرَةٌ[1]) واتە: لەو سەردەمەی ئێمەدا زۆرجار چ بە ئاگایی یان بە نوستن الله تعالی بۆ خەڵکانێکی ئاشکرا کردوە دیمەن و عەزابەکانی قەبر بیستویانە یان بینیویانە کە بەدواداچونمان لەسەر کردوە شتانێکی زۆر لەو باس و بابەتانە ڕویداوە.

لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: (وَإِذَا عُرِفَ أَنَّ النَّائِمَ يَكُونُ نَائِمًا وَتَقْعُدُ رُوحُهُ وَتَقُومُ وَتَمْشِي وَتَذْهَبُ وَتَتَكَلَّمُ وَتَفْعَلُ أَفْعَالاً وَأُمُورًا بِبَاطِنِ بَدَنِهِ مَعَ رُوحِهِ وَيَحْصُلُ لِبَدَنِهِ وَرُوحِهِ بِهَا نَعِيمٌ وَعَذَابٌ؛ مَعَ أَنَّ جَسَدَهُ مُضْطَجِعٌ؛ وَعَيْنَيْهِ مُغْمَضَةٌ وَفَمَهُ مُطْبَقٌ وَأَعْضَاءَهُ سَاكِنَةٌ وَقَدْ يَتَحَرَّكُ بَدَنُهُ لِقُوَّةِ الْحَرَكَةِ الدَّاخِلَةِ وَقَدْ يَقُومُ وَيَمْشِي وَيَتَكَلَّمُ وَيَصِيحُ لِقُوَّةِ الْأَمْرِ فِي بَاطِنِهِ؛ كَانَ هَذَا مِمَّا يُعْتَبَرُ بِهِ أَمْرُ الْمَيِّتِ فِي قَبْرِهِ؛ فَإِنَّ رُوحَهُ تَقْعُدُ وَتَجْلِسُ وَتُسْأَلُ وَتُنَعَّمُ وَتُعَذَّبُ وَتَصِيحُ وَذَلِكَ مُتَّصِلٌ بِبَدَنِهِ؛ مَعَ كَوْنِهِ مُضْطَجِعًا فِي قَبْرِهِ. وَقَدْ يَقْوَى الْأَمْرُ حَتَّى يَظْهَرَ ذَلِكَ فِي بَدَنِهِ وَقَدْ يُرَى خَارِجًا مِنْ قَبْرِهِ وَالْعَذَابُ عَلَيْهِ وَمَلَائِكَةُ الْعَذَابِ مُوَكَّلَةٌ بِهِ فَيَتَحَرَّكُ بَدَنُهُ وَيَمْشِي وَيَخْرُجُ مِنْ قَبْرِهِ وَقَدْ سَمِعَ غَيْرُ وَاحِدٍ أَصْوَاتَ الْمُعَذَّبِينَ فِي قُبُورِهِمْ وَقَدْ شُوهِدَ مَنْ يَخْرُجُ مِنْ قَبْرِهِ وَهُوَ مُعَذَّبٌ وَمَنْ يَقْعُدُ بَدَنُهُ أَيْضًا إذَا قَوِيَ الْأَمْرُ لَكِنَّ هَذَا لَيْسَ لَازِمًا فِي حَقِّ كُلِّ مَيِّتٍ؛ كَمَا أَنَّ قُعُودَ بَدَنِ النَّائِمِ لِمَا يَرَاهُ لَيْسَ لَازِمًا لِكُلِّ نَائِمٍ بَلْ هُوَ بِحَسَبِ قُوَّةِ الْأَمْرِ[2]) واتە: مادەم ئەوە بزاندرێت هەندێکجار نوستو لە خەودا خەون دەبینێت گیانەکەی دەڕوات یان لاشەشی لەگەڵی دەڕوا قسە دەکات و هەڵسوکەوت دەکات کار و کردەوە دەکات ئاگاشی لێی نیە بەو خەوە هەندێکجار عەزاب دەبینێت هەندێکجاریش خۆشی دەبینێت، هەندێکجاریش لاشەکەی لە تەنیشتی تۆشە و هەستی پێ ناکەیت؛ هەندێکجار دەمی قەپاتە چاوی داخراوە ئەندامەکانی لاشەی هیچ ئیش

[1] مجموع الفتاوى (٢٤/ ٣٧٦).

[2] مجموع الفتاوى(٥/٢٢٥).

ناکات لەگەڵ ئەوەدا ئەگەر لێشی بپرسی کە خەونی بینیوە و هەستاوە و بەپێ ڕۆشتوە و خۆشی و ناخۆشی بینیوە و دانیشتوە ئەو گیانەی لە ناوەوەیدایە ئەو وایکردوە ئەو شتانە ئەنجام بدرێت و تۆش هەستی پێ ناکەی هەندێکجار هەڵدەستێ قسە دەکات و هاوار دەکات لە خەوەکەی تۆ دەنگیت گوێ لێ نیە و ئەگەر هەڵیش بستێ دەڵێ قوڕگم کەوت هەر هاوار هاوارم بوو هاواری فڵانم دەکرد چونکە الله تعالی ئەو هێزەی پێ بەخشیوە لە ناخیدا بەبێ ئەوەی لەتۆ دیاربێت؛ جا ئەوەش دەبێ ڕەچاو بکرێت مردو بەو شێوازە لەناو گۆڕەکەیدا هەر ئەو پەروەردگارەیە ئەوەی پێ ببەخشێت؛ گیانەکەی دادەنیشێنرێت پرسیاری لێ دەکرێت خۆشی پێ دەدرێت عەزاب دەدرێت هاواری لێ هەڵدەستێ و هاوار دەکات ئەو کاتەی گیانەکە دێتەوە بەر لاشەکەی، لەگەڵ ئەوەدا وەکو نوستوەکە لاشەکەشی ڕاکشاوە لەنێوە گۆڕەکەی. هەندێکجار ئەوە لە لاشەکەشی بەدەردەکەوێت و پێیەوە دیار دەبێت مردوەکە لە دەرەوەی گۆڕەکە خەڵکانێک ئەو دەبینن کە چی بەسەر دێت یان ئەویش خەڵکانێک دەبینێ یان دەبیستێ هەندێک جاریش خەڵکێک لە دەرەوەی گۆڕەکە ڕاوەستاوە لەو کاتەی ئەو عەزابەی بەسەر دێت هەستی پێ ناکەن فریشتەکانی عەزاب لەو کاتەدا لەناو گۆڕدا لەگەڵین و لاشەی دەجوڵێنن دەریدەهێنن لەناو گۆڕەکەی بۆ شوێنێکی تری دەبەن پاشان دەڕوات زۆر کەس بۆیان گێڕاینەوە و جێگیر بوە عەزابی قەبری بیستوە و گوێ بیستی عەزابی قەبر بوە پێغەمبەریش نەبوە و پێغەمبەرانیش نەبون یان هەندێک جاریش هەیە بینراوە دیمەنی هەندێک لە جەنازەکان کە قەبر و گۆڕیان لەسەری هەڵداوەتەوە پێیوە دیارە عەزاب دراوە بەڵام ئەوە مەرج نیە بۆ هەموو مردویەک بێت یان هەموو کەسێک لە زیندوەکان ئەوەی بینیبێت یان بیستبێت؛ هەروەکو هەموو کەسێکیش خەو بینینی وەکو یەک نیە هەیە خەو نابینێت یان زۆر کەم دەیبینێت ئەگەر بیشیبینێت ئەوەندە بەهێز نیە هاوار بکات و ڕابکات و بڕوا و قسە بکات عەزابەکەی قەبریش هەر بەو شێوەیە و بەو شێوەیە دابەش دەبێت.

بە چاوی خۆمان یەکێک لە جەنازەکانمان بینی لە شاری هەولێر من ئەو کاتە تەمەنم (١٥ تا ١٦) ساڵ بوو، لەدوای ئەوەی کاتێک ڕژێمی بەعس هات شار و شارۆچکەکانی کوردستان بگرێتەوە لە ساڵی ئازاری (١٩٩١)، ئێمە لە گەڕەکی تەیراوە نیشتەجێ بوین لەو دیوی مزگەوتی (شێخ مەلا ڕەشیدی سەر گردەکە) ماڵمان لەوێ بوو، ئافرەتێک هەبوو جیرانمان بوو، خێزانی دوەمی یەک لە مام حاجیەکانی دراوسێمان بوو، بەم کۆتایانە ئەو ئافرەتەی هێنابوو، خێزانە گەورەکەی منداڵی نەدەبوو بە تەمەندا چوبوو، ئەو ئافرەتە ماڵی باوکیشی ئینسانی باش و بەڕێز بون بەڵام لە دەست دەرچوبوو و لە ساڵۆنەکان ئیش و کاری دەکرد، جل و بەرگی ناڕێکی ئەو سەردەمەی لەبەر دەکرد نەک ناڕێک بوبێت بەقەد ئەو سەردەمەی ئێستای خۆمان، بە سەر کۆتی دەهاتە دەرەوە، ئێمە بە بیرمان دێت دایکم و جیرانەکان زۆرجار ئامۆژگاری ئەو ئافرەتەیان دەکرد دەیانگوت نوێژ بکە کچی خۆم دونیا کەم و کورتە مردن هەیە ڕۆژێک دێت دەمریت، من گوێبیستی دەبوم زۆرجار لە وەڵامی دراوسێکان دەیگوت ئێرە دونیایە و دەمەوێت تۆزێک خۆشی ببینم و گەنجم بۆ ڕۆژێک کە هاتو مردم خۆ لە کەس دیار نیە چیم بەسەر دێت و شاراوەم کەس نامبینێت چیم بەسەر دێت، ئەو ئافرەتە نوێژی نەدەکرد و ڕۆژوی نەدەگرت و بە قژ کۆتیش دەهاتە دەرەوە و لە ساڵۆنیش ئیشی دەکرد.

کاتێک ڕژێمی بەعس هاتەوە و خەڵک هەموی هاڵهاتن خێزانی دوەمی ئەو پیاوە نەیتوانی هەڵبێت بە تەمەندا چوبوو ئەو پیاوە لەو ئافرەتەی دوەم دوو منداڵیشی هەبوو و ئەوەی بێدینەکە بوو نوێژی نەدەکرد، کچە گەورەکە لەلای خێزانە گەورەکەی بەجێما و لە ماڵەوە مانەوە، پیاوەکە کچێکی منداڵیان هەبوو بە باوەش هەڵدەگیرا لەگەڵ خێزانە نوێیەکەی بەڕێکەوتن بەرەو ڕێگای بەحرەکە، لەو ڕێگایەدا پێش ئەوەی بگەن بە عەنکاوە کۆپتەری ڕژێمی بەعس هات لە هەندێک خەڵکیدا، یەکێک لەوان ئەو ئافرەتە بوو بەبەر کەوت و لەگەڵ منداڵەکەش کە بە باوەشیەوە بوو هەردوکیان مردن، پیاوەکە بەبەر نەکەوت هەڵهات، لەدوای دوو ڕۆژ هەتا سێ ڕۆژ ئینجا پیاوەکە توانی بچێ جەنازەکە بێنێتەوە لە دەست سەربازەکانی ڕژێمی بەعس، ئەوە جارێک الله پیشانیدا جەنازەکەی مایەوە لە عاقار و

هەندێک ڕزی و بۆگەنی بوو، لە پاشان بە عارەبانە کە زبڵی پێ دەڕێژرێ ئەو پیاوە چو جەنازە و مەیتەکەی هێنایەوە.

لەدوای ئەوە شاردیەوە و خەڵکی نزیکەی یەک دوو مانگێکی پێچو کە هاتنەوە شوێنەکانی خۆیان، ڕۆژێکیان ماڵی باوکی ئەو ئافرەتە زۆریان کرد لە زاوایەکەیان گوتیان وەرە گۆڕەکەمان پێ نیشاندە لە گۆڕستانی (شێخ مەلا ڕەشید)، کچەکەمان هەر گوتوتە ژێر خاکم کردوە ئێمە دەری دەهێنین و ئەم جارە بە جوانی دەیشارینەوە و کچی خۆمانە و دڵمان بۆی دەسوتێت.

کە گۆڕەکەیان هەڵدایەوە منیش یەکێک بوم لەوێ وەکو مێرد منداڵەیەک تەماشای دیمەنەکەم دەکرد، کە جەنازەکە بەدیار کەوت خەڵکەکە هەموی ڕایکرد، سوێند بە الله ئەو جەنازە ئەو پارچە کفنەی کە پێیوە پێچرابوو هەموی قان قان مابوو ئەویتر هەموی سوتێنرابوو، دەتگوت ئاگر بەلاشەیەوە نراوە، ددانی گرِبوبوو لەگەڵ ئەوەدا ڕەش هەڵگەڕابوو، وەکو گۆشت کە سور دەکرێتەوە ئەوها لاشە و جسمی سورکرابۆوە، هەندێکی ڕزی بوو ئەویتریشی هەموی بەو شێوەیە بوو، پیاو و ژن و خزم و کەسی هەر هەموو ڕایانکرد بەرەو مزگەوت، هەتا هەنایان بردە بەر مامۆستای نێو مزگەوت، گوتیان مامۆستا چی بکەین و شتێکی وامان لێ قەوماوە کەس جورئەت ناکات دەستی لێ بدات، لەسەر داوای مامۆستا دوو کەس جورئەتیان بەخۆیاندا و پارچە پەڕۆیەکیان هێنا و لێیان پێچا و لەو گۆڕە نوێیەیان ناشتو خۆڵیان بەسەردا دایەوە، و ئەوە بوە پەند بۆ خەڵکی ئەو گەڕەکە و ئەوانەی بە چاوی خۆیان بینیان.

ئەوەیە تەحەدا کردنی الله تعالی ئەو ئافرەتە دەیگوت لە ناو گۆڕدا کەس نامبینێت بشارێمەوە، الله تعالی دوو جار بە خەڵکی پیشاندا، باوکی خۆی جورئەتی نەکرد دەستی لێ بدات و هەڵی بگرێت برای خۆی لەبەری ڕایکرد و ترسا.

## هەندێك لە وەسفی خۆشی و ناخۆشیەكانی ژیانی ناو گۆڕ:

پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) لە فەرموده دورو درێژەكەی بەڕائی كوڕی عازب هاتوه سەبارەت بە كەسی بڕوادار فەرمویەتی: «فيَأتِيه مَلَكان، فيُجْلِسانه، فيَقولانِ له: مَن ربُّكَ؟ فيقولُ: رَبيِّ اللهُ، فيَقولانِ له: ما دِينُكَ؟ فيَقولُ: دِينِيَ الإسلامُ، فيَقولانِ له: ما هذا الرجلُ الذي بُعِث فيكُمْ؟ فيَقولُ: هو رسولُ اللهِ، فيَقولانِ له وما عِلْمُكَ؟ فيَقولُ: قَرأتُ كِتابَ اللهِ فآمَنتُ به وصَدَّقْتُ، وفي رواية: فيَنتهِرُه فيَقولُ: مَن ربُّكَ؟ ما دِينُكَ؟ مَن نَبيُّكَ؟ وهي آخِرُ فِتنةٍ تُعرَضُ على المؤمنِ، فذلك حين يقولُ اللهُ عزَّ وجلَّ: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدونيا وَفِي الْآخِرَةِ﴾ [إبراهيم: ٢٧] فيُنادِي مُنادٍ في السماءِ: أن صَدَقَ عَبْدِي، فأَفْرِشُوهُ من الجنةِ، وأَلْبِسُوهُ من الجنةِ، وافْتَحُوا له بابًا إلى الجنةِ، قال: فيَأْتِيه من رَوحِها وطِيبِها، ويُفْسَحُ له في قبرِه مَدَّ بَصَرِه، قال: ويَأْتِيه- وفي روايةٍ: يُمَثَّلُ له- رجلٌ حَسَنُ الوجهِ، حَسَنُ الثيابِ، طَيِّبُ الرِّيحِ، فيقولُ: أَبْشِرْ بالذي يَسُرُّكَ، أَبْشِرِ برِضْوانٍ من اللهِ، وجَنّاتٍ فيها نعيمٌ مُقيمٌ، هذا يومُكَ الذي كنتَ تُوعَدُ، فيقولُ له: وأنت فبَشَّرَكَ اللهُ بخيرٍ مَن أنت؟ فوَجْهُكَ الوجهُ يَجِئُ بالخيرِ، فيَقولُ: أنا عملُكَ الصّالحُ، كنتَ واللهِ سَريعًا في طاعةِ اللهِ، بَطيئًا عن مَعصيةِ اللهِ، فجَزاكَ اللهُ خيرًا، ثُمَّ يُفتَحُ له بابٌ مِن الجنَّةِ، وبابٌ مِن النّارِ، فيُقالُ: هذا كان مَنزِلَكَ لو عَصَيتَ اللهَ، أبدَلَكَ اللهُ به هذا، فإذا رَأى ما في الجنَّةِ، قال: ربِّ، عَجِّلْ قيامَ السّاعةِ؛ كَيما أرجِعَ إلى أهلي ومالي، فيُقالُ له: اسكُنْ[1]» واتە: ئینجا دوو فریشتەی (توند ڕاچەڵكێنەر) دێن بۆ لای، و ڕایدەچەڵكێنن و دایدەنیشێنن، پاشان پێی دەڵێن: كێ پەروەردگارتە؟ ئەویش دەڵێت: پەروەردگارم اللهیە، پاشان پێی دەڵێن: ئاینت چییە؟ ئەویش دەڵێت: ئیسلام ئاینمە، پاشان پێی دەڵێن: ئەو پیاوە كێیە كە لە نێوتاندا نێردرابو؟ ئەویش دەڵێت: نێردراوی اللهیە، پاشان پێی دەڵێن: چۆن زانیت؟ ئەویش دەڵێت: كتێبەكەی الله (قورئانم) خوێندەوە و باوەڕم پێهێنا و بەڕاستم زانی، ئەمەش دواین تاقیكردنەوەیە روبەڕوی باوەڕدار دەكرێتەوە، ئەوەیە كە الله تعالى لە بارەیەوە دەفەرموێت:

[1] حكم الحديث: إسناده صحيح رجاله رجال الصحيح، مسند أحمد (١٨٥٣٥) (١٨٥٣٦) (١٨٦١٤) (١٨٦٢٥)، سنن أبي داود (٣٢١٢) (٤٧٥٣)، سنن النسائي (٢٠٠١).

﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدونيا وَفِي الْآخِرَةِ﴾ [إبراهيم: ٢٧]واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە الله دامەزراویان دەکات بەهۆی ئەو وتە جێگیر و نەگۆڕاوە (کە شایەتمانە) لە ژیانی دونیادا و لەڕۆژی دوایشدا وە الله ستەم کارانیش گومڕا دەکات وە الله هەرچی بیەوێ دەیکات. پاشان بانگ کارێك بانگ دەکات لە ئاسمانەوە بەندەکەم ڕاستی کـرد، ڕایخـەن بۆی لە فەرشـی بەهەشـت، بیپـۆشن لە پۆشاکی بەهەشت، دەرگایەکی بۆ بکـەنەوە بەرەو بەهەشت، لە خۆشی و بۆنی بەهەشتی بۆ دێت، و گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێتەوە تاوەکو چاو بڕبکات، پیاوێکی ڕومەت جوانی، پۆشاك جوانی، بۆن خۆشی بۆ دەنوێنرێت و دێت بۆلای، و پێی دەڵێت: مژدەت لێبێت بەوەی کە پێت خۆشە، مژدەت لێبێت بە ڕەزامەندی الله و باخانێك لە بەهەشتدا کە خۆشگوزرانی بەردەوامی تێدایە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە بەڵێنت پێی دەدرا، ئەویش پێی دەڵێت: وە تۆش الله موژدەی خێرت بداتێ، تۆ کێیت؟ ڕومەتت ڕومەتێکە خێر و خۆشی دێنێت، ئەویش دەڵێت: من کردەوە چاکەکانتم، سوێند بە الله بە تۆم نەزانیوە ئیلا ئەوە نەبێت کە پەلە و دەست پێشخەریت کردوە لە گوێڕایەڵی اللەدا ، و لەسەرخۆ و خاویش بویت لە سەرپێچی اللەدا، الله پاداشتی خێرت بداتەوە، پاشان دەرگایەکی بۆ دەکرێتەوە لە بەهەشتەوە و دەرگایەکیشی بۆ دەکرێتەوە لە دۆزەخەوە، و پێی دەگوترێت: ئەمە جێگاکەت بوو لە دۆزەخدا ئەگەر سەرپێچی اللەت بکردایە، الله گۆڕیویەتیەوە بۆت بەم جێگایە لە بەهەشتدا، جا ئەگەر ئەوەی بینی کە لە بەهەشتدایە، دەڵێت: پەروەردگارم هاتنی ڕۆژی قیامەت پێش بخە، بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ لای ماڵ و کەس و کارم، پێی دەگوترێت: ئارام بگرە.

سەبارەت بە کەسی کافریش دەفەرموێت: «فإذا أخذها، لم يَدَعُوها في يَدِهِ طَرْفَةَ عينٍ حتى يَجْعَلُوها في تِلْكِ المُسُوحِ، ويخرجُ منها كأَنْتَنِ رِيحِ جِيفَةٍ وُجِدَتْ على وجهِ الأرضِ، فيَصْعَدُونَ بها فلا يَمُرُّونَ بها على مَلَأٍ من الملائكةِ إلا قالوا: ما هذا الرُّوحُ الخَبِيثُ؟ فيقولونَ: فلانُ ابنُ فلانٍ بأَقْبَحِ أسمائِهِ التي كان يُسَمَّى بها في الدونيا، حتى يُنْتَهَي به إلى السماءِ الدونيا، فيُسْتَفْتَحُ له، فلا يُفْتَحُ له، ثم قرأ رسولُ اللهِ (ﷺ) ﴿لا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوابُ السَّماءِ وَلا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتّى

يَلِجَ الْجَمَلُ في سَمِّ الْخِياطِ﴾ فيقولُ اللهُ عَزَّ وجَلَّ: اكْتُبُوا كتابَه في سِجِّينَ في الأرضِ السُّفْلى، ثم يُقالُ: أَعِيدُوا عَبْدِي إلى الأرضِ فإني وَعَدْتُهُمْ أني،﴿مِنهَا خَلَقنَـٰكُم وَفِيهَا نُعِيدُكُم وَمِنهَا نُخرِجُكُم تَارَةً أُخرَىٰ﴾ [طه: ٥٥]، فتُطْرَحُ رُوحُهُ من السماءِ طَرْحًا حتى تَقَعَ في جَسَدِهِ ثم قرأ: ﴿وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّه فَكَأَنَّما خَرَّ مِنَ السَّماءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكانٍ سَحِيقٍ﴾ [الحج: ٣١][١] » واتە: پاشان فریشتەی گیان کێشان گیانەکە دەبات، جا ئەگەر بردی فریشتەکانی تر کە بە دەوریدا دانیشتون بە ئەندازەی چاو تروکاندنێك نایهێڵن بە دەستیەوە تاوەکو لێی وەردەگــرن و یەکسەر دەیخەنە ناو ئەو کفنە ئاگریـــنەوە، بۆنێکی گەنیوی لێ دێتە دەرەوە وەك گەنیوترین بۆنی لاکێکی تۆپیو کە لەسەر ڕوی زەویدا هەبوبێت، پاشان دەیبەنە سەرەوە بۆ ئاسمان و ئەو ڕۆحە تێناپەڕێنن بە لای هیچ کۆمەڵە فریشتەیەکدا ئیلا دەڵێن: ئەوا ئەم ڕۆحە پیسە هی کێیە؟ ئەو فریشتانەش کە ڕۆحەکەیان پێیە دەڵێن: ئەمە ڕۆحی (فلان)ی کوڕی (فلان)ـە، ناوی دەبەن بە ناشیرین ترین ناوی کە لە دونیادا ناویان پێی دەبرد، تاوەکو دەیگەیەننە ئاسمانی دونیا، داوا دەکەن دەرگای ئاسمانی بۆ بکرێتەوە، دەرگای بۆ ناکرێتەوە، پاشان پێغەمبەری الله (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿لا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ﴾ [الأعراف: ٤٠] واتە: دەرگاکانی ئاسمان ناکرێتەوە بۆ بێ باوەڕان و ناشچنە ناو بەهەشتەوە تاوەکو وشتر نەچێت بە کونە دەرزیدا. پاشان الله تعالى دەفەرموێت: کتێبەکەی لە(سجین)دا لە خواروترین تەبەقەی زەویدا بنوسن، پاشان الله تعالى دەفەرموێت: ڕۆحەکە بگێڕنەوە بۆ زەوی، ﴿مِنهَا خَلَقنَـٰكُم وَفِيهَا نُعِيدُكُم وَمِنهَا نُخرِجُكُم تَارَةً أُخرَىٰ﴾ [طه: ٥٥] چونکە بە ڕاستی من بەڵێنم پێ داون کە بەڕاستی من لەو زەویە دروستیانم کردوە و دەشیان گێڕمەوە بۆ ناوی و جارێکی تریش لە زەوی دەریان دە هێنمە دەرەوە، پاشان ڕۆحەکەی لە ئاسمانەوە فڕێدەدرێتە خوارەوە تاوەکو دەکەوێتە ناو لاشەکەی، پاشان پێغەمبەی الله (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَنْ يُشْرِكْ

---

[١] حكم الحديث: إسناده صحيح رجاله رجال الصحيح، مسند أحمد (١٨٥٣٥) (١٨٥٣٦) (١٨٦١٤) (١٨٦٢٥)، سنن أبي داود (٣٢١٢) (٤٧٥٣)، سنن النسائي (٢٠٠١).

بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾ [الحج: ٣١] واتە: جا هەر کەس هاوبەش بۆ الله دابنێ ئەوە وەك ئەوە وایە لە ئاسمان کەوتبێتە خوارەوە پاشان باڵندە (لە هەوادا) بەپەلە بیفڕێنێ (پارچە پارچە بێت) یا بایەکی توند بیبات بۆ جێگایەکی زۆر دور (چۆڵەوانی).

لە حەدیسێکی تردا سەبارەت بە کەسی بڕوادار فەرمویەتی: «يَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُقْعِدَانِهِ، فَيَقُولَانِ لَهُ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟ قَالَ: فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ. قَالَ: فَيُقَالُ لَهُ: انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ قَدْ أَبْدَلَكَ اللَّهُ بِهِ مَقْعَدًا مِنَ الْجَنَّةِ. قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ): (فَيَرَاهُمَا جَمِيعًا). قَالَ قَتَادَةُ: وَذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ يُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ سَبْعُونَ ذِرَاعًا، وَيُمْلَأُ عَلَيْهِ خَضِرًا إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ[1]» واتە: دوو فریشتە دێن و دایدەنیشێنن، و دەڵێن: تۆ کاتی خۆی دەربارەی ئەم پیاوە چیت دەوت؟ ئیماندار دەڵێت: من شایەتی دەدەم کە ئەو بەندە و پێغەمبەری اللەیە، ئەوسا پێی دەگوترێت: تەماشای جێگەی خۆت بکە لەدۆزەخدا، الله بۆی گۆڕیویت بە جێگەیەکی تر لە بەهەشتدا. جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (هەردوکیان دەبینێت). (قتادە) دەڵێ: بۆمان باسکرا کە گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێت بە ئەندازەی حەفتا باڵ و بۆی پڕدەکرێت لە سەوزایی تا ئەو ڕۆژەی زیندو دەکرێتەوە.

سەبارەت بە کەسی کافریش دەفەرموێت: «وأمّا المُنافقُ والكافرُ فيُقالُ له: ما كُنْتَ تَقُولُ في هذا الرَّجُلِ؟ فيَقولُ: لا أدْرِي كُنْتُ أقُولُ ما يقولُ النّاسُ، فيُقالُ: لا دَرَيْتَ ولا تَلَيْتَ، ويُضْرَبُ بمَطارِقَ مِن حَدِيدٍ ضَرْبَةً، فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُها مَن يَلِيهِ غيرَ الثَّقَلَيْنِ[2]» واتە: بەڵام کەسی بێ بڕوا یان دوڕو پێی دەگوترێت: تۆ چی دەڵێی دەربارەی ئەو پیاوە، دەڵێ: نازانم خەڵکی چیان دەگوت منیش هەر ئەوەم دەگوت، پاشان دەڵێت دەک هەر نەزانیت، ئیتر یەک گورزی ئاسنین دەدەن لە نێوانی هەردو گوێچکەی، ئیتر هات و هاوارێکی وا دەکات هەموو ئەوانەی لە دەوروبەرین دەیبیستن جگە لە مرۆڤ و جنۆکە.

[1] صحيح البخاري (١٣٧٤) (١٣٣٨)، صحيح مسلم (٢٨٧٠)، سنن أبي داود (٣٢٣١) (٤٧٥١).
[2] صحيح البخاري (١٣٧٤) (١٣٣٨)، صحيح مسلم (٢٨٧٠)، سنن أبي داود (٣٢٣١) (٤٧٥١).

لە ڕیواتێکی تردا هاتوە دەفەرموێ: «فَيُنْطَلَقُ بِهِ إِلَى بَيْتٍ كَانَ لَهُ فِي النَّارِ، فَيُقَالُ لَهُ: هَذَا بَيْتُكَ كَانَ لَكَ فِي النَّارِ، وَلَكِنَّ اللَّهَ عَصَمَكَ وَرَحِمَكَ فَأَبْدَلَكَ بِهِ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ. فَيَقُولُ: دَعُونِي حَتَّى أَذْهَبَ فَأُبَشِّرَ أَهْلِي. فَيُقَالُ لَهُ: اسْكُنْ[1]» واتە: جا دەبرێت بۆ ماڵێک لە ئاگری دۆزرەخ، پێی دەگوترێت: ئەوە ماڵی تۆ بوو لە دۆزەخدا، بەڵام الله پاراستیتی و سۆز و میهرەبانی نواند بەرامبەرت ئەو ماڵەی بۆ گۆڕیت بە ماڵێک لە بەهەشتدا، دەڵێت: وازم لێ بهێنن تاکو بڕۆم مژدە بدەم بە خانەوادەکەم و کەس و کارەکەم. پێی دەگوترێت: ئارام بگرە و بۆخۆت بمێنەرەوە.

لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە فەرمویەتی: «إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا مَاتَ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ: إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، يُقَالُ: هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[2]» واتە: هەرکەس لە ئێوە کە دەمرێت شوێنەکەی لەبەیانیان و ئێوارانددا نیشان دەدرێت، ئەگەر لەخەڵکی بەهەشت بێ، ئەوە خەڵکی بەهەشتە، خۆ ئەگەر خەڵکی دۆزەخ بێت، ئەوە خەڵکی دۆزەخە، ئینجا پێی دەگوترێت: ئەمە جێگەی تۆیە هەتا ڕۆژی قیامەت الله تعالى زیندوت دەکاتەوە بۆلای خۆی.

لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە کە دوای ئەوەی پرسیاری لێ دەکرێت فریشتەکان دەفەرمون: «قَدْ كُنَّا نَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُولُ هَذَا. ثُمَّ يُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ سَبْعُونَ ذِرَاعًا فِي سَبْعِينَ، ثُمَّ يُنَوَّرُ لَهُ فِيهِ، ثُمَّ يُقَالُ لَهُ: نَمْ. فَيَقُولُ: أَرْجِعُ إِلَى أَهْلِي فَأُخْبِرُهُمْ؟ فَيَقُولَانِ: نَمْ كَنَوْمَةِ الْعَرُوسِ الَّذِي لَا يُوقِظُهُ إِلَّا أَحَبُّ أَهْلِهِ إِلَيْهِ. حَتَّى يَبْعَثَهُ اللَّهُ مِنْ مَضْجَعِهِ ذَلِكَ، وَإِنْ كَانَ مُنَافِقًا قَالَ: سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ، فَقُلْتُ مِثْلَهُ: لَا أَدْرِي، فَيَقُولَانِ: قَدْ كُنَّا نَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُولُ ذَلِكَ. فَيُقَالُ لِلْأَرْضِ: الْتَئِمِي عَلَيْهِ. فَتَلْتَئِمُ عَلَيْهِ، فَتَخْتَلِفُ فِيهَا أَضْلَاعُهُ، فَلَا يَزَالُ فِيهَا مُعَذَّبًا، حَتَّى يَبْعَثَهُ اللَّهُ مِنْ مَضْجَعِهِ ذَلِكَ[3]» واتە: ئێمە زانیومانە کە تۆ ئەمە دەڵێی. لە پاشدا گۆڕەکەی حەفتا گەز بە گەز بۆ فراوان دەکرێت، پاشان

[1] سنن أبي داود (٤٧٥١) (٣٢٣١)، صحيح البخاري (١٣٣٨) (١٣٧٤)، صحيح مسلم (٢٨٧٠).
[2] صحيح البخاري (١٣٧٩) (٣٢٤٠) (٦٥١٥)، صحيح مسلم (٢٨٦٦)، سنن الترمذي (١٠٧٢).
[3] حكم الحديث: حسن، سنن الترمذي (١٠٧١)، سنن النسائي (١٨٣٣)، سنن ابن ماجه (٤٢٦٢) (٤٢٦٨).

بۆی ڕوناک دەکرێتەوە، پاشان پێی دەگوترێت: بخەوە، دەڵێت: با بگەڕێمەوە هەواڵ بدەم بە کەس و کارەکەم؟ دەفەرمون: بخەوە وەک خەوتنی ئەو زاوایەی کە لە پەردەدایە جگە لە خۆشەویسترین کەسی کەسێکی تر خەبەری ناکاتەوە. ئیتر بەردەوام لەسەر ئەو حاڵەتەیە هەتا الله لەو جێگایەدا کە تێیدا ڕاکشاوە زیندوی دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر دوڕو مونافیق بوو دەڵێ: نازانم گوێم لێبوو خەڵک شتێکیان دەگوت، منیش وەک ئەوەم دەگوت، دوو مەلائیکەکە دەفەرمون: ئێمە زانیومانە کە تۆ ئەمە دەڵێی. بە زەوی دەفەرمون: خۆتی لێ بهێنەوە یەک. زەوی خۆی لێ دەهێنێتەوە یەک، پەراسوەکانی بەناو یەکدا دێن، ئیتر بەردەوام لەسەر ئەو حاڵەتەیە، هەتا الله زیندوی دەکاتەوە لەو جێگایەدا.

**پرسێك:** ئایە موسڵمانانیش عەزاب و ناخۆشیەکانی ناو گۆڕ دەبینن؟

**وەڵام:** زانایان دەفەرمون بەڵێ عەزابی ناو قەبر تەنها بۆ کافر و مونافیقەکان نیە، بەڵکو موسڵمان و بڕواداریش بە گوێرەی گوناحەکانی ئەگەر تەوبەی لێ نەکردبێت و الله لێی خۆش نەبوبێت هەندێک جار لەناو گۆڕەکەی عەزاب دەدرێ، وەکو ئیمامی قورتوبی دەفەرموێ (ئەبو موحەممەد عبد الحق) فەرمویەتی: (اعلم أن عذاب القبر ليس مختصاً بالكافرين، ولا موقوفاً على المنافقين، بل يشاركهم فيه طائفة من المؤمنين، وكل على حاله من عمله، وما استوجبه من خطيئته وزلله[1]) واتە: بزانن عەزابی قەبر تایبەت نیە بە کافر و بێ بڕواکان، تەنها نەوەستێنراوە لەسەر دوڕوەکانیش، بەڵکو هەندێک جار دیمەنە ناخۆشەکانی ناو گۆڕ و عەزابەکانی ناو گۆڕ بەسەر هەندێک لە ئیماندارەکانیش دێت، هەر کەسێکیان بە گوێرەی عەمەل و کردەوەکانیان سزا دەدرێن، وە هەرچی بخوازێت هەڵە و گوناحەکانی بەو گوێرە الله بە عەدالەتی خۆی عەزابی دەدات.

**پرسێك:** ئایە ئیماندارەکان کە دەمرن چ شتێک دەبێتە مایەی ناخۆشی و عەزابی قەبر بۆیان؟

[1] التذكرة في أحوال الموتى وأمور الآخرة (ص: ١٤٦).

**وەڵام:** زانایانی ئیسلام دەفەرمون دوو بەشە سەبەب و هۆکارەکان بۆ عەزابی قەبر، هەندێک سەبەب و هۆکار هەن بە کورتی قسەیان لەسەر کردوە، وە هەندێک لە سەبەب و هۆکارەکان بە درێژی باسیان کراوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دیاری کردوە و فەرمویەتی ئەوانە دەبنە هۆکاری عەزابی ناو گۆڕ بۆ ئیماندار.

- بە موجمەلی و کورتی: زانایان فەرمویان بەڵێ، کەسی ئیماندار لە دوای ئەوەی دەمرێ بەهۆی نەناسینی الله تعالی وە ئەمر و فەرمانەکانی اللەی جێبەجێ نەکردوە یان قەدەغە و نەهیەکانی کردوە، ئەوانەن دەبنە سەبەب و هۆکاری ئەوەی الله تعالی ئەو مرۆڤە لەناو گۆڕدا عەزاب بدات.
- سەبەب و هۆکارەکان بە دور و درێژی:

هۆکاری یەکەم و دوەم: (خۆپاک ڕانەگرتن لە میز کردن، و قسە هێنان و بردن لەناو خەڵکیدا): ئیبنو عەباس فەرمویەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی و فەرموی: «إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ: أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لَا يَسْتَتِرُ مِنَ الْبَوْلِ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ. ثُمَّ أَخَذَ جَرِيدَةً رَطْبَةً فَشَقَّهَا نِصْفَيْنِ، فَغَرَزَ فِي كُلِّ قَبْرٍ وَاحِدَةً، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لِمَ فَعَلْتَ هَذَا؟ قَالَ: لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا[١]» واتە: ئەم دوانە سزا دەدرێن، و لەسەر تاوانی گەورە سزا نادرێن: بەڵکو یەکێکیان خۆی نەدەپاراست لە میز، و ئەوی تریان خەریکی دوو زمانی بوو. دواتر لقێک دار خورمای تەڕی هەڵگرت و کردی بە دوو لەتەوە و لەسەر هەر یەکێک لەو دوو گۆڕە دانەیەکیانی چەقاند، گوتیان: ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ)، بۆچی واتکرد؟ فەرموی: بەڵکو سزا و ئەشکەنجەیان لەسەر ئاسان بکرێت ئەگەر وشک نەبنەوە.

زانایانی ئیسلام دەفەرمون مەبەست لە خۆپاراستن لە میز کردن لەکاتی میزکردن دەبێت تارەتێکی جوانی ڕێک و پێک بگری نەهێڵی پرشی میزت بەر بکەوێت، وە نەهێڵیت پاش

[١] صحيح البخاري (٢١٨) (٢١٦) (١٣٦١)، صحيح مسلم (٢٩٢)، سنن أبي داود (٢٠).

میزت بێتە دەر، ئەگەر هاتە دەر دوبارە تارەتی بۆ بگرەوە، پاک و خاوێنی خۆت ڕابگریت و پەلە نەکەیت.

لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە عائیشە -رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا- دەڵێ:: «دَخَلَتْ عَلَيَّ امْرَأَةٌ مِنَ الْيَهُودِ، فَقَالَتْ: إِنَّ عَذَابَ الْقَبْرِ مِنَ الْبَوْلِ. فَقُلْتُ: كَذَبْتِ. فَقَالَتْ: بَلَى، إِنَّا لَنَقْرِضُ مِنْهُ الْجِلْدَ وَالثَّوْبَ. فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى الصَّلَاةِ، وَقَدِ ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُنَا، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا قَالَتْ، فَقَالَ: صَدَقَتْ ، فَمَا صَلَّى بَعْدَ يَوْمِئِذٍ صَلَاةً إِلَّا قَالَ فِي دُبُرِ الصَّلَاةِ: رَبَّ جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ، أَعِذْنِي مِنْ حَرِّ النَّارِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ[1]» واتە: ئافرەتێکی جولەکە هاتە ژورەوە بۆلام، گوتی: سزای ناو گۆڕ بەهۆی میز کردنەوەیە. گوتم: ڕاستت نەکرد، گوتی: بەڵکو بەوشێوەیە (ئێمە میز ئەگەر بە جلەکەمان بکەوتایە) جلەکانمان بەهۆیەوە دەبڕیەوە. پێغەمبەری الله (ﷺ) دەرچو بۆ نوێژ، لە کاتێکدا دەنگمان بەرز بویەوە (لەگەڵ ئافرەتە جولەکەکە من دەمگوت درۆ دەکەی ئەو دەیگوت ڕاست دەکەم)، فەرموی: ئەمە چیە؟ هەواڵم پێدا بەوەی (ئافرەتە جولەکەکە) گوتبوی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ڕاستی کرد، لە دوای ئەو نوێژە هەر نوێژێکی بکردایە لە دوای نوێژەکە دەیفەرمووو: ئەی پەروەردگاری جبرائیل و میکائیل و ئیسرافیل، بمپارێزە لە گەرمای ئاگر و سزای ناو گۆڕ.

لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمویەتی: «تنزهوا مِنَ البولِ، فإِنَّ عامَّةَ عذابِ القبرِ منْهُ[2]» واتە: خۆتان زۆر پاک ڕابگرن لە میز کردن، چونکە زۆرینەی عەزابی قەبر لە میزە.

هۆکاری سێیەم: (غلول): دزینی هەر شتێکە چ کەم بێت یان زۆر لە غەنیمەکان و دەستکەوتەکانی شەڕ و جەنگ لە مەیدانی جەنگ و جیهاد، لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە کە گوتویەتی: «خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَ خَيْبَرَ، فَلَمْ نَغْنَمْ ذَهَبًا وَلَا فِضَّةً، إِلَّا الْأَمْوَالَ وَالثِّيَابَ وَالْمَتَاعَ، فَأَهْدَى رَجُلٌ مِنْ بَنِي الضُّبَيْبِ يُقَالُ لَهُ: رِفَاعَةُ بْنُ زَيْدٍ. لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) غُلَامًا، يُقَالُ لَهُ: مِدْعَمٌ. فَوَجَّهَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى وَادِي الْقُرَى، حَتَّى إِذَا كَانَ بِوَادِي الْقُرَى، بَيْنَمَا مِدْعَمٌ يَحُطُّ

[1] حكم الحديث: ضعيف الإسناد، سنن النسائي (١٣٤٥) (٥٥١٩)، مسند أحمد (٢٤٣٢٤).

[2] سنن الدارقطني (٣١١/١)، المحفوظ مرسل، أخرجه الدارقطني (١٢٧/١).

رَحْلاً لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، إِذَا سَهْمٌ عَائِرٌ فَقَتَلَهُ، فَقَالَ النَّاسُ: هَنِيئًا، لَهُ الْجَنَّةُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): كَلَّا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّ الشَّمْلَةَ الَّتِي أَخَذَهَا يَوْمَ خَيْبَرَ مِنَ الْمَغَانِمِ لَمْ تُصِبْهَا الْمَقَاسِمُ، لَتَشْتَعِلُ عَلَيْهِ نَارًا. فَلَمَّا سَمِعَ ذَلِكَ النَّاسُ، جَاءَ رَجُلٌ بِشِرَاكٍ- أَوْ شِرَاكَيْنِ- إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ: شِرَاكٌ مِنْ نَارٍ. أَوْ: شِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ[١]» واتە: لە ساڵی غەزای خەیبەردا لە خزمەت پێغەمبەری الله (ﷺ) دەرچوین بۆ خەیبەر، لەوێ زێڕ و زیومان دەست نەکەوت، بەڵام جل و بەرگ و پۆشاک و کەل و پەل و مەڕ و ماڵات و زەوی و زارمان دەستکەوت، پێغەمبەری الله (ﷺ) و لەشکرەکەی بەرەو وادی (الْقُرَى) کەوتنە ڕێ غوڵامێک بەخشرابوو بە پێغەمبەری الله (ﷺ) ناوی میدعەم بوو، هەتا گەیشتە وادی (الْقُرَى)، کاتێ کە میدعەم خەریک بوو بارەکەی پێغەمبەری الله (ﷺ) لەسەر پشتی وڵاخەی دادەگرت، لەو کاتەدا تیرێک هات و بەریکەوت و کوشتی، خەڵکەکە گوتیان: بەهەشتی پیرۆزبێ و نۆشی گیانی بێ -واتە لە ڕێگەی الله تعالی شەهید بوو-، پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموی: نەخێر سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، ئەو پۆشاکەی کە دەدرێت بەسەر شاندا لە ڕۆژی خەیبەردا لە پێش دابەش کردنی دەستکەوتەکەدا بردبوی، لە بەریدا گڕی تێ بەردەبێ و دەسوتێ -یان دەبێ بە ئاگر و سزای دەدات-. کاتێ کە خەڵکەکە ئەو وتەیان لە پێغەمبەری الله (ﷺ) بیست زۆر ترسان، پیاوێ قەیتانێ یان دوو قەیتانی هێنا بۆ پێغەمبەری الله (ﷺ)، فەرموی: قەیتانێ لە ئاگر، یان، دوو قەیتان لە ئاگر.

لە حەدیسێکی تردا فەرمویەتی: «كَانَ عَلَى ثَقَلِ النَّبِيِّ (ﷺ) رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: كِرْكِرَةُ فَمَاتَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): هُوَ فِي النَّارِ. فَذَهَبُوا يَنْظُرُونَ إِلَيْهِ فَوَجَدُوا عَبَاءَةً قَدْ غَلَّهَا[٢]» واتە: پیاوێ هەبوو ناوی کەر کەرە بوو بارگەچی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، کاتێ مرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: کەر کەرە لەناو ئاگری دۆزەخدایە. کە چون تەماشایان کرد عابایەکیان دۆزیەوە کە کەر کەرە لە غەنیمەت دزیبوی بۆ خۆی.

[١] صحيح البخاري (٦٧٠٧) (٤٢٣٤)، صحيح مسلم (١١٥)، سنن أبي داود (٢٧١١).

[٢] صحيح البخاري (٣٠٧٤)، سنن ابن ماجه (٢٨٤٩)، مسند أحمد (٦٤٩٣).

هۆکاری پێنجەم و چوارەم و شەشەم و حەوتەم: (درۆکردن، یان وازهێنان لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و پشت تێکردنی، یان زینا کردن، یان ڕیبا خواردن): لە سەمورەی کوری جوندوبەوە فەرمویەتی: «كانَ رسُولُ اللَّه (ﷺ) مما يُكْثِرُ أنْ يقولَ لأصحابه: هَلْ رَأَى أحدٌ منكُمْ مِن رُؤْيَا؟ فيقُصُّ عليهِ منْ شَاءَ اللَّه أنْ يقُصَّ. وَإنَّهُ قَالَ لنا ذَات غَدَاة: إنَّهُ أتَاني اللَّيْلَةَ آتيان، وإنَّهما قَالا لي: انطَلِقْ، وإنِّي انْطَلَقْتُ معهُما، وإنَّا أتَيْنَا عَلى رجُلٍ مُضْطَجِعٌ، وإذَا آخَرُ قَائمٌ عَلَيْه بصَخْرَةٍ، وإذَا هُوَ يَهْوِي بالصَّخْرَةِ لِرَأْسه، فَيثْلَغُ رَأْسهُ، فَيَتَدَهْدهُ الحَجَرُ هَاهُنَا. فيتبعُ الحَجَرَ فيأْخُذُهُ، فَلاَ يَرجعُ إلَيْه حَتَّى يَصِحَّ رَأْسُهُ كَما كَانَ، ثُمَّ يَعُودُ عَلَيْه، فَيفْعلُ بهِ مِثْلَ مَا فَعل المَرَّةَ الأوْلَى، قَالَ: قلتُ لهما: سُبْحانَ اللَّه، مَا هذان؟ قَالا لي: انْطَلِقْ انْطَلِقْ، فانْطَلَقْنا. فأَتيْنَا عَلى رَجُل مُسْتَلْقٍ لقَفَاه وَإذا آخَرُ قائمٌ عليه بكَلُّوب مِنْ حَديد، وَإذَا هُوَ يَأْتِي أحَد شِقَّيْ وَجْههِ فيُشَرْشِرُ شِدْقَهُ إلَى قَفَاهُ، ومنْخِرهُ إلى قَفَاهُ، وَعينَهُ إلى قَفاهُ، ثُمَّ يتَحوَّل إلَى الجانب الآخرِ فَيَفْعَل به مِثْلَ مَا فعلَ بالجَانِبِ الأوَّلِ، فَما يَفْرُغُ منْ ذلكَ الجانبِ حتَّى يصِحَّ ذلكَ الجانِبُ كما كانَ، ثُمَّ يَعُودُ عليْه، فَيَفْعَل مِثْلَ مَا فَعلَ فِي المَرَّةِ الأُوْلَى. قَالَ: قلتُ: سُبْحَانَ اللَّه، مَا هذان؟ قالا لي: انْطَلِقْ انْطَلِقْ، فَانْطَلَقْنَا. فَأتَيْنا عَلى مِثْل التَّنُّورِ فَأَحْسِبُ أنهُ قَالَ: فإذا فيه لَغَطٌ، وأصْواتٌ، فَاطَّلَعْنا فيه فَإذَا فيهِ رجالٌ ونساء عُرَاةٌ، وَإذَا هُمْ يأتِيهمْ لَهَبٌ منْ أَسْفلِ منْهُمْ، فإذا أتَاهُمْ ذلكَ اللَّهَبُ ضَوْضوا، قلتُ مَا هؤلاءِ؟ قَالا لي: انْطَلِقْ انْطَلِقْ، فَانطَلَقْنَا. فَأَتيْنَا عَلَى نهرٍ حسِبْتُ أَنهُ كانَ يقُولُ: أَحْمرُ مِثْلُ الدَّمِ، وَإذَا في النَّهْرِ رَجُلٌ سابِحٌ يَسْبحُ، وَإذا عَلَى شَطِّ النَّهْرِ رجُلٌ قَد جَمَعَ عِندَهُ حِجارةً كَثيرَة، وَإذَا ذلكَ السَّابحُ يَسْبَحُ مَا يَسْبَحُ، ثُمَّ يَأتِيْ ذلكَ الَّذي قَدْ جمعَ عِنْدهُ الحجارةَ، فَيَفْغَرُ لهَ فاهُ، فَيُلْقِمُهُ حَجَراً، فَيَنْطَلِقُ فَيَسْبَحُ، ثُمَّ يَرْجِعُ إليهِ، كُلَّمَا رَجَعَ إليْه، فَغَر لهُ فاهُ، فَألْقمهُ حَجَراً، قُلْتُ لهُما: مَا هذان؟ قالاَ لي: انْطَلِقْ انطلِق، فانْطَلَقنا. فَأَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ كريه المَرْآة، أوْ كأَكرَه مَا أنتَ رَاءٍ رجُلاً مَرْأَى، فإذا هُوَ عِندَه نارٌ يحشُّها وَيسْعى حَوْلَهَا، قلتُ لَهُما: مَا هَذَا؟ قالاَ لي: انْطَلِقْ انطلِقْ، فَانْطَلقنا. فَأَتينا عَلَى روْضةٍ مُعْتَمَّةٍ فيها منْ كلِّ نَوْرِ الرَّبيعِ، وَإذَا بيْنَ ظهْري الرَّوضَة رَجلٌ طويلٌ لا أكادُ أَرَى رأسَهُ طُولاً في السَّماء، وَإذَا حولَ الرجلِ منْ أَكْثَرِ وِلدان رَأَيْتُهُمْ قطُّ، قُلتُ: مَا هَذَا؟ وَمَا هؤلاءِ؟ قالا لي: انطَلِقْ انْطَلِقْ فَانْطَلَقنا. فَأتيْنَا إلَى دَوْحةٍ عظِيمَة لَمْ أَرَ دَوْحةً قطُّ أعظمَ منها، وَلاَ أَحْسنَ، قالا لي:

ارْقَ فِيهَا، فَارتَقينا فِيهَا، إِلَى مدينة مَبْنِيَّة بِلَبِنِ ذَهبٍ ولبنِ فضَّةٍ، فأتَينا بَابَ المَدينة فَاسْتفتَحْنَا، فَفُتحَ لَنا، فَدَخَلناهَا، فَتَلَقَّانَا رجالٌ شَطْرٌ من خَلْقِهم كأَحْسنِ مَا أنت راءٍ، وشَطرٌ منهم كأَقْبح مَا أنت راءٍ، قالا لَهُمْ: اذْهَبُوا فقَعُوا في ذَلِكَ النَّهْر، وَإِذَا هُوَ نَهرٌ معترِضٌ يجْرِي كأنَّ ماءَهُ المحضُ في البَيَاضِ، فذَهبُوا فوقعُوا فِيه، ثُمَّ رجعُوا إِلَيْنَا قَدْ ذَهَب ذلكَ السُّوءُ عَنهمْ، فَصارُوا في أَحْسَنِ صُورةٍ. قَالَ: قالا لِي: هذِهِ جَنَّةُ عدْن، وهذاك منزلُكَ، فسَمَا بصَرِي صُعداً، فإذا قَصرٌ مِثلُ الرَّبابة البيضاءِ. قالا لي: هذاكَ منزِلُكَ. قلتُ لهما: باركَ اللَّه فيكُما، فَذراني فأدخُله. قالا: أمَّا الآنَ فَلاَ، وأنتَ داخلُه.

قُلْتُ لهُما: فَإِنِّي رأَيتُ مُنْذُ اللَّيلة عَجَباً؟ فما هَذَا الذي رأيت؟ قالا لي: إنَا سَنخبرُك. أمَّا الرجُلُ الأَوَّلُ الَّذِي أَتيتَ عَليه يُثلَغُ رأسُهُ بالحجَرِ، فإِنَّهُ الرَّجُلُ يأخُذُ القُرآنَ فيرفُضُه، وينامُ عَنِ الصَّلاةِ المكتُوبة. وأمَّا الرَّجُلُ الَّذِي أَتيتَ عَليهِ يُشرْشرُ شِدْقُه إِلَى قَفاهُ، ومَنْخِرُه إِلَى قَفاهُ، وعَيْنُهُ إِلَى قفاهُ، فإِنَّهُ الرَّجُلُ يَغْدو منْ بَيْتِه فَيكذبُ الكذبَةَ تبلُغُ الآفاقَ. وأمَّا الرِّجالُ والنِّساءُ العُراةُ الَّذِينَ هُمْ في مثل بناءِ التَّنُّور، فإنَّهم الزُّناةُ والزَّواني. وأما الرجُلُ الَّذي أتَيْت عليْه يسْبَحُ في النَهْر، ويلْقمُ الحِجارة، فإِنَّهُ آكِلُ الرِّبا. وأمَّا الرَّجُلُ الكَريهُ المَرآةِ الَّذِي عندَ النَّارِ يَحُشُّها ويسْعى حَوْلَها فإِنَّهُ مالكُ خازنُ جَهنَّمَ. وأمَّا الرَّجُلُ الطَّويلُ الَّذي في الرَّوْضةِ، فإِنَّهُ إبراهيم (ﷺ)، وأمَّا الوِلدانُ الذينَ حوْله، فكلُّ مُوْلود ماتَ عَلَى الفِطْرَةِ وفي رواية البَرْقَاني: وُلِد عَلَى الفِطْرَة. فَقَالَ بعض المسلمينَ: يَا رسولَ اللَّه، وأولادُ المشركينَ؟ فقال رسولُ اللَّه (ﷺ): وأولادُ المشركينَ. وأما القومُ الذينَ كانُوا شَطْرٌ مِنْهُمْ حَسَنٌ وشَطْرٌ مِنْهُمْ قَبيحٌ فإِنَّهُمْ قَومٌ خَلَطُوا عَمَلاً صَالحاً وآخَرَ سَيِّئاً تجاوَزَ الله عنهم[1]»

واتە: پێغەمبەری الله (ﷺ) زۆرجار بەهاوەڵانی دەفەرموو کێتان خەونێکی بینیوە بیگێرێتەوە؛ ڕۆژێکیان بەیانی پێیانی فەرموو: شەوی ڕابردو دوو کەس هاتن بۆلام؛ پێیان وتم بڕۆ؛ منیش لەگەڵیان ڕۆییشتم؛ گەیشتین بە پیاوێك لەسەر کەلەکی درێژکرابوو؛ وە کەسێکی تر لەسەری وەستابوو بەردێکی بەدەستەوە بوو؛ بەردەکەی بەسەر سەری دادەدا و سەری پان دەکردەوە؛ بەردەکە غلۆر دەبوەوە؛ بەدوای بەردەکە دەکەوت و دەیهێنایەوە؛ هەتا

[1] صحيح البخاري (١٣٨٦) (٨٤٥) (١١٤٣)، صحيح مسلم (٢٢٧٥)، سنن الترمذي (٢٢٩٤).

دەگەڕایەوە لای ئەو پیاوە سەری وەك خۆی لێ دەهاتەوە؛ پاشان دوبارە بەردەکەی بەسەر سەریدا دەدایەوە وەکو جاری یەکەم؛ وتم: سبحان الله؛ ئەم دوو پیاوە کێن؟ پێیان وتم: برۆ برۆ؛ ڕۆیشتین هەتا گەیشتین بە پیاوێك لەسەر پشتی ڕاکشابوو وە پیاوێکی تر لەسەری وەستابوو قولابێکی ئاسنی بەدەستەوە بوو؛ لایەکی رومەتی پێ لەت دەکرد هەتا پشتەوەی سەری؛ وە لایەکەی تری پێ لەت دەکرد هەتا دواوەی سەری؛ وە چاوێکی پێ لەت دەکرد هەتا دواوەی سەری؛ پاشان دەچوە لایەکەی تری سەری هەمان کاری دەکرد کە بەلای تری ئەم پیاوەی دەکرد؛ لەملایە تەواو نەدەبوو راستەوخۆ لاکەی تر چاك دەبووەوە بۆ ئەوەی دیسان سزای بداتەوە؛ وتم: سبحان الله ئەم دوو کەسە کێن؟ گوتیان: برۆ برۆ؛ ڕۆیشتین؛ هەتا گەیشتنین بە تەندورێکی ئاگرین دەنگە دەنگی زۆری لێ دەهات؛ کاتێك چوین سەیرمان کرد بینیمان چەند پیاو و ئافرەتێکی ڕوتی تێدابوو؛ کاتێك لەژێرەوە بلێسەی ئاگر دەگەیشت پێیان هاواریان دەکرد بەهۆی ئازاری سوتانیان؛ وتم: ئەوانە کێن؟ پێیان وتم: بڕۆ بڕۆ؛ رۆیشتین هەتا گەیشتین بە ڕوبارێك ڕەنگی وەك خوێن سوربوو؛ بینیم پیاوێك لەناو ئەم ڕوبارە مەلەوانی دەکرد؛ وە پیاوێك لە لێواری ئەم ڕوبارە وەستابوو چەند بەردێکی زۆری کۆکردبووەوە؛ ئەوپیاوەی لەناو ڕوبارەکەبوو چەندجار دەهات بۆلای لێواری ڕوبارەکە بەردێك دەخرایە ناو دەمی و دەرۆیشت و لەناو ڕوبارەکە مەلەوانی دەکردەوە؛ دیسان بەم شێوەیە دەگەڕایەوە و بەردێکی تر دەرایەوە ناو دەمی و سزاددرا؛ وتم: ئەم دوو کەسە کێن؟ پێیان وتم: بڕۆ بڕۆ؛ ڕۆیشتین؛ هەتا گەیشتین بەپیاوێك شێوەی زۆر ناشرین بوو؛ ئاگرێکی کردبووەوە و بەدەوری دەسوڕایەوە و ئاگرەکەی بەردەوام دادەگیرساند؛ وتم: ئەوە کێیە؟ گوتیان: بڕۆ بڕۆ؛ ڕۆیشتین؛ هەتا گەییشتین بە مێرگێکی سەوز و جوان؛ لەناو ئەم مێرگەدا پیاوێکی زۆر بالا بەرز هەبوو نزیك بوو سەری نەبینم ئەوەندە بەرز بوو بەرەو ئاسمان؛ وە لە دەوروبەری ئەم پیاوە چەند منداڵێکی زۆر جوان هەبوو هەرگیز منداڵی ئەوەندە جوانم نەبینیوە؛ وتم: ئەم پیاوە کێیە؟ وە ئەم مندالانە کێن؟ پێیان وتم: بڕۆ بڕۆ؛ ڕۆیشتین هەتا گەیشتین بە درەختێکی زۆر گەورە؛ درەختی ئەوەندە گەورە و جوانم نەبینیەوە؛ گوتیان:

بەسەر ئەم درەختە بەرز بەرەوە؛ بەسەریدا بەرزبوینەوە و گەیشتین بە شارێك خانوەكانی خشتێكی لەزێر بوو وە خشتێكی لەزیوبوو؛ چوین بۆ بەردەم دەرگای شارەكە؛ داوای كردنەوەی دەرگامان كرد؛ دەرگاكە كرایەوە؛ چوینە ناو شارەكە؛ بینیمان پیاوانێك لەناو ئەم شارەبون نیوەی لاشەی زۆر جوان بوو؛ وە نیوەكەی تری زۆر ناشرین بوو؛ ئەم دوكەسە بەم كەسانەیان وت: برۆنە ناو ئەم دەریایە؛ ڕوبارێكی پان و بەرین بوو؛ وە زۆر سپی و ڕون بوو؛ ئەوكاتە رۆیشتن چون بۆ ناو ئەم ڕوبارە؛ پاشان كاتێك گەڕانەوە لامان تەواو جوان ببون و ناشرینیەكەیان نەمابوو؛ پێیان وتم: ئەوە بەهەشتی عەدنە؛ وە ئەوە شوێنی تۆیە؛ چاوم بەرز كردەوە؛ بینیم كۆشكێك بوو وەك هەورێكی سپی دیاربوو؛ پێیان وتم: ئەوە مالی تۆیە؛ وتم پێیان: الله بەرەكەتتان تێ بخات؛ ڕێگەم بدەن بۆ ئەوەی بچمە ناویەوە؛ گوتیان: ئێستا نەخێر؛ وە بێگومان هەردەچیتە ناویەوە؛ پێیانم وت: ئەمشەو شتی زۆر سەرسورهێنەرم بینی؟ ئەو شتانە چی بوو كە بینیم؟ پێیان وتم: ئێمە بۆت باس دەكەین.

ئەو پیاوەی بینیت بەرد بەسەر سەریدا دەدرا؛ ئەوكەسەیە كە قورئانی پیرۆز لەبەر دەكات پاشان بەبێ عوزر لەبیر خۆی دەباتەوە و كردەوەیشی پێ ناكات؛ وە لەكاتی نوێژە فەرزەكان خەوتوە (دوای دەخات). وە ئەو پیاوەی لایەكی رومەتی لەت دەكرا ئەو پیاوەیە كە درۆ دەكات و درۆكانی دەگات بەهەمو شوێنێك؛ وە ئەم پیاو و ئافرەتانەی روت بون لەناو تەندورەكە ئەوكەسانەن كە زیناكار و بەدڕەوشتن؛ وە ئەو پیاوەی لەناو ڕوبارەكە مەلەوانی دەكرد و بەرد دەخرایە ناو دەمی ئەوكەسەیە ڕیبا خۆرە؛ وە ئەو پیاوە ناشرینەی لەدەوری ئاگرێكە و ئاگرەكە خۆش دەكات و دایدەگیرسێنێت ئەوە فریشتە مالیكە سەرپەرشتیاری دۆزەخ؛ وە ئەو پیاوە باڵا بەرزەی لەناو مێرگەكەبوو ئەوە پێغەمبەر ئیبراهیمە (ﷺ)؛ وە ئەو منداڵە جوانانەی لەدەوری بون؛ گشت ئەو منداڵانەن بە بچوكی مردون و بەپاكی و لەسەر ئیسلام مردون؛ هەندێك لەموسڵمانان گوتیان: ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) منداڵی موشریكەكانیشن؟ فەرموی: بەڵی منداڵی موشریكەكانیش؛ وە ئەوكەسانەی نیوەی لاشەیان

زۆر جوان بوو وە نیوەی تریان زۆر ناشرین بوو ئەوکەسانەن کردەوەی چاك و خراپیان هەیە و الله تعالی لێیان دەبورێت.

**پرسێك:** ئایە قەرز و قەرزداری مردو حەبس دەكات لەناو گۆڕدا؟

**وەڵام:** پێغەمبەر (ﷺ) بۆمانی ڕون کردوەتەوە هەرکەسێک قەرزار بێت و لەسەر قەرزاریەکەی بمرێت ئەو کەسە خۆشیەکانی گۆڕ بە تەواوی پێی ناگات و گیانەکەی ناتوانێت بچێتە بەهەشت و بەند دەبێت، وەکو سەعدی کوڕی ئەتوەل دەفەرموێت: «أَنَّ أَخَاهُ مَاتَ وَتَرَكَ ثَلَاثَمَائَةِ دِرْهَمٍ، وَتَرَكَ عِيَالًا، فَأَرَدْتُ أَنْ أُنْفِقَهَا عَلَى عِيَالِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): إِنَّ أَخَاكَ مُحْتَبَسٌ بِدَيْنِهِ، فَاقْضِ عَنْهُ. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ أَدَّيْتُ عَنْهُ، إِلَّا دِينَارَيْنِ ادَّعَتْهُمَا امْرَأَةٌ وَلَيْسَ لَهَا بَيِّنَةٌ. قَالَ: فَأَعْطِهَا؛ فَإِنَّهَا مُحِقَّةٌ[1]» واتە: برایەکی وەفاتی کرد و لەدوای خۆی سێ سەد درهەم، و خاو خێزانێکی بەجێهێشت، جا منیش ویستم پارەکە بدەم بە خاو و خێزانەکەی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: بەڕاستی براکەت بەهۆی قەرزداریەکەیەوە ڕێگری چونە ناو بەهەشتی لێ دەکرێ، بۆیە قەرزەکەی بدەوە، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) قەرزەکەم لەبری دایەوە تەنها دوو دینار نەبێ کە ژنێک داوای دەکات و هیچ شایەدێکیشی نیە، فەرموی: پێی بدە؛ چونکە بەڕاستی شایستە و حەقە.

لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە فەرمویەتی: «إِنَّ صَاحِبَكُمْ مَأْسُورٌ بِدَيْنِهِ[2]» واتە: هاوڕێکەتان یان خزمەکەتان لەبەر ئەوەی کە قەرزارە گیراوە لەوەی کە بچێتە بەهەشتەوە.

زانایان لە تەفسیری ئەو حەدیسە دەفەرمون مردو لەدوای ئەوەی دەمرێ ئەگەر قەرزەکانی لە جیاتی نەدرێتەوە یان گەردنی ئازاد نەکرێ یان پێشتر خۆی نەیدابێتەوە بە قەدەر ئەو مافەی خەڵکی کە لەسەریەتی دەمێنێتەوە و ناتوانێ هەموو خۆشیەکانی بەهەشت ببینێت.

[1] الألباني، إرواء الغليل (١٠٩/٦)، صحيح.

[2] حكم الحديث: حسن، سنن أبي داود (٣٣٤١)، سنن النسائي (٤٦٨٥)، مسند أحمد (٢٠١٢٤) (٢٠١٥٧) (٢٠٢٢٢).

لە فەرمودەیەکی تردا سەمورە دەڵێت: «كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي جِنَازَةٍ، فَقَالَ: أَهَاهُنَا مِنْ بَنِي فُلَانٍ أَحَدٌ؟ ثَلَاثًا، فَقَامَ رَجُلٌ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): مَا مَنَعَكَ فِي الْمَرَّتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ أَنْ لَا تَكُونَ أَجَبْتَنِي؟ أَمَا إِنِّي لَمْ أُنَوِّهْ بِكَ إِلَّا بِخَيْرٍ، إِنَّ فُلَانًا لِرَجُلٍ مِنْهُمْ مَاتَ مَأْسُورًا بِدَيْنِهِ[1]» واتە: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا بوین لە بەڕێکردنی تەرمێکدا، سێ جار فەرموی: ئایە لێرەدا کەسێک هەیە لە نەوەکانی فلانە کەس، پیاوێک هەڵسا، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموی: چی ڕێگری لێ کردی دوو جارەکەی تر وەڵامت نەدامەوە؟ من جگە لە خێر هیچت بۆ باس ناکەم؛ فلانە کەس مردوە دیلی قەرزی کەسێکە لە ئەوانە کە بەسەریەوەیەتی، (واتە ڕێگری بەهەشتی لێ کراوە).

**پرسێك:** ئایە گریان و لەخۆدانی ماڵ و منداڵی مردو زیان بە مردو دەگەیەنێت لەناو گۆڕدا؟

**وەڵام:** پێشەوا قورتوبی لە (التذكرة) هێناویەتی دەفەرموێ: کۆمەڵێک لە زانایان لەوانە: (إبن عبدالبر، بوخاری...هتد) بۆچونیان وایە مردوەکان بە گریانی ماڵ و منداڵ و خزم و کەس و کاریان لە دوای مردنیان ناخۆشی و عەزاب دەبینن لەناو گۆڕدا، لەبەر ئەو فەرمودە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «إِنَّ الْمَيِّتَ يُعَذَّبُ بِبَعْضِ بُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ[2]» واتە: مردو سزا دەدرێت بە هەندێ گریانی کەس وکاری بۆی.

بەڵام دایکە عائیشە ئینکاری ئەوەی کردوە و ئیبنو عەباس -رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا- دەڵێت: «فَلَمَّا مَاتَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَائِشَةَ -رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا- فَقَالَتْ: رَحِمَ اللَّهُ عُمَرَ، وَاللَّهِ مَا حَدَّثَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): إِنَّ اللَّهَ لَيُعَذِّبُ الْمُؤْمِنَ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ، وَلَكِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ لَيَزِيدُ الْكَافِرَ عَذَابًا بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ. وَقَالَتْ: حَسْبُكُمُ الْقُرْآنُ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ [الأنعام: ١٦٤][3]» واتە: کاتێ عومەر -رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ- وەفاتی کرد ئەو فەرمودەیەم بۆ عائیشە -رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا- باسکرد ئەویش گوتی: ڕەحمەتی الله لە عومەر بێت بە الله پێغەمبەر (ﷺ)

[1] حكم الحديث: صحيح، سنن النسائي (٤٦٨٥)، سنن أبي داود (٣٣٤١)، مسند أحمد (٢٠١٢٤) (٢٠١٥٧) (٢٠٢٢٢).

[2] صحيح البخاري (١٢٨٦) (١٢٩٠) (١٢٩٢)، صحيح مسلم (٩٢٧) (٩٢٨) (٩٣٠)، سنن أبي داود (٣١٢٩).

[3] صحيح البخاري (١٢٨٦) (١٢٩٠) (١٢٩٢)، صحيح مسلم (٩٢٧) (٩٢٨) (٩٣٠)، سنن أبي داود (٣١٢٩).

نه‌یفه‌رموه‌ كه‌ الله‌ سزای مردو ئه‌دات به‌ گریانی كه‌س و كاری له‌سه‌ری، به‌ڵكو پێغه‌مبه‌ری الله‌ (ﷺ) فه‌رمویه‌تی: الله‌ سزای كافر زیاتر ئه‌كات به‌ گریانی كه‌س و كاری له‌سه‌ری. هه‌روه‌ها عائیشه‌ -رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا- گوتی: له‌م ڕووه‌وه‌ قورئانتان به‌سه‌ كه‌ ده‌فه‌رموێت: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ [الأنعام: ٦٤] واته‌: هیچ كه‌سێك باری گوناحی هیچ كه‌سێكی تر هه‌ڵناگرێت.

جا زانایان هه‌ستاون ئه‌و شته‌یان لێكداوه‌ته‌وه‌ ئایه‌ دایكه‌ عائیشه‌ بۆچی وای گوتوه‌ و كامه‌ بۆچون ڕاسته‌، له‌وانه‌ إبن تیمیة -رحمه الله- فه‌رمویه‌تی: یه‌كه‌م جار پێویسته‌ ئێمه‌ جیاوازی بخه‌ینه‌ نێوان عوقوبه‌ و تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه‌ له‌گه‌ڵ عه‌زاب و ناخۆشی و ئازار، ئه‌وه‌ی له‌ فه‌رموده‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) هاتوه‌ له‌ ناو گۆڕدا كه‌ عه‌زاب ده‌درێت عه‌زاب له‌گه‌ڵ تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه‌ جیاوازه‌، تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه‌ ئیلا له‌سه‌ر گوناحه‌كان كه‌ به‌ ده‌ستی خۆت یان به‌ قسه‌ی خۆت له‌ دونیادا ئه‌نجامت داوه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ تۆڵه‌ت لێ ده‌ستێندرێته‌وه‌ و عوقوبه‌ ده‌درێی به‌ڵام ئازار و عه‌زاب هه‌ندێك جار به‌بێ ده‌ستی خۆته‌ و تۆش ئه‌نجامت نه‌داوه‌ هه‌ر له‌ دونیادا به‌بێ ده‌ستی تۆ كه‌سێك به‌پێش ده‌رگاتدا دێت هاوارێكی گه‌وره‌ ده‌كات یان ده‌نگێكی ناخۆشی لێوه‌ دێت تۆ له‌ شوێنی خۆتدا ئازاری پێ ده‌خۆیت و زه‌حمه‌تی پێوه‌ ده‌بینی به‌ ده‌ستی تۆ نیه‌ و تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه‌ش نیه‌، ئه‌و عه‌زابه‌ی له‌ناو گۆڕدا به‌ مردو ده‌گات به‌هۆی گریانی خزم و كه‌س و ئه‌هله‌كه‌ی ئه‌و بابه‌ته‌ ئازار و عه‌زابه‌یه‌ نه‌ك عوقوبه‌ و تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه‌، ئه‌و ڕه‌تكردنه‌وه‌ی دایكه‌ عائیشه‌ش مه‌رج نیه‌ بیستبێتی یان وه‌ربگیرێت هه‌روه‌كو له‌ سه‌حیحی بوخاری هاتوه‌ به‌ڵام ئه‌وه‌ش له‌ سه‌حیحی بوخاری هاتوه‌ مه‌رج نیه‌ ئێمه‌ سه‌دا سه‌د جێگیری بكه‌ین[١].

ئیمامی بوخاری وه‌ڵامی ئه‌وه‌ی داوه‌ته‌وه‌ كه‌ چۆن ده‌بێت عه‌زابی كه‌سێك بدرێت به‌ كار و كرده‌وه‌ی خۆشی نه‌بێت و ده‌ستی خۆشی تێدا نه‌بێت ئه‌ویش له‌ سه‌حیحه‌كه‌ی خۆی

[١] مجموع الفتاوى: (٣٧١/٢٤).

دەفەرموێت: ئەگەر بێت و مردوەکە شوێنی بەو شێوەیە بوو خۆی ئەو کاتەی کە زیندو بوو بە هاوار هاوار و شین و واوەیلا ڕازیبوو بۆ خۆی و مردوەکانی خزم و کەسی بکرێ وەسیەتی نەکرد و قەدەغەی نەکرد پەروەردەی نەکردن ئەگەر واز بێنن لەسەر ئەو شتە، ئەگەر مردو لەناویان دەرچو لەو حاڵەتەدا گوناحی دەکەوێتە ئەستۆ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی «كُلُّكُمْ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ» واتە: هەمووتان شوان و چاودێرن وە هەمووتان بەرپرسن و لێپێچینەوەتان لەگەڵ دەکرێت دەربارەی چاودێری و سەرپشتیاریەکە. با ماڵ و منداڵی خۆی وا پەروەردە کردبا و لێ ڕاهێنابا ئەو شتە گوناح و تاوانانەیان ئەنجام نەدابوایە یان الله تعالی دەفەرموێ: ﴿قُوا أَنفُسَكُم وَأَهلِيكُم نَارا﴾ [التحريم: ٦] واتە: خۆتان و کەس و کارتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سووتەمەنیەکەی ئادەمی و بەردە. دەبوایە وەسێتی بۆ کردبان و ئەگەر من مردم یان هەر کەسێک مرد لە خزم و کەسە نزیکەکانمان قبوڵ نیە و قبوڵی ناکەین نابێ شین بکەن و لە خۆتان بدەن گریانێکی وا بکەن کە الله تعالی توڕە بکات(١).

**پرسێك:** ئایە گریان بەچاو دروستە یاخود دروست نیە؟

**وەڵام:** بەڵێ، زانایان هەر هەمویان یەک دەنگن لەسەر ئەوەی ئەگەر شین و واوەیلا نەبوو هاوار هاوار نەبوو یەخە دادڕین نەبوو و جل و بەرگ دڕاندن نەبوو قوڕ پێوان نەبوو ئەگەر تەنها بە چاو گریان بوو و سوپاس و ستایشی الله دەکرا لەسەر ئەو موسیبەتەی کە بە سەری هێناون ئەوە کەسەکە گوناحبار نابێت کە دەگریەت بەڵکو ئەوە سونەتیشە و لە ڕەحم و بەزەییە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لێی هاتوە کوڕە بچوکەکەی خۆی ئیبراهیم کە لە ماریەی قبیتی بوو کاتێک لە سەرە مەرگ بوە فەرمویەتی: «إِنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ، وَالْقَلْبَ يَحْزَنُ، وَلَا نَقُولُ إِلَّا مَا يَرْضَى رَبُّنَا، وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ(٢)» واتە: بەڕاستی چاو فرمێسک دەڕژێنێت، و دڵ خەمبار دەبێت، و ئەوەش دەڵێین کە پەروەردگارمان پێی ڕازیە، بەڕاستی ئەی ئیبراهیم ئێمە بە کۆچی تۆ خەمبارین.

(١) بَابُ قَوْلِ النَّبِيِّ (ﷺ): يُعَذَّبُ الْمَيِّتُ بِبَعْضِ بُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ.

(٢) صحيح البخاري (١٣٠٣)، صحيح مسلم (٢٣١٥)، سنن أبي داود (٣١٢٦)، مسند أحمد (١٣٠١٤).

ئیمامی عومەری کوڕی خەتاب کاتێک کاتێک لێی درابوو لەسەر جێگا کەوتبوو لە حاڵەت و کاتی سەرەمەرگدا بوە کاتێک سوهەیب دەچێتە سەری لە هاڕژنی گریان دەدات و فەرمویەتی: (وَا أَخَاهُ وَا صَاحِبَاهُ، فَقَالَ عُمَرُ -رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ-: يَا صُهَيْبُ، أَتَبْكِي عَلَيَّ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): إِنَّ المَيِّتَ يُعَذَّبُ بِبَعْضِ بُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ[1]) واتە: ئەی براکەم ئەی دۆست و هاوەڵەکەم، عومەری کوڕی خەتاب -رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ- پێی دەفەرموێ: ئەی سوهەیب، تۆ لەسەر من دەگریت و هات و هاوار دەکەیت، لە کاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: مردو سزا دەدرێت بە هەندێ گریانی کەس وکاری بۆی.

إبن تيمية -رحمه الله- دەفەرموێ: هەندێک جار ئەو ئازار و ناخۆشیە مردوەکە نایبینێت بەهۆی گریان و شین و وا وەیلای خزم و کەسەکانی، لەبەر ئەوەی هەندێک سەبەب و هۆکار هەن ئەو ئازارەی لەسەر لا دەبەن، هەندێک جار تەوبەیەکی ڕاستەقینەی کردوە کەسەکە هەر لە سەرە مەرگ پێش ئەوەی گیانی بکێشرێ کردەوەی زۆر چاکی هەبوە ئەو گوناحەی لەسەر ڕەش دەکاتەوە، ئەگەر وەسیەتیشی نەکردبێ بەڵاو موسیبەتەکان هەروەکو گوناحەکان هەڵدەوەرێن لە کەسی ئیماندار کە سوپاسی اللهی لەسەر بکات یان تکا و شەفاعەتی تکا کاران کە لەلای الله شەفاعەتەکەیان وەرگیراو بێت بۆی بپارێنەوە و بڵێن یا الله لێی خۆش ببە و ئازاری مەدە ئەگەر شین و وا وەیلایان بۆ کردبێ ڕەنگە الله بە فەزڵ و بەخششی خۆی ڕەحمی پێ بکات و لێی خۆش بێت[2].

## ئەو خاڵانەی دەبنە مایەی ڕزگاربونی مردو لە ناخۆشی و ئازارەکانی ناو گۆڕ:

بابێین هەندێک لەو خاڵانە باس بکەین تاوەکو کار لە کار نەترازاوە و ژیانمان لەدەست دەرنەچوە و مردنمان پێ نەگەشتوە، قۆڵ و باسک هەڵماڵن لەو بابەتانەی کە ئێستا باسی لێوە دەکەین کە لە فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوە ئەگەر لە ژیانی دونیا ئەنجامت دابێت

[1] كتاب التوشيح شرح الجامع الصحيح [الجلال السيوطي] ج ٣ ص ١٠٧٤.
[2] مجموع الفتاوى: (٣٧٥/٤).

دەبنە پاسەوان بۆت لەناو گۆڕدا، ناهێڵن پرسیارەکان وەکو ئازار و ئەشکەنجە لێت بکرێت لەلایەن فریشتەکان وە ناهێڵن ئازەر و عەزابی گۆڕ بتگرێتەوە.

١.تەوبە: تەوبە هەموو تاوانێک ڕەش دەکاتەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «التَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ، كَمَنْ لَا ذَنْبَ لَهُ[١]» واتە؛ کەسی تەوبەکار لە تاوان، وەک وایە تاوانی ئەنجام نەدابێت.

ابن قيم الجوزية ئەو زانا بەڕێزە ڕێگامان پیشان دەدات دەفەرموێ: کورترین ڕێگا بۆ ڕزگاربونی هەر یەکێک لە موسڵمانان لە عەزاب و ناخۆشیەکانی ناو گۆڕ تەوبە کردن و موحاسەبە کردنی خۆتە.

هەر کەس و موسڵمانێک ئەگەر شەوی بەسەردا هات کاتێک دەیەوێت بخەوێت تەنها بۆ الله یەک کاتژمێر لە خۆی بپرسێتەوە و موحاسەبەی خۆی بکات لەوەی لەو ڕۆژەدا زەرەرمەند بوە یاخود سودی پێگەشتوە، پاشان لە نێوان خۆی و الله تعالى تەوبەی نەسوح نوێ بکاتەوە، جا لەسەر ئەو تەوبەیە بخەوێت.

ئیمانی پتەو و خۆڕاگر بێت ئەگەر لەخەو هەڵسا نەگەڕێتەوە سەر ئەو تاوانەی کردویەتی، و هەموو شەوێ ئەم کارە بکات، جا ئەگەر لەسەر ئەو تەوبەیە شەوەکەی مرد ئەوە لەسەر تەوبە دەمرێت.

ئەگەر لە خەویش هەستا ئەوە بە کار و کردەوەی چاک بۆ دواڕۆژەکەی کار دەکات دڵخۆشە بەوەی کە ئەجەلەکەی دوا کەوت تاوەکو پێشوازی لە پەروەردگاری خۆی بکات و ئەوەی لە دەستی داوە بیگەڕێنێتەوە[٢].

---

[١] حكم الحديث: حسن، سنن ابن ماجه (٤٢٥٠).

[٢] كتاب الروح، ص: ٢٣١.

٢.پاراستنی دامێن و زمان: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «مَنْ يَضْمَنْ لِي مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ، وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ أَضْمَنْ لَهُ الْجَنَّةَ[١]» واتە: هەر کەس زەمانەتی نێوان دوو شەویلگەی (واتە دەمی) و نێوان دوو ڕانیم بۆ بکات (واتە دامێنی گوناحی پێ نەکات) زەمانەتی بەهەشتی بۆ دەکەم.

سەرنج بدەن إبن تيمية دەفەرموێ: (وَفِي الْحَدِيثِ الْمَشْهُورِ حَدِيث محمد بْن عَمْرٍو عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) رَوَاهُ أَبوو حَاتِمٍ فِي صَحِيحِهِ وَقَدْ رَوَاهُ أَيْضًا الْأَئِمَّةُ. قَالَ: إنَّ الْمَيِّتَ لَيَسْمَعُ خَفْقَ نِعَالِهِمْ حِينَ يُوَلُّونَ عَنْهُ. فَإِنْ كَانَ مُؤْمِنًا كَانَتْ الصَّلَاةُ عِنْدَ رَأْسِهِ وَكَانَ الصِّيَامُ عَنْ يَمِينِهِ وَكَانَتْ الزَّكَاةُ عَنْ يَسَارِهِ وَكَانَ فِعْلُ الْخَيْرَاتِ مِنْ الصَّدَقَةِ وَالصِّلَةِ وَالْمَعْرُوفِ وَالْإِحْسَانِ إلَى النَّاسِ عِنْدَ رِجْلَيْهِ. فَيُؤْتَى مِنْ عِنْدِ رَأْسِهِ فَتَقُولُ الصَّلَاةُ: مَا قِبَلِي مَدْخَلٌ ثُمَّ يُؤْتَى عَنْ يَمِينِهِ فَيَقُولُ الصِّيَامُ: مَا قِبَلِي مَدْخَلٌ ثُمَّ يُؤْتَى عَنْ يَسَارِهِ فَتَقُولُ الزَّكَاةُ: مَا قِبَلِي مَدْخَلٌ ثُمَّ يُؤْتَى مِنْ قِبَلِ رِجْلَيْهِ فَيَقُولُ فِعْلُ الْخَيْرَاتِ مِنْ الصَّدَقَةِ وَالصِّلَةِ وَالْمَعْرُوفِ وَالْإِحْسَانِ إلَى النَّاسِ: مَا قِبَلِي مَدْخَلٌ.فَيُقَالُ لَهُ: اجْلِسْ فَيَجْلِسُ قَدْ مُثِّلَتْ لَهُ الشَّمْسُ وَقَدْ دَنَتْ لِلْغُرُوبِ فَيُقَالُ لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي كَانَ فِيكُمْ مَا تَقُولُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: دَعُونِي حَتَّى أُصَلِّيَ؛ فَيَقُولُونَ: إنَّك سَتَفْعَلُ أَخْبِرْنَا عَمَّا نَسْأَلُك عَنْهُ. فَقَالَ: عَمَّ تَسْأَلُونِي؟ فَيَقُولُونَ: مَا تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي كَانَ فِيكُمْ؛ مَا تَشْهَدُ عَلَيْهِ بِهِ؟ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ وَأَنَّهُ جَاءَ بِالْحَقِّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ؛ فَيُقَالُ: عَلَى ذَلِكَ حَيِيت وَعَلَى ذَلِكَ مُتّ وَعَلَى ذَلِكَ تُبْعَثُ إنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى ثُمَّ يُفْتَحُ لَهُ بَابًا مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ فَيُقَالُ لَهُ: ذَلِكَ مَقْعَدُك مِنْهَا وَمَا أَعَدَّ اللَّهُ لَك فِيهَا؛ فَيَزْدَادُ غِبْطَةً وَسُرُورًا ثُمَّ يُفْتَحُ لَهُ بَابٌ مِنْ أَبْوَابِ النَّارِ فَيُقَالُ لَهُ ذَلِكَ مَقْعَدُك مِنْهَا وَمَا أَعَدَّ اللَّهُ لَك فِيهَا لَوْ عَصَيْت رَبَّك فَيَزْدَادُ غِبْطَةً وَسُرُورًا؛ ثُمَّ يُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ سَبْعُونَ ذِرَاعًا وَيُنَوَّرُ لَهُ فِيهِ. وَيُعَادُ جَسَدُهُ كَمَا بُدِئَ وَتُجْعَلُ نَسَمَتُهُ فِي نَسَمِ الطَّيِّبِ وَهِيَ طَيْرٌ تَعْلُقُ فِي شَجَرِ الْجَنَّةِ. وَفِي لَفْظٍ: وَهُوَ فِي طَيْرٍ يَعْلُقُ فِي شَجَرِ الْجَنَّةِ قَالَ أَبوو هُرَيْرَةَ: قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدونيا وَفِي

[١] صحيح البخاري (٦٤٧٤) (٦٨٠٧)، سنن الترمذي (٢٤٠٨)، مسند أحمد (٢٢٨٢٣).

الْآخِرَةِ﴾ [إبراهيم: ٢٧] وَفِي لَفْظٍ ثُمَّ يُعَادُ الْجَسَدُ إِلَى مَا بُدِئَ مِنْهُ[1]) واتە: لەو فەرمودە بەناو بانگەی موحەممەد بْنِ عَمْرٍو لە أَبِي سَلَمَةَ لە أَبِي هُرَيْرَةَ لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەبو حاتم لە سەحیحەکەی هێناویەتی و کۆمەڵیکی تر لە فەرمودە ناسان هێناویانە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: کاتێک جەنازە کە دەیشارنەوە ئەوانەی لەگەڵی دەچنە سەر قەبران و خزم و کەس و کاری کاتێک پشتی تێدەکەن و دەیانەوێ بگەڕێنەوە بەرەو ماڵ گوێبیستی خشەخشی نەعلەکانیان دەبێت ئەوان وا دەڕۆن و بەجێی دەهێڵن. ئەگەر مردوەکە ئیماندار بێ نوێژ دێتە سەر سەری و لەسەری ڕادەوەستێ و دەبێتە حیمایەی ڕۆژو دێتە لای ڕاستەی و پاسەوانی لێ دەکات زەکاتدانیش دێتە لای چەپەی دەبێتە پاسەوانی کار و کردەوە چاکەکانی تر لە خێر و چاکە کە کردویەتی ڕاستگۆیی سیلەی ڕەحم کە جێ بەجێی کردوە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە چاکە کردن بە زمان و دەست لەگەڵ خەڵکی لە بەخشین ئەوانەش دێنە بەر پێی و لەبەر پێی حیمایەی دەکەن فریشتەکانیش لەلای سەریەوە دەیانەوێ بێن بۆی پرسیاری لێ بکەن نوێژ دەڵێ: نەخێر من پاسەوانی ئەو کەسەم ئەی فریشتەکان لەلای منەوە ڕێگا نیە لێی نزیک بنەوە پاشان لای ڕاستەوە فریشتەکان دێن ڕۆژو گرتنیش دەڵێ: نەخێر لە لای منیشەوە ڕێگا نیە من پاسەوانی ئەو کەسەم چونکە منی لە پێناو الله گرتوە پاشان فریشتەکان دێنە لای چەپەی زەکاتدانیش دەڵێ: لای منیشەوە ڕێگا نیە من پاسەوانی ئەو کەسەم پاشان لەبەر پێیەوە دێن کار و کردەوە چاکەکانی تر لە سیلەی ڕەحم و فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە و چاکە کردن لەگەڵ خەڵکی دەڵێ: ئێمەش پاسەوانی لای پێیەکانین قبوڵمان نیە لای ئێمە بێن و ڕێگا نیە بچنە سەری. فریشتەکان دور بە دور دەمێنێنەوە دەڵێن: باشە هەستەوە و دانیشە دادەنیشێنرێ ئەو کاتە خۆر دەهێنرێت و پێی نیشان دەدرێ وەکو ئەو کاتەی کە لەسەر خۆر ئاوابونە پێی نیشان دەدرێ پێی دەڵێن: ئەو پیاوەی لەناوتاندا بوو لە ئێوە بوو کێ بوو چی دەڵێی لەسەری؟ دەڵێ: لێم گەڕێن تاوەکو دوو ڕکات نوێژ بکەم؛ گوتیان: تۆ دەیکەی بەڵام وەڵامان بدەرەوە لەسەر ئەوەی پرسیارمان لێ کردی. پێیان دەڵێ:

[1] مجموع الفتاوى [ابن تيمية] ج: ٥ ص: ٤٤٨.

دەربارەی چی پرسیارم لێ دەکەن؟ دەڵێن: چی دەڵێی لەسەر ئەو پیاوەی بۆلای ئێوە هاتبو؛ شاهێدی چی بۆ دەدەی؟ دەڵێ: من شایەتی دەدەم ئەوە ڕەوانەکراوی اللەیە شاهێدیش دەدەم حەق و ڕاستی بۆ هێنا بوین لەلای الله؛ پێی دەڵێت تۆ لەسەر ئەوە ژیای لەسەر ئەوەش مردی لەسەر ئەوەش زیندو دەکرێیتەوە ئەگەر الله ویستی لەسەر بێت پاشان دەرگایەک لە دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە پێی دەڵێن: ئەوە شوێنی تۆیە لە بەهەشتدا الله بۆی ئامادە کردوی لە بەهەشت پێت ببەخشێت؛ ئەو کەسە مردوە ئەو کات ئاگای لە دونیا و ناخۆشیەکان نامێنێ دڵی زۆر خۆش دەبێت بەڵام دەرگایەکی دۆزەخیشی بۆ دەکرێتەوە دەڵێن ئەوە شوێنت بوو لە دۆزەخدا ئەگەر سەرپێچی فەرمانەکانی اللەت بکردبا لە پاشان خۆشیەکەی زیاد دەکات کە ناخۆشی جەهەنەم دەبینێ دەڵێ سوپاس بۆ الله من نەچومە ئێرە و ئەو خۆشیەم بۆ هەیە؛ پاشان قەبری بۆ فراوان دەبێت حەفتا باڵ بە حەفتا باڵ ناو گۆڕەکەی بۆ ڕوناک دەکرێتەوە جا گیانەکەی دادەنێن لەناو قەپێلکی تەیرێک ئەو کات دەڕوا بەرەو بەهەشتەکان لە خواردن و درەختەکانی بەهەشت دەخوا گیانەکەی چۆن لەناو ئەو جەستەیە بوە سەرەتا بەو شێوەیە دەگەڕێتەوە ناو ئەو جەستەیە، لە ڕیوایەتێکی تر دەڵێ: پاشان ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدونيا وَفِي الْآخِرَةِ﴾ [إبراهيم: ٢٧] لە ڕیوایەتێکی تریش دەفەرموێ: پاشان گیانەکەی چۆن لەناو ئەو جەستەیە بوە سەرەتا بەو شێوەیە دەگەڕێتەوە ناو ئەو جەستەیە.

## ترسناکی و ناخۆشی ئازاری گۆڕ وایکردوە پێغەمبەر (ﷺ) و موسڵمانان خۆیان پەنا بدەن لێی:

پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) لە فەرمودەی سەحیحدا جێگیر بوە کە خۆی پەنا داوە لە عەزاب و ئازاری گۆڕ، ئەوەتا دایکە عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: «دَخَلَتْ عَلَيَّ عَجُوزَانِ مِنْ عُجُزِ يَهُودِ الْمَدِينَةِ، فَقَالَتَا: إِنَّ أَهْلَ الْقُبُورِ يُعَذَّبُونَ فِي قُبُورِهِمْ. قَالَتْ: فَكَذَّبْتُهُمَا، وَلَمْ أُنْعِمْ أَنْ أُصَدِّقَهُمَا، فَخَرَجَتَا، وَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ). فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ عَجُوزَيْنِ مِنْ عُجُزِ يَهُودِ الْمَدِينَةِ دَخَلَتَا عَلَيَّ، فَزَعَمَتَا أَنَّ أَهْلَ الْقُبُورِ يُعَذَّبُونَ فِي قُبُورِهِمْ. فَقَالَ: صَدَقَتَا، إِنَّهُمْ يُعَذَّبُونَ

عَذَابًا تَسْمَعُهُ الْبَهَائِمُ. قَالَتْ: فَمَا رَأَيْتُهُ بَعْدُ فِي صَلَاةٍ إِلَّا يَتَعَوَّذُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ[1]» واتە: دوو پیرەژن لە پیرەژنەکانی جولەکەی مەدینە هاتن بۆلام، گوتیان: بەڕاستی ئەوانەی لە گۆڕستانن سزا دەدرێن لەناو گۆڕەکانیان. دەڵێت: بە درۆیانم دانا و نەمتوانی بڕوایان پێ بکەم، ئەوان ڕۆیشتن پێغەمبەری الله (ﷺ) هات بۆلام، وتم: ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ)، دوو پیرەژن لە پیرەژنەکانی مەدینە گوتیان: ئەوانەی لە گۆڕستانن سزا دەدرێن لەناو گۆڕەکانیان، فەرمووی: ڕاستیان کرد ئەوانە، بە جۆرێک سزا دەدرێن تەنانەت هەموو ئاژەڵەکانیش دەیبیستن، عائیشە دەڵێت: پاشان نەمبینی نوێژێک بکات ئیلا پەنای دەگرت بە الله لە سزای ناو گۆڕ.

ئەنەسی کوڕی مالیکیش بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێت پێغەمبەر (ﷺ) لە دۆعاکانی دەیفەرموو «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْهَرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ[2]» واتە: یا الله من پەنات پێ دەگرم لە بێتوانایی و تەمبەڵی، و ڕەزیلی و ترسنۆکی، و پیری و پەکەوتەیی، وە لە سزای ناو گۆڕ، وە لە فیتنەی ژیان و مردن.

دوبارە دایکە عائیشە دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ، وَالْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْقَبْرِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ[3]» واتە: یا الله پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی و پیری و پەکەوتەیی، و تاوان و قەرزاریی، و لە فیتنەی ناو گۆڕ، و لە سزای ناو گۆڕ.

[1] صحيح مسلم (٥٨٦)، صحيح البخاري (٦٣٦٦)، سنن النسائي (٢٠٦٦) (٢٠٦٧).

[2] صحيح البخاري (٢٨٢٣) (٢٨٩٣) (٤٧٠٧)، صحيح مسلم (٢٧٠٦)، سنن أبي داود (١٥٤٠) (٣٩٧٢).

[3] صحيح البخاري (٦٣٦٨) (٢٣٩٧) (٦٣٧٥)، صحيح مسلم (٥٨٩)، سنن أبي داود (٨٨٠) (١٥٤٣).

لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە فەرمویەتی: «أَيُّهَا النَّاسُ، اسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، فَإِنَّ عَذَابَ الْقَبْرِ حَقٌّ[1]» واتە: ئەی خەڵکینە، خۆتان پەنا بدەن بە سزای ناو گۆڕ، چونکە سزای ناو گۆڕ ڕاستە.

لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە فەرمویەتی: «استعيذوا باللهِ من جهنمَ استعيذوا باللهِ من عذابِ القبرِ استعيذوا باللهِ من فتنةِ المسيحِ الدجالِ استعيذوا باللهِ من فتنةِ المحيا والمماتِ[2]» واتە: خۆتان بە الله پەنا بدەن لە جەهەنەم خۆتان بە الله پەنا بدەن لە سزای و ناو گۆڕ خۆتان بە الله پەنا بدەن لە فیتنەی مەسیحی دەجال خۆتان بە الله پەنا بدەن لە فیتنەی ژیان و مردن.

**پرسێك:** ئایە ئازار و عەزابی گۆڕ بۆ لاشە و گیانە یان هەر بۆ یەکێکیانە؟

**وەڵام:** زانایان ئیختیلاف و جیاوازیان لە نێواندا دروست بوە بەڵام بۆچونی دروست ئەوەیە کە ئازار و ناخۆشیەکانی ناو گۆڕ بۆ لاشەی ئینسانیشە لەگەڵ گیانەکەی بە یەکەوە وانەبێت تەنها بۆ یەکێکیان بێت، ئەوەتا ابن قيم الجوزية دەفەرموێ: (أَن مَذْهَب سلف الْأمة وأئمتها أَن الْمَيِّت إِذا مَاتَ يكون فِي نعيم أَو عَذَاب وَأَن ذَلِك يحصل لروحه وبدنه، وَأَن الرّوح تبقى بعد مُفَارقَة الْبدن منعمة أَو معذبة، وَأَنَّهَا تتصل بِالْبدنِ أَحْيَانًا، وَيحصل لَهُ مَعهَا النَّعيم أَو الْعَذَاب، ثمَّ إِذا كَانَ يَوْم الْقِيَامَة الْكُبْرَى أُعِيدَت الْأَرْوَاح إِلَى الأجساد، وَقَامُوا من قُبُورهم لرب الْعَالمين، ومعاد الْأَبدَان مُتَّفق عَلَيْهِ بَين الْمُسلمين وَالْيَهُود وَالنَّصَارَى فصل وَنحن نثبت مَا ذَكرْنَاهُ فَأَما أَحَادِيث عَذَاب الْقَبْر[3]) واتە: بزانن ڕێڕەوی پێشینانی ئومەتی ئیسلام و پێشەوا و زاناکان ئەوەیە و لەسەر ئەوە ڕۆشتون کە مردو دوای ئەوەی دەمرێت یان دەکەوێتە خۆشی یان ئازار دەدرێ جا ئەو (ئازارە یان خۆشیە) هەم بۆ گیانێتی هەم بۆ لاشەیەتی، گیانەکە لەدوای ئەوەی دەکێشرێ و دەردەهێنرێت لە لاشەی یان دەکەوێتە بەر سزای الله یان دەکەوێتە ناو

[1] حكم الحديث: إسناده صحيح على شرط الشيخين، مسند أحمد (٢٤٥٢٠) (٢٥٤١٩)، صحيح البخاري (١٠٤٩) (١٠٥٥) (١٣٧٢)، سنن النسائي (١٣٠٨).

[2] سنن الترمذي (٤٠٦٣)، صحيح البخاري (١٣٧٧)، صحيح مسلم (٥٨٨).

[3] كتاب الروح، ص: ٥٢.

ناخۆشیەکان، هەندێک جار دێتەوە ناو لاشەی لەناو گۆڕەکەی هەندێک جاریش لاشەی جێدەهێڵێت و دەچێتە ئاسمانەکان و دەچێتە بەهەشت، جا خۆشی و ناخۆشیەکان بۆ لاشە و گیانەکەش دەبێت کاتێک دەگەنەوە یەکتر، بەڵام کە ڕۆژی قیامەت بەرپا بوو گیانەکان بەبەر لاشەکان دەهێنرێنەوە، دێنەوە ناو قەبرەکان لەوێدا لەگەڵ لاشەکان الله فەرمان دەکات زیندو ببنەوە و هەڵبستنەوە و بچنە مەیدانی حەشر و حیساب، یەکدەنگی موسڵمانان و جولەکە و دیانەکانیشی لەسەرە کە مرۆڤ زیندو دەبێتەوە گیانی بەبەر دێتەوە بۆ مەیدانی حەشر و حیساب.

## تەواوی بۆچونی تاقم و کۆمەڵەکان لەسەری:

١.ئەهلی سونە و جەماعە: ئەوە باسمان کرد.

٢.هەندێک لە ئەهلی کەلام و موعتەزیلەکان و جگە لەوانیش: نکۆڵی لەوە دەکەن دەڵێن نەسزای گۆڕ هەیە نەخۆشی لە قەبر هەیە (لە ژیانی بەرزەخ)، دەڵێن بەڵکو ڕۆحەکە تەواو جیا دەبێتەوە لەلاشە هەتا قیامەتی لێ دادێت نەخۆشیە نەناخۆشیە، بەڵام ئەو بۆچونەیان بۆچونێکی زۆر لاوازە و ئەهلی سونە و جەماعە ڕەتیان کردوەتەوە.

٣.ئەهلی فەلسەفە: دەڵێن خۆشی و ناخۆشیەکان بۆ گیانە لەدوای مردن ئەوە نەبێت بۆ لاشە و جەستەی بێت، ئیبنو حەزمیش لە ئەهلی سونە بەگەڵ ئەوان کەوتوە و جیابوەتەوە و ئیبنو مەیسەرەش بەهەمان شێوە، بەڵام بۆچونەکەیان هەڵەیە و ئەهلی سونە و جەماعە ڕەتیان کردوەتەوە.

٤.هەندێک لە زانایانی ئەهلی کەلام: دەڵێن تەنها لاشەکە سزا دەدرێت یان خۆشی پێ دەگات، زانایان و فەرمودە ناسانی ئەهلی حەدیسیش ئیمامی زاعونی ئەو بۆچونەی هەیە، ئەوەشیان یەکجار زەعیفە و ئیشی پێ ناکرێت لەلای زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە.

**پرسێك:** ئایە مرۆڤی مردو گوێبیستی زیندوان دەبێ و ئاگای لە ژیانی دونیایە لەدوای مردن؟

**وەڵام:** ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونیان وایە لەوانە (إبن تيمية، کۆمەڵێکی تر لە زانایان) دەڵێن هەموو دەمێک و سەدا سەد بە بەردەوامی مردو ئاگای لە دونیا نیە وە هەموو کاتێک قسە و شتەکانی دونیا نابیستێت بە بەردەوامی، جار و بارێکە الله تعالى ئەو مۆڵەتەی پێ دەدات ڕەنگە دەنگەکانی دونیا ببیستێت و شتەکان هەست پێ بکات بەڵام زۆربەی هەرە زۆری جارەکان هەستی پێ نەکردوە و هەستی پێ ناکات.

**پرسێك:** ئایە گیانەکان یەکتریش دەبینن ئەوانەی هی ئیماندارانن؟

**وەڵام:** لەسەر ئەوەش کۆمەڵێک لە زانایان دەفەرمون یەکتر دەبینن و هەندێکی تریشیان دەفەرمون مەگەر لە یەکەم جارەکەی ئەگینا لە دوایدا هەرکەس سەرقاڵی ئیش و کاری خۆی دەبێت، لە فەرمودەی سەحیحی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوە کە دەفەرمویت: «إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ، وَإِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ[1]» واتە: کاتێ بەندە دایدەنێن لە گۆڕەکەیدا و هاوڕێکانی بەرەو دواوە دەگەڕێنەوە، هێشتا گوێی لە چرپەی کەوشەکانیانە.

سێ ڕۆژ لەدوای جەنگی بەدر کە کۆتایی پێهات پێغەمبەر (ﷺ) چوە سەر مردوەکانی قوڕەیشیەکان ئەوانەی شەڕیان بە پێغەمبەر دەفرۆشت (ﷺ) لە شاری مەکەدا، هەندێکیانی بانگ کرد فەرموی: «يَا أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ، يَا أُمَيَّةَ بْنَ خَلَفٍ، يَا عُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، يَا شَيْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، أَلَيْسَ قَدْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا؟ فَإِنِّي قَدْ وَجَدْتُ مَا وَعَدَنِي رَبِّي حَقًّا ، فَسَمِعَ عُمَرُ قَوْلَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ يَسْمَعُوا وَأَنَّى يُجِيبُوا وَقَدْ جَيَّفُوا؟ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِمَا أَقُولُ مِنْهُمْ، وَلَكِنَّهُمْ لَا يَقْدِرُونَ أَنْ يُجِيبُوا ، ثُمَّ أَمَرَ بِهِمْ، فَسُحِبُوا، فَأُلْقُوا فِي قَلِيبِ بَدْرٍ[2]» واتە: ئەی أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ، ئەی أُمَيَّةَ بْنَ خَلَفٍ، ئەی عُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، ئەی شَيْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، ئایە خوایەکانی ئێوە کە ئەوانتان دەپەرست ڕاست بوو؟ چونکە من ئەوەی الله پێی گوتبوم سەرم دەخات من ئەوە پێیگەشتم و سەرکەوتوبوم و ئێوەش کوژران و مردن، کە عومەری کوڕی خەتاب گوێی لە قسەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، فەرموی: ئەی

[1] صحيح البخاري (١٣٧٤) (١٣٣٨)، صحيح مسلم (٢٨٧٠)، سنن أبي داود (٣٢٣١) (٤٧٥١).
[2] صحيح مسلم (٢٨٧٤)، صحيح البخاري (٣٩٧٦)، سنن النسائي (٢٠٧٥)، مسند أحمد (١٢٠٢٠) (١٢٤٧١) (١٢٨٧٣).

پێغەمبەری الله (ﷺ) ئەوانە چۆن قسەی تۆ دەبیستن لەگەڵ ئەوەدا چۆن وەڵامی تۆ دەدەنەوە ئەوان وا ڕزیون؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، ئێوە ئەوەندەی ئەوان چاک گوێتان لێ نیە کە من ئەو قسانە لەگەڵ ئەوان دەکەم، بەڵام ناتوانن وەڵامم بدەنەوە، پاشان فەرمانیدا، لەدوای خۆیان ڕای کێشن، هێنایان لەناو کەندێک لە کەندەکانی بەدر لەوێ دایاننان و دایانپۆشین.

ئەگەر بڵێن ئایە ئەوانە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی مردوەکان گوێبیستی زیندوەکان دەبن؟ دەڵێین بەڵێ ئەگەر ئەوە بەڵگەش بێت بەڵام ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن لە هەندێک ڕیوایەتی تر هاتوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (ئێستا بەو شێوەیە دەبیستن) یانی مەرج نیە دواتر قسەی زیندوەکان ببیستن ئەوە تایبەت بوە بە پێغەمبەر (ﷺ) و بۆ ئەوجارە بوە کە بەڵێنە حەقەکانیان پێ بگوترێ، ئەگەرنا بەردەوام ئاگایان لەسەر ڕوی زەوی نامێنێ، بەتایبەت کافر و بێ بڕواکان دوچاری سزا و ناخۆشیەکانی خۆیان دەبن لە ناخۆشی و ئازارەکانی خۆیان لەناو گۆڕ و دوای مردن ئاگایان لە هیچ شتێکی تر نامێنێت هەر ئاگایان لە ناخۆشیەکانی خۆیانە، لەو ڕیوایەتەی تر کە لە بوخاری هاتوە و ئەلبانیش گێڕاویەتیەوە دەفەرموێ: «وقف النبي (ﷺ) على قليب بدر فقال: هل وجدتم ما وعدكم ربكم حقا؟ ثم قال النبي (ﷺ): إنهم الآن يعلمون أن الذي كنت أقول لهم هو الحق ث وقف النبي (ﷺ) على قليب بدر فقال: هل وجدتم ما وعدكم ربكم حقا؟ ثم قال: إنهم الآن يسمعون ما أقول[1]» واتە: ئەوان ئا ئێستا قسەکانی من دەبیستن.

نعمان محمود شكري الآلوسي خاوەنی تەفسیری (الروح المعاني) دەفەرموێ: (أن الأدلة من الكتاب والسنة وأقوال أئمة الحنفية وغيرهم-كما ستراه في الكتاب مبسوطا- على أن الموتى لا يسمعون وأن هذا هو الأصل، فإذا ثبت أنهم يسمعون في بعض الأحوال كما في حديث خفق

[1] لە کیتابی الکتاب: الآيات البينات في عدم سماع الأموات عند الحنفية السادات کە هی نعمان محمود شكري الآلوسي موفەسیرەکەی قورئان خاوەنی الروح المعاني کە ئەلبانی تەخریج و تەعلیقیشی لەسەر نوسیوە ص: ٢٦.

النعال أو أن بعضهم سمع في وقت ما كما في حديث القليب فلا ينبغي أن يجعل ذلك أصلا فيقال إن الموتى يسمعون كما فعل بعضهم كلا فإنها قضايا جزئية لا تشكل قاعدة كلية يعارض بها الأصل المذكور[١]) واتە: ئەوە بنچینەیە بە بەڵگەی قورئان و سونەت و فەرمودەی زانایان و پێشەوایانی مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفەش مردوەکان ئاگایان لە زیندوەکان نیە و زیندوەکان نابیستن لەدوای مردنیان، ئەگەر بێو ئەو حەدیسەی ڕابردو خوێندمانەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) قسەی لەگەڵ مردوەکانی سەرکردە قوڕەیشیەکان کرد ئەوە هەموو جارێک نیە جار و بارێکە ئەو بنچینە تەواو و جێگیرە هەڵ ناوەشێنێتەوە کە بڵێین مردو بە بەردەوامی ناتوانێ ئاگای لە ژیانی دونیا بێت و لە زیندوەکان قسە ببیستێت جار و بارێک ئەگەر الله مۆڵەتی لەسەر بێت.

ئەگەر بێت و هەندێک لە زانایان ئەوەیان کردوەتە بنچینە و ئەهلی سونە و جەماعەشن و پشتیشیان پێ بەستوە و دەڵێن کەواتە دەگونجێ بڵێین مردو بە بەردەوام لە ژیانی ناو گۆڕدا ئاگای لە دونیایە و گوێبیستی زیندوەکان دەبێت لەبەر ئەوەشە زۆرێک لە موتەسەویفە و خەڵکانی تر توشی ئەوە بونە هاواری مردوەکان دەکەن و دەڵێن گوێیان لە ئێمەیە ئەوە بەڕاستی شتێکی بێشەرعیە و تەواو نیە بەڵگەکان ئەوە دەسەلمێنێت[٢].

وە إبن تیمیةش -رحمه الله- ئەو حەدیسە و چەند حەدیسێکی تری هێناوەتەوە و دەفەرموێ: (فَهَذِهِ النُّصُوصُ وَأَمْثَالُهَا تُبَيِّنُ أَنَّ الْمَيِّتَ يَسْمَعُ فِي الْجُمْلَةِ كَلَامَ الْحَيِّ، وَلَا يَجِبُ أَنْ يَكُونَ السَّمْعُ لَهُ دَائِمًا، بَلْ قَدْ يَسْمَعُ فِي حَالٍ دُونَ حَالٍ، كَمَا قَدْ يَعْرِضُ لِلْحَيِّ فَإِنَّهُ قَدْ يَسْمَعُ أَحْيَانًا خِطَابَ مَنْ يُخَاطِبُهُ وَقَدْ لَا يَسْمَعُ لِعَارِضٍ يَعْرِضُ لَهُ، وَهَذَا السَّمْعُ سَمْعُ إدْرَاكٍ لَيْسَ يَتَرَتَّبُ عَلَيْهِ جَزَاءٌ وَلَا هُوَ السَّمْعُ الْمَنْفِيُّ بِقَوْلِهِ: ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ﴾ [النمل: ٨٠] فَإِنَّ الْمُرَادَ بِذَلِكَ سَمْعُ

[١] الآيات البينات في عدم سماع الأموات عند الحنفية السادات ص: ٣٤.

[٢] تێبینی: هەروەک ڕونکراوەتەوە لەو بابەتانە عوزر بە جەهل نیە و هەرکەسێک هاواری غەیری الله بکات موشریکە بۆ زانیاری زیاتر کلیک بکە.

الْقَبُولِ وَالِامْتِثَالِ، فَإِنَّ اللَّهَ جَعَلَ الْكَافِرَ كَالْمَيِّتِ الَّذِي لَا يَسْتَجِيبُ لِمَنْ دَعَاهُ[1]) واتە: هەمویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی مردو بەگشتی جار و بارێک دەنگی زیندو دەبیستێت، بەڵام ئەوە، ئەوە واجب و پێویست ناکات بڵێی بە بەردەوام مردو ئاگای لە ژیانی دونیایە و قسەکانی زیندوان دەبیستێت، بەڵکو هەندێک جار دەبیستێت و هەندێک جار نابیستێت ئەوە بە فەرمان و ئەمری اللەیە، زیندوش هەر بەو شێوەیە هەندێک جار مەژغوڵ و سەرقاڵە بە ئیشێکی خۆی ئاگای لە تۆ نیە هاواریشی لێ دەکەی بانگیشی دەکەی لێشی نزیک دەبیتەوە دەڵێت وەڵا ئاگام لێ نەبوە بانگی منت کرد دەڵێ ئا ئا مردم ئەوە دوجار سێجار دەجار بانگت بکەم بۆ جوابم نادەیتەوە دەڵێ ئاگام لێت نەبوو مەژغوڵ بوم لەگەڵ کۆمپیوتەرەکەم لێرە نەبوم هۆشم لەلای تۆ نەبوو مادەم زیندو بەو شێوەیە بێت هەندێک جار لەلاتە هاواری لێدەکەیت ئاگای لە قسەکەی تۆ نیە و گوێبیستت نابێت هۆشی لەلای تۆ نیە مردوش حەوت جار حەوت جار دەبێت ئەوەی بۆ بڵێین کە زۆرجار ئاگای لە ژیانی دونیا و قسەی زیندوەکان نیە و نایان بیستێ ئەگەر جار و بارێکیش بە بەڵگە جێگیرە دەیانبیستێ. الله تعالى لە قورئاندا فەرمویەتی: ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ﴾ [النمل: ٨٠] واتە: بەڕاستی تۆ ناتوانی (بانگەوازت) بە مردوەکان ببیستێنی. الله ئەوە نمونەی کافرەکانە هێناویەتیەوە واتە کە ئەنەهو چۆن مردو نابیستێت هەموو جارێک ئێوەی کافرەکانیش چۆن پێغەمبەر (ﷺ) قسەتان بۆ دەکات وەکو مردوان وان گوێی لێ ناگرن و نایبیستن و هەستی بۆ ڕاناگرن بە واتای ئەوەی نایەنەوە سەر ڕێگا و گوێ لە نەسیحەت و ئامۆژگاریەکان ناگرن بە واتای ئەوە نیە مردو جار و بارێک دەنگی زیندوەکان نابیستێت بەڵکو بەڵگە لەسەر ئەوەیە جار و بارێک دەنگیان دەبیستێت.

**پرسێك:** شوێنی ئۆقرە گرتنی گیانی مردوان لە کوێیە و چۆنە؟

[1] مجموع الفتاوى ج: ٢٤ ص: ٣٦٤.

**وەڵام:** ابن القيم لە -كتاب الروح- زیاتر لە چەندەها بۆچونی هێناوە دورو درێژی کردوەتەوە، بەڵام بە کورتی بۆچونی دروستی زانایان ئۆقرە گرتنی گیانەکان لە دوای مردنی مردوەکان بەو شێوازەی خوارەوەیە:

١.گیانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام): گیانی پێغەمبەران جیاوازە لە گیانی مرۆڤەکانی تر و لە پلە هەرە بەرزەکانی ئاسمانە دەچنە ئاسمانەکان و لەوێدا لە پلە بەرزەکان ئۆقرە دەگرن و لەوێدا الله تعالی شوێنی پێداون، هەروەکو دایکە عائیشە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ پێغەمبەر(ﷺ) لە سەرەمەرگدا بوو دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ فِي الرَّفِيقِ الأَعْلَى[1]» واتە: یا الله بۆلای بڵندترین هاوڕێ.

٢.شەهیدەکان: ئەوانەی لە مەیدانی (جەنگ و جیهاد)دا دونیا نەویستن و الله ویستن ئەو گیانەی خۆیان کە چەند شیرینە دەیکەنە قوربانی دینی الله تعالی ئامادەن لەپێناو الله تعالی بکوژرێن و ژیان و گیانی دونیایان لە دەست بچێت و گیانیان بکێشرێ هیچ شتێکیش لە گیان خۆشەویستر نیە بە اللەی دەبەخشن و دەیدەن، بە بەڵگەی ئایەتی قورئان و حەدیسی سەحیحی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانیش جۆرێک لە زیندوبون و گیان بەبەردا هاتن و ژیانێکی تایبەتیان هەیە، شەهیدەکان لەدوای مردن گیانیان دەچێتە قەپێلکی باڵندەیەکی سەوز ئەویش هەڵدەفڕێت و دەچێتە (جنة الفردوس) لەوێوە دەسورێتەوە جار و بارێک خۆی بە ژێر عەرشی اللەوە دەکات وە هەندێک جاریش دەچێت بەملا و لادا دەسوڕێتەوە بەناو (جنة الفردوس) کە الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَاۢۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ﴾ [ال عمران: ١٦٩] واتە: هەرگیز وا گومان مەبەن ئەوانەی کە کوژران لە ڕێی الله مردون (نەخێر وانیە) بەڵکو ئەوانە زیندون لای پەروەردگاریان ڕۆزی دەدرێن.

[1] صحيح البخاري (٤٤٣٧) (٤٤٣٥) (٤٤٣٦)، صحيح مسلم (٢١٩١) (٢٤٤٤)، سنن الترمذي (٣٤٩٦).

(مسروق) فەرمویەتی: «سَأَلْنَا عَبْدَ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتَا بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ [ال عمران: ١٦٩]. قَالَ: أَمَا إِنَّا قَدْ سَأَلْنَا عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: (أَرْوَاحُهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ، لَهَا قَنَادِيلُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ، تَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ، ثُمَّ تَأْوِي إِلَى تِلْكَ الْقَنَادِيلِ، فَاطَّلَعَ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمِ اطِّلَاعَةً فَقَالَ: هَلْ تَشْتَهُونَ شَيْئًا؟ قَالُوا: أَيَّ شَيْءٍ نَشْتَهِي، وَنَحْنُ نَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شِئْنَا؟ فَفَعَلَ ذَلِكَ بِهِمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا رَأَوْا أَنَّهُمْ لَنْ يُتْرَكُوا مِنْ أَنْ يُسْأَلُوا، قَالُوا: يَا رَبِّ، نُرِيدُ أَنْ تَرُدَّ أَرْوَاحَنَا فِي أَجْسَادِنَا، حَتَّى نُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى. فَلَمَّا رَأَى أَنْ لَيْسَ لَهُمْ حَاجَةٌ تُرِكُوا[1]» واتە: پرسیارمان لە (عبدالله)ی کوڕی (مسعود)کرد دەربارەی ئەم ئایەتە کە ئەمە ماناکەیەتی ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتَا بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ [ال عمران: ١٦٩] واتە: هەرگیز وا گومان مەبەن ئەوانەی کە کوژران لە ڕێی الله مردون (نەخێر وانیە) بەڵکو ئەوانە زیندون لای پەروەردگاریان ڕۆزی دەدرێن. ئەویش گوتی: ئێمەش پرسیارمان لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد ئەویش فەرموی: (گیانیان وا لەناو قەپێلکی (سکی) باڵندەیەکی سەوزدا، خاوەنی چەند چرایەکی هەڵواسراو بە عەرشەوە، لەبەهەشتا چەندە بیانەوێ و بۆ هەرکوێ بیانەوێ دەگەڕێن پاشان دێنەوە بۆلای ئەو چرایانە، پەروەردگاریان تەماشایەکیان دەکات و دەفەرموێت: (ئایا حەز لە هیچ دەکەن) دەڵێن: حەز بەچی بکەین لە کاتێکدا ئێمە بەئارەزوی خۆمان بۆ کوێ بمانەوێ لەبەهەشتا دەگەڕێین؟ تا سێ جار ئەمەیان پێ دەفەرموێت، کاتێ دەبینن وازیان لێناهێنرێت تا داوای شتێك نەکەن، دەڵێن: پەروەردگار، داوات لێدەکەین کەجارێکی دیکە گیانمان بگەڕێتەوە بۆ لاشەمان تا جارێکیتر لە پێناوی تۆدا بکوژرێین کاتێ دەبینێ هیچ داوایەکیان نییە وازیان لێدەهێنێت.

ئیلا ئەو شەهیدانە نەبێت کە قەرزارن و گەردنیان ئازاد نەکراوە ئیلا ئەوان ناگەنە بن عەرشی الله تعالی و (جنة الفردوس) بەڵام خۆشیەکانی تر دەبینن، هەتا قەرزەکەیان بۆ نەدرێتەوە، پیاوێک هاتەلای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: «یا رسول الله، ماذا لي إن قتلت في سبيل الله؟ قال:

[1] صحيح مسلم (١٨٨٧)، سنن الترمذي (٣٠١١)، سنن ابن ماجه (٢٨٠١)، سنن الدارمي (٢٤٥٤).

الجنة. فلما ولى قال: إلا الدين سارني به جبريل عليه السلام آنفا[1]» واتە: ئەی پێغەمبەری الله، من چیم بۆ هەیە ئەگەر لەپێناو الله کوژرام؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: بەهەشت. لەدوای ئەوەی کابرا ویستی بڕوا و ڕۆیشت فەرموی: بگەڕێوە گوێبیستم بە ئیلا ئەگەر قەرزار بیت و قەرزەکەت بۆ نەدرابێتەوە و گەردنت ئازاد نەکرابێت ئەوە دەکەویتە خۆشیەکان بەس ناتوانیت بچیتە (جنة الفردوس) لەبەر قەرزاریەکەت ماوەیەک پێش ئێستا جوبرائیل ئەو هەواڵەی بۆ هێنام.

٣. گیانی ئیماندارە ساڵح و چاکەکان: ئەوانەش دەچنە ناو قەپێلکی تەیرێک وەکو تەیر و باڵندەیەکیان لێ دێت بەڵام جیاوازیان لەگەڵ شەهیدەکان ئەوەیە ئەوان لەنێو بەهەشتدا ئینجازەی گشتیان نیە هی تایبەتیان هەیە، ناتوانن بە کەیفی خۆیان بێن و بچن لە یەک شوێن دەیان بەنە بەهەشت لە پاشان لەوێدا لە بەروبوم و دار و بارەکانی بەهەشت دەخۆن هەر ئەوەندەیان بۆ هەیە و ناتوانن بچنە بن عەرشی الله تعالى و بەناو بەهەشتدا هەموی بسوڕێنەوە، وە موژدە بۆ ئەو کەسانەی ئیمانداری ساڵح و چاکن کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «إنما نسَمَةُ المسلمِ طيرٌ تعْلَقُ في شجرِ الجنَّةِ حتى يرجعَها اللهُ عزَّ وجلَّ إلى جسدِه يومَ القيامةِ[2]» واتە: گیانی کەسە ئیماندار و چاکەکان وەکو تەیر و باڵندەیەکی لێدێت دەچێت لەناو بەهەشت لە دار و درەخت و بەروبومەکانی بەهەشت دەخوات هەتا ڕۆژی قیامەت بەرپا دەبێت الله دەیگەڕێنێتەوە ناو لاشەکەی هەتاوەکو زیندوی بکاتەوە بۆ مەیدانی حەشر و حیساب.

٤. گوناح کارەکان: کە لە ئومەتی پێغەمبەریشن (ﷺ) لە ڕابردودا باسمان کرد لە هەندێک لەو سەبەبانەی دەبنە مایەی ئەزیەتدان و ئازار و عەزاب لەدوای مردندا، گوتمان ڕیبا خۆرەکان لەناو ڕوباری خوێناویدا دەبن یان ژن و پیاوە زینا کارەکان لە تەنورە ئاگرینیەکەدا دەبن

---

[1] حكم الحديث: حديث صحيح لغيره وهذا إسناد حسن، مسند أحمد (١٧٢٥٣)، سنن النسائي (٤٦٨٤)، مسند أحمد (١٩٠٧٧) (٢٢٤٩٣).

[2] حكم الحديث: إسناده صحيح على شرط الشيخين، مسند أحمد (١٥٧٧٦)، سنن النسائي (٢٠٧٣)، سنن ابن ماجه (١٤٤٩) (٤٢٧١).

گیان و لاشەیان ئەوە عەزابی دەبێت هەتا قیامەتیان لێ دادێت یان ئەو کەسانەی لەکاتی نوێژە فەرزەکان خەوتون و لەکاتی خۆیدا ناکەن یان بەشەودا قورئان ناخوێنن یان بە ڕۆژیش قورئان ئیش پێ ناکەن سەریان ورد و خاش دەبێت و کەسێک بەو شێوەیە عەزابیان دەدات و بەردی گەورەیان بەسەردا دەدات یان کەسە درۆزن و دیعایە چیەکان کەسێک لە پشت سەری ڕادەوەستێ قولابێکی ئاسنی تیژی پێیە لە لوغاوەی ڕاستی دەکات و هەتا تەوقی سەری هەڵدەزڕێنێت و ئینجا لەلای چەپی دەکات و دواتر الله تعالی چاکی دەکاتەوە و دیسان بەو شێوەیە عەزابی دەداتەوە هەتا قیامەتی لێ دادێت.

٥. گیانی کافر و بێبڕواکان: پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای ئەوەی باسی کەسی ئیماندار دەکات گیانیان دەچێتە بەهەشت دواتر دەفەرموێ کافرەکانیش: «فَتَخْرُجُ كَأَنْتَنِ رِيحِ جِيفَةٍ، حَتَّى يَأْتُونَ بِهِ بَابَ الْأَرْضِ، فَيَقُولُونَ: مَا أَنْتَنَ هَذِهِ الرِّيحَ. حَتَّى يَأْتُونَ بِهِ أَرْوَاحَ الْكُفَّارِ[1]» واتە: بۆنێکی زۆر پیس و بۆگەن لە ڕۆحەکانیان دێت، تا دەیبەن بۆ دەرگای سەر زەوی، دەڵێن: ئەم بۆنە ناخۆشە چیە، تا دەیبەن بۆلای ڕۆحی بێ بڕوایان کە زانایان دەفەرمون ڕەنگە دۆزەخ بێت لەوێدا ئۆقرە دەگرن و سجن دەکرێن و عەزاب دەدرێن.

**پرسێك:** گیانی ئینسانی ئیماندار لە چ کاتێکدا لە بەهەشتە؟

**وەڵام:** یان ئەوەیە ئیماندار شەهید دەبێت لە پێناو الله تعالی کە دەکوژرێت لە مەیدانی (جەنگ و جیهاد)دا، ئەوە دەچێتە قەپێلکی تەیرێک و باڵندەیەکی سەوز لەناو بەهەشتدا مۆڵەتی گشتی پێ دەدرێت بۆ هەر شوێنێکی بەهەشت بڕوا و هەڵبفڕێ ئەوە ڕێگای پێ ناگیرێ و ناوە ناوەش دەچێتەوە پشودانەکەی لە بن عەرشی الله تعالی، قەنادیل و قەندیل لەوێ دانراوە خۆی هەڵدەواسێت و دوایەش دەچێتەوە بەناو بەهەشتدا دەگەڕێ. جۆری دوەم لە گیانی بڕواداران ئەوانەن کە ئیمانداری چاک و پاک و ساڵیحن یان ئافرەتی زۆر ساڵیحەن ئەوانەش گوتمان ڕۆحیان وەکو باڵندەیەکی لێدێت و دەچێتە بەهەشتی پان و بەرین، بەڵام لە

[1] حكم الحديث: صحيح، سنن النسائي (١٨٣٣)، صحيح مسلم (٢٨٧٢)، سنن الترمذي (١٠٧١).

شوێنێکی دیاریکراو دەبن ئەو مۆڵەتە گشتیەی گیانی شەهیدەکانیان پێنادرێت و ناتوانن بە کەیفی خۆیان بسوڕێنەوە بە ناوی بەهەشتدا بەڵام شوێنیان زۆر خۆش دەبێت.

## وەڵامی زانایان سەبارەت بە هاتوە چۆکردنی گیانی ئیماندار لە ناوگۆڕ و لە بەهەشتدا:

إبن تیمیة دەفەرموێ: (وَأَرْوَاحُ الْمُؤْمِنِينَ فِي الْجَنَّةِ وَإِنْ كَانَتْ مَعَ ذَلِكَ قَدْ تُعَادُ إلَى الْبَدَنِ؛ كَمَا أَنَّهَا تَكُونُ فِي الْبَدَنِ وَيُعْرَجُ بِهَا إلَى السَّمَاءِ كَمَا فِي حَالِ النَّوْمِ. أَمَّا كَوْنُهَا فِي الْجَنَّةِ فَفِيهِ أَحَادِيثُ عَامَّةٌ؛ وَقَدْ نَصَّ عَلَى ذَلِكَ أَحْمَد وَغَيْرُهُ مِنْ الْعُلَمَاءِ وَاحْتَجُّوا بِالْأَحَادِيثِ الْمَأْثُورَةِ الْعَامَّةِ وَأَحَادِيث خَاصَّةٍ فِي النَّوْمِ وَغَيْرِهِ[1]) واتە: ڕۆحی بڕوادارە ڕاستەقینەکان لە بەهەشتە ئەگەر لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکجار دێتەوە بەر لاشەی؛ یەکەمجار ڕۆحی ئیماندار ئەو کاتەیە کە دەینێژن و دەیشارنەوە لە کاتی سەرەمەرگ و گیاندانادا کە دەچێتە ئاسمان دەگەڕێتەوە بۆ ناو گۆڕەکەی بە مەبەستی ئەوەی کە پرسیاری لێبکرێت و وەڵامی فریشتەکان بداتەوە ئەوە ئەو کاتە یەکەم گەڕانەوەیەتی بۆبەر لاشەی لە پاشان کە پرسیار و وەڵامەکانی تەواو دەبێت قەبرەکەی لەسەر فراوان دەبێت ئەگەر هۆکاری ئەوە نەبێت ڕۆحەکەی زیندانی بکرێت بەوەی قەرزار بوبێت ڕۆحەکەی دەچێتە بەهەشت و لەوێدا لە بەهەشتدا ئۆقرە دەگرێت، هەروەکو پێشتر وەبەر لاشەکەی بوە لە دونیادا بەو شێوەیە لە بەهەشتدا هەندێک جار هەیە دەگەڕێتەوە لای لاشە و جەستەکەی هەروەکو ئەوەی تۆ لە خەودایت چۆن هەندێکجار خەون دەبینی ڕۆح و گیانت دەچێت لاشە و جەستەکەیشت لەوێدایە بەو شێوازە ڕۆح و گیانەکەت دەچێت خۆشی دەبینێت و تامی دەکات و دەچێتە بەهەشتی ئیماندار. بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ڕۆحی ئیماندار دەچێتە بەهەشت چەندین فەرموودەی گشتی و عامی لەسەرە؛ جا ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و جگە لەویش لە زانایان پێداگریان کردوە و ئەو ڕاوبۆچونەیان هەبوە کە ڕۆحی ئیماندار دەچێتە بەهەشت چەند فەرموودەیەکی گشتیان بە بەڵگە هێناوەتەوە سەبارەت بە نوستنیش چەند فەرموودەیەکی تایبەتیان هێناوەتەوە جاروبارێک ڕەنگە ئیلا ئەو جارە نەبێت

[1] مجموع الفتاوى، ج: ٥ ص: ٤٤٧.

ڕۆح و گیانەکە بێتەوە ناو گۆڕ و دوایی دوبارە بچێتەوە بەهەشت ئەو جارانە چ کاتێکن و چۆنن ئێمە نایزانیت شتێکی غەیب و پەنهانە و تەنها الله عیلمی پێی هەیە جل جلالە.

بەڵام گرنگ ئەوەیە دەفەرموێ: (وَمَعَ ذَلِكَ فَتَتَّصِلُ بِالْبَدَنِ مَتَى شَاءَ اللَّهُ، وَذَلِكَ فِي اللَّحْظَةِ بِمَنْزِلَةِ نُزُولِ الْمَلَكِ وَظُهُورِ الشُّعَاعِ فِي الْأَرْضِ وَانْتِبَاهِ النَّائِمِ[1]) واتە: هەرکاتێک الله ویست بکات و حەز بکات ئەو ڕۆح و گیانە دێتەوە بەر لاشەکە لەناو گۆڕدا، لەو کاتەدا لاشەکە بەو شێوەیەی بەسەر دێت چۆن کەسێک خەوتبێت لەناکاودا ڕابچڵەکێت و بەخەبەر بێت دەڵێ کە ڕۆحەکە دێتەوە بەری ڕاچڵەکینێکی توش دەبێت بەهۆش هاتنەوەیەکی توش دەبێت هەستەکەی زیاتر دەبێت کە ئەو مردوە لەناو گۆڕ و قەبردایە بەس وا لە خۆشیەکاندا دەژیەت هەروەکو کەسێک تیشکی خۆر پێی دەگات و ڕاچڵەکینێکی توش دەکات.

**پرسێك:** ئایە ڕۆح و گیان دەمرێ و لەناو دەچێ ڕۆژێک لە ڕۆژان؟

**وەڵام:** لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە ڕۆح بڵاو بوەتەوە بەناو هەموو لاشەکەت، إبن تیمیة دەفەرموێ: (فَلَا اخْتِصَاصَ لِلرُّوحِ بِشَيْءٍ مِنْ الْجَسَدِ بَلْ هِيَ سَارِيَةٌ فِي الْجَسَدِ كَمَا تَسْرِي الْحَيَاةُ الَّتِي هِيَ عَرَضٌ فِي جَمِيعِ الْجَسَدِ فَإِنَّ الْحَيَاةَ مَشْرُوطَةٌ بِالرُّوحِ فَإِذَا كَانَتْ الرُّوحُ فِي الْجَسَدِ كَانَ فِيهِ حَيَاةٌ وَإِذَا فَارَقَتْهُ الرُّوحُ فَارَقَتْهُ الْحَيَاةُ[2])واتە: ڕۆح و گیان شتێکی وا نیە لە شوێنێک بێت و لە شوێنێکی تر نەبێت هەروەکو گیان کە لەبەرد دایە کاتێک ڕۆحت بەبەردا بێت لەبەر لاشەکەت بڵاوە بەناو هەموو لاشەکەتدا کەواتە هەرکاتێک لاشەیەک گیانی بەبەر بێت ئەوە لە ژیاندایە ڕۆح و گیانەکەی لێ دەربچێت ئەوە مردنە بەسەریدا هاتوە بە دەرچونی ڕۆحی ئەو کەسە مردوە و بە مردو حیساب دەبێ و لاشەیەکی سارد و سڕ دەمێنێتەوە.

[1] مجموع الفتاوی ج: ٢٤ ص: ٣٦٥.
[2] مجموع الفتاوی، ج:٩ ص:٣٠٢.

## ئەو سەبەب و هۆکارانەی وا لە مرۆڤ دەکات ئەگەر موسڵمانیش بێت کۆتایەکەی ئاخر شەڕ بێت و لەسەر گوناح و تاوان بمرێت:

١.فەساد لە بیروبڕوا: بیروبڕوات ئەگەر هەڵە و کەم و کورتی تێدابێت خاوەن بیروبڕوایەکی ڕاست و دروست نەبیت لە ژیانتدا هەوڵت نەدابێت بە تەواوی و بە جوانی الله و پێغەمبەرت ناسیبێت (ﷺ) بڕواهێنان بە ڕۆژیی دوایی و مردن و ژیانی دوای مردن و زیندوبونەوە و مەیدانی حەشر و حیساب و پردی سیرات و حەوزەکەی پێغەمبەر (ﷺ) و میزان و تەرازو و بەهەشت و دۆزەخ... لێکۆڵینەوەت نەکردبێ و بیروبڕوایەکی ڕاست و دروست و دامەزراوت لەسەر ئەوانە نەبوبێت ئیمانێکی تەواوت بە فریشتەکان نەبوبێت و نەیانناسی و ئیمانت نەبوبێ بە هەموو پێغەمبەرەکان (علیهم الصلاة والسلام) بە هەموو پەرتوکە ئاسمانیەکان خەلەل هەبێت لە بیروبڕوات ئەوە بزانە لەسەرەمەرگدا تۆ دەبیتە ئاخر شەڕ و کەس بە کەڵکت نایەت، کەسێک نەبیت خاوەن بیروبڕوای تەواوبیت شەیتان دێت فێڵی خۆیت لێدەکات ئەو کاتە ڕۆحت لەسەر خراپە دەکێشرێ.

لە سەرەمەرگدا مرۆڤ ئەگەر بیروباوەڕی لە ژیاندا تەواو نەبوبێت بە تەواوی اللەی نەناسیبێت ئەوکات شەیتان دێت پرسیاری لێدەکات و ڕەنگە هەڵیبگەڕێنێتەوە لە ئیسلام، لە ئاخیر لەحزە و چرکەی ژیانیدایە لە حەساسترین و خەتەرناکترین چرکەی ژیانیدایە، ئەوە لەو کاتەدا هەڵی دەگەڕێنێتەوە لە ئیسلام لە جیاتی لەسەر ئیسلام و ئیمان بمرێ هەڵدەگەڕێتەوە و بە هەڵگەڕاوە و مولحید و بێبڕوا گیانی دەردەچێ ئەوە لە هەموی خەتەرناکترە لە هەموی ترسناکترە، شەیتان فێڵت لێدەکات ئەگەر ئێستا هەوڵنەدەی ببیت بە خاوەن بیروباوەڕێکی ڕاست و دروست هەوڵ بدە شەو و ڕۆژ ببەستەوە برۆ بۆلای مامۆستایەکان کیتاب و پەرتوکە باشەکان هی زانا و عالمە متمانەکان ئەوانەی بەڵگەیان بە ئایەت و حەدیس هێناوەتەوە ئەوانە بکڕە بیانخوێنەوە لێی وردبەوە[1]. الله تعالی دەفەرموێت: ﴿قُلۡ هَلۡ نُنَبِّئُكُم بِٱلۡأَخۡسَرِينَ أَعۡمَٰلًا ۞

[1] تێبینی: دەتوانن سود لەو کیتابانەی مامۆستا ئیسماعیل وەربگرن کە ئێمە لە کەناڵی یوتیوبەکەمان بڵاومان کردووەتەوە بە ناونیشانی:

﴿ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعۡيُهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا﴾ [الكهف: ١٠٣-١٠٤]

واتە: بڵێ ئایا هەواڵتان بدەینێ بە خەسارەتمەندترین (کەس) لەکارو کردەوەکانیاندا * ئەوانەن کە هەوڵ وتێکۆشانەکانیان لەم ژیانی دونیادا بەهەوانتە و بێ ناوەرۆك دەرچو لەگەڵ ئەوەیشدا لایان وایە کارێکی شیاو و شایستەیان ئەنجام داوە.

٢.بەردەوام بون لەسەر گوناح و تاوانەکان لە ژیانی دونیادا: ئەگەر بەردەوام بیت و تێکەڵ بیت لەسەر گوناح و تاوانەکان و وازیان لێنەهێنیت لەگەڵ چی بژیت وەکو خەو وایە یان وەکو ئەو کاتەی کە بێهۆشت دەکەن بۆ نەشتەرگەری کە بەهۆش دێیتەوە چیت زۆر لە دڵدا بوبێت و لەگەڵ چی زۆر ژیا بیت مەراقی چیت لە دڵ و مێشکدا بوبێت ئەوەت بەسەر زماندا دێتەوە سەرەمەرگیش بەو شێوەیە، زانایان دەڵێن مادەم زۆر گوناحت کردبێ بەردەوام بوبیت لەسەری وازت لە تاوانەکان نەهێنابێ تەوبەیەکی ڕاستەقینەت ئەنجام نەدابێ لە سەرەمەرگدا ئەو تاوان و گوناحانە دێنەوە سەر زمانت.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «المعاصي بريد الكفر[1]» واتە: گوناحەکان سەرنج ڕاکێشە و دەستت دەکێشێت بەرەو کوفر.

زانایانی ئیسلام باسیان کردوە دەفەرمون لە سەرەمەرگدا مادەم تۆ لەگەڵ گوناح ژیای گوناحت دێتەوە بیر هەرچەند پێت بڵێن بڵێ (لا إله إلا الله) و (ملك الموت) وا لەسەر سەرت حازرە بۆ ئەوەی گیانت بکێشێت بەڵام تۆ پارە و پول و گوناحەکانی خۆت دێتەوە سەر زمانت و ئەوانە دەڵێیتەوە، ئیمامی زەهەبی دەفەرموێ پێشەوا موجاهید فەرمویەتی: (مَا من ميت يَمُوت إِلَّا مثل لَهُ جُلَسَاؤُهُ الَّذين كَانَ يجالسهم فاحتضر رجل مِمَّن كَانَ يلْعَب بالشطرنج فَقيل لَهُ قل لَا إِلَه إِلَّا الله فَقَالَ شاهك ثمَّ مَاتَ فغلب على لِسَانه مَا كَانَ يعتاده حَال حَيَاته فِي اللّعب

١. هەڵبژاردن و دەنگدان لە دیدگای قورئان و فەرموده.
٢. حوکمی بەشداریکردن لە حوکمەتەکانی کوفر و عەلمانی سەردەم.
٣. حکم بغير ما أنزل الله.
٤. شەرحی کتێبی (قواعد الأربع)ی شێخ محەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب.

[1] [أَخرَجَهُ أَبو نُعَيْمٍ (١٠/ ٢٢٩) والبَيهَقِيُّ في «الشُّعَبِ» (٧٢٢٣)].

فَقَالَ عوض كلمة الْإِخْلَاص شاهك[1]) واتە: تۆ لەگەڵ کێ زۆر دانیشتبیت و هاتوچۆی چ کۆڕ و مەجلیسێکت کردبێ لەگەڵ چ برادەرانێک بوبی و خولیای چ کار و گەمەیەک بوبی لە ژیانی دونیاتدا ئەوە لە سەرەمەرگدا دەهێنرێتەوە پێش چاوت هەتا یەک لە بەشەرەکان بۆی گێڕاینەوە موسڵمان بوە بەڵام تاوانکار بوە هەموو کات لەو کۆڕ و مەجلیسانە دادەنیشت گەمەی شەترەنجی دەکرد لە گەمەی شەترەنجدا خەریکبوو خولیا بوو پێیوە لە سەرەمەرگدابوو پێیان دەگوت بڵێ (لا إله إلا الله) ئەویش دەیگوت نا نەخێر ها ئەوە پاشا و کشمەلیک ئەوهای دەگوت و هەر ئەوەی بەسەر زماندا دەهاتەوە چونکە لەگەڵ ئەوە ڕاهاتبوو هەتا لەناکاو (ملك الموت) لەسەر کشمەلیک ڕۆحی کێشا لەسەر ئەویش زیندو دەبێتەوە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: «وإنَّما الأعْمَالُ بالخواتِيم[2]» واتە: کار و کردەوەکان بە کۆتاییە.

یەکێک لە زانا بەڕێزەکان کە دکتۆریشە دەفەرموێت لە یەکێک لە وڵاتەکانی ئەوروپا لە سوید بوم، بینیم نەخۆشێک لە نەخۆشخانەکە داغڵ کرابوو گەنجێکی تازە پێگەیشتو بوو، پرسیم گوتیان ئەوە بەس پیرە دایکێکی هەیە هەموو جارێک دێت سەردانی دەکات، دەڵێت زانیم عەرەبە و بە حیساب دەبێ موسڵمانیش بێت خەڵکی لوبنانیش بوو، منیش لێی چومە پێش چونکە عەرەب بوم و موسڵمان بوم گوتم بزانم ئەو کەسە کێیە و لەکوێ هاتوە، تەماشام کرد لاشەکەی تۆزێک ڕەنگی باش نەبوو وە هەستم دەکرد گیان و ژیانی لە مەترسیدایە وەکو پزیشک تەقریرە توبیەکانم خوێندبۆوە، لە کۆتایدا بینیم چرکە بە چرکە ئەو کەسە گیانی خەتەرتر دەبێ ژیانی مەترسیدارتر دەبێت وە بینیشم ڕەنگی هێواش هێواش دەگۆڕا بەرەو ڕەشایەتی دەچوو، گوتم کوانێ خزم و کەس و کاری یان دایکی، دەڵێ ژمارە تەلەفۆنەکەیان پێدام پەیوەندیم پێوە کرد، گوتم تۆ دایکی ئەو نەخۆشەی، گوتی بەڵێ، گوتم زەحمەت نەبێ

---
[1] الكبائر للذهبي، ص: ٩١.
[2] صحيح البخاري (٦٦٠٧) (٢٨٩٨) (٤٢٠٢)، صحيح مسلم (١١٢)، مسند أحمد (٢٢٨١٣) (٢٢٨٣٥).

ئەگەر هەتا نەخۆشخانە بێیت حاڵەتی کوڕەکەت شڕە و خراپە، دەڵێ ئەویش گوتی من وا لە ئیشم و ئیش دەکەم با ئیش و کارەکەم تەواوبێت ئەگەرنا مۆڵەتم نادەن ئینجا دێم.

ئەوە ڕەحم و بەزەیی ئەوروپایە هەموی لەسەر پارە و مادیاتە لەسەر مەسڵەحەت و ئیشکردنە ئەگەر کوڕەکەت لە مردنیشدا بێت کابرای تاجیر و ئەوروپیە پیسەکە مۆڵەت و ئیزنت نادات ئەگەر بشچی بە گوێرەی ئەو کاتەی کە لە ئیشەکە دادەبڕێیت لە مەعاشەکەت دەبڕێت و ناڵێ کوڕی لە سەرەمەرگە.

دەڵێ گرنگ ئەوەیە دوای ماوەیەک دایکی هات تۆزێک فرمێسکی ڕشت و هاتە سەر کوڕەکەی، ئێمەش گوتمان دەبێ لێی دوربکەویتەوە حاڵەتی کوڕەکەت بەو شێوەیە (بۆمان ڕونکردەوە)، لێم پرسی ئەی دایکی ئەو کوڕە ئەو کوڕەی تۆ موسڵمانە؟ گوتی بەڵێ، ئێمە (الحمدلله) هەمومان موسڵمانین، ئێمە ساڵی جارێک دەگەڕێینەوە لوبنان بەس بۆ سەردانی گۆڕی باب و باپیرەکان و داپیرەکانمان، دەڵێ وایدەزانی موسڵمانێتی هەر ئەوەندەیە بەڵام شمەک و جل و بەرگی هەڵسوکەوتی دایکی کوڕەکەش لەگەڵ ئەوروپیەکان هیچ فەرقی نەبوو هەستت پێ نەدەکرد موسڵمانە، دەڵێ گوتم حاڵەتی کوڕەکەت زۆر خراپە، گوتی ئەرێ وەڵا هەست دەکەم، دەڵێ منیش چوم هەر لەبن گوێی بۆ خێری خۆم دەمگوت (لا إله إلا الله) زانیم لە گیاندانە، دەڵێ هێواش هێواش لاشەکەی ڕەش هەڵدەگەڕا، هیچ لە دەستی پزیشکەکانیش نەمابوو نەیاندەزانی ئەوە چیە بەسەری دێت، دەڵێ لە وەڵامی من هەندێکجار زمانی دەبویەوە و ناوی ئافرەتێکی دەهێنا، زانیم ناوی ئافرەتانە (ناوی ئافرەتێکی ئەجنەبی کافر و بێبڕوایە)، دەڵێ گوتم بە دایکەکەی ئەوە چی دەڵێ؟ لە وەڵامی مندا دەڵێ گوتی کوڕەکەم لەوەتەی پێگەیشتوە کچێکی دیان هەبوە لێرە حەزیان لە یەکتر کردوە لەگەڵ یەکتر ڕایان بواردوە دڵی هەر بە ئەوەوە پەیوەست بوو ڕەنگە ناوی ئەوبێت لەسەر زمانی بێت ئێستا ئەویش ئاگای لە کوڕی من نیە، دەڵێ من زیاتر لە دەجار پێم گوت بڵێ (لا إله إلا الله)، دەڵێ ئەویش دەیگوت نەخێر کوا فڵانە ئافرەت، دەڵێ لەناکاو بینیم لەو قسە کردنانەدا بوو ڕۆح و

گیانی دەرچو وە جیازەکەی و تەختیت و ئەو بابەتە شتانەی لەسەر دڵیان دانابوو نیشانیدا تەواو ئەوە گیانی جیابویەوە لە لاشەکەی و مرد، تەماشام کرد وەکو پارچە ڕەژویەکی لێهاتبوو ئەو لاشەیە، دایکەکە گوتی کوڕەکەم بەڵێ گوناحکاربوو زیناکار بوو ئارەقی دەخواردەوە خەریکی ئەو شتانە بوو.

چونکە لەگەڵ ئافرەتەکە شەو و ڕۆژ دڵی بە ئەوەوە بەسترابۆوە لە سەرەمەرگدا هەر ئەو دەهاتە سەر زمانی، بە دەیەها کەسیش بینراوە لەناو کوردەواری خۆشماندا خولیای دۆلار بوە و دۆلاری خۆشویستوە کە چوی لە سەرەمەرگدا پێت گوتوە بڵێ (لا إله إلا الله) گوتویەتی دۆلار بە چەندە و نرخەکەی لە بازاڕدا گەیشتە کوێ ناتوانێ جواب بداتەوە، بە دەیەها کەس هەیە کوتاڵ فرۆش بوە و قوماش فرۆش بوە لە سەرەمەرگدا لەگەڵ ئەوەی زمانەکەی لەسەر ئەوە ڕاهاتوە مەتری بە ئەوەنە و لە کوێیە ئێستا فڵانە جۆر قوماش و لەناکاو لەسەر ئەو حاڵ و باڵەی مردوە، یان ئەگەر گوناحکار بوبێت لەسەر گوناح مردوە.

بیستومە گەنجەکان لە گەڕەکی ئێمە و لە شوێنەکانی تریش هەیانە ئەمڕۆ خولیای مۆبایلە، گرتە پیس و ناشرین و بەدڕەوشتیەکان لەسەر مۆبایلەکانیان تۆمارە یان لە ئەنتەرنێت وەریان گرتوە و لەسەر کۆمپیوتەرەکانیان تۆمارە هەر کاتێک دەچن دەزانن لە چ فایلێک دایاننناوە، یان کە مۆبایل لێدەدەن بۆ ئافرەت و کچێک دەتانەوێت ناموسی خەڵکی شەرمەزار بکەن و ناموسیان ببەن، دەبزانن لەناکاو (ملك الموت) دێت دات دەبڕێنێت لەو شتانە، ئەگەر خۆت نەگەڕێیتەوە و تەوبە نەکەیت و لەسەر ئەو گوناحانە بەردەوام بیت بە دڵنیاییەوە ئەوکات زمانت بەوە دەگەڕێت یان باسی لەقتە فیلمە ڕوت و قوتیەکە دەکەن یان باسی گۆرانیەکە یان باسی لاعیبێک دەکەن، چەن کەس هەیە ئەمڕۆ لە پیاوان یان لە ئافرەت و ژنانیش بەداخەوە وە لە کوڕە گەنجەکانیش خولیای فڵان فەریقە و فڵان تۆپانێ و فڵان بردیەوە و فڵان چاوی منە و فڵان ڕۆحی منە هەردەم ناوی ئەوی لەسەر زمانە زۆر زیاتر لەناوی الله و پێغەمبەر (ﷺ)، بترسە لە الله لە سەرەمەرگدا ئەوت بێتەوە سەر زمان ناتوانی بڵێی (لا إله

إلا الله) ئینجا قوڕت بەسەر دەبێت ناوی هەر کافرێک بێنی لەسەر زمانت بە دڵنیاییەوە دڵت بە ئەوەوە پەیوەست بوە و خۆشت ویستوە و لە مەیدانی حەشر و حیسابدا حەشرت لەگەڵ ئەوە.

٣-ئەگەر هەر لە سەرەتاوە بە تەواوەتی ڕێگای مزگەوت و دینداری و الله پەرستی نەگریتەبەر: ماوە ماوە ئەگەر چاکیش بیت دواتر بگەڕێیەوە سەر تاوان و گوناحەکان چونکە نازانی (ملك الموت) ئاخیر جار لە چ کاتێکدایە لە کاتی تاوان و گوناحدا یان لە کاتی ڕێگای مزگەوتدا ڕێگات پێدەگرێت.

٤-لاوازی ئیمان: کەسێک ئەگەر ئیمان لاواز بێت بە ئاسانی توشی تاوان و گوناح دەبێت وە لە سەرەمەرگیشدا شەیتان فێڵی لێدەکات و ڕەنگە ئاخیر شەڕ بێت نەتوانێت لەسەر ڕێک و پێکی و لەسەر ئیمان و ئیسلام وەفات بکات و بمرێ.

**پرسێك:** چی وامان لێدەکات کە ئاخیرمان خێربێت؟

**وەڵام:** هەر لە ئێستاوە کار لە کار نەترازاوە تەمەنمان هەیە و باقینە لە پیاوان و لە کوڕان و ئافرەتان و کچان، وەرن با تەوبە بکەین و بگەڕێینەوە لای الله تعالی بەتەواوەتی و سەدا سەدی لە هەموو گوناح و تاوانەکان و بەردەوامیش بین لەسەر تەوبە کردن لە زیکر و یادی الله لە قورئان خوێندن، وە هاتوچۆی کەسە باشەکان بکەین گوێ بگرین لە وەزع و نەسیحەتەکان و قورئان بۆ خۆمان لێبدەین و بیشی خۆێنین ئینجا تێش بگەین کە چ ڕێگا و ڕێبازێک ڕاستە و لەسەری بەردەوام بین ئەو کاتە (إن شاء الله) ڕزگارمان دەبێت، و لە سەرەمەرگدا ئەگەر کەسێک وابوو الله تعالی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱستَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيهِمُ ٱلمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحزَنُواْ وَأَبشِرُواْ بِٱلجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُم تُوعَدُونَ﴾ [فصلت: ٣٠] واتە: بەڕاستی ئەوانەی گوتیان پەروەردگارمان اللهیە و لە پاشان ڕاست (لەسەر ئاین) بەردەوام بون فریشتەکان پۆل پۆل دێنە لایان (پێیان دەڵێن) لەپاشەرۆژتان

مەترسن و بۆماڵ و منداڵیشتان -پاش خۆتان- دڵ زویرمەبن، ئێمە چاودێریان دەبین وە مژدەبێ لێتان بەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێ درابو.

**پرسێك:** ئایە چەند شت هەن کە کۆتاییان پێ نایەت؟

**وەڵام:** زانایان دەفەرمون ئەو بۆچونە دروستە لەوانە إبن تيمية فەرمويەتی وە هەندێک لە زانایان لە دوو دێڕە شیعردا کورتیان کردوەتەوە دەفەرمون هەشت شتن ئەو شتانەی الله بەدیهێناون و دروستی کردون بەڵام لەناوچونیان بۆ نیە لە شیعرەکەدا هاتوە دەفەرموێ: (ثمانية حُكْمُ البقاء يعمها من الخلق والباقون في حيز العدم هي العرض والكرسي ونار وجنة وشجب وأرواح كذا اللوح والقلم[1]) واتە: هەشت شت هەن کە ئەوانە حوکمی مانەوەیان هەتا هەتاییە و مەخلوق و دروستکراون بەڵام الله تعالى بە هەمیشەیی دەیانهێڵێتەوە وە حوکمی مانەوەیان گشتیە و دەیانگرێتەوە ئەوانە هەرگیزاو هەرگیز لەناو ناچن یەکەمیان: عەرشی الله تعالى، دوەمیان: کورسی الله تعالى یە، سێیەمیان: ئاگری دۆزەخ، چوارەمیان: بەهەشتی پڕ ناز و نیعمەت، پێنجەمیان: لە کرێنچەی ئینسان شتێک هەیە الله تعالى لەوەوە مرۆڤەکانی دروستکردوە[2]، شەشەمیان: ڕۆحی مرۆڤ و گیانلەبەرەکان، حەوتەمیان: (لوح المحفوظ)یش الله تعالى دروستی کردوە هەرگیز لەناو ناچێت، هەشتەمیان: ئەو قەڵەمەش کە الله تعالى یەکەمجار دروستی کرد[3].

---

[1] تحقيق الآيات البينات في عدم سماع الأموات (ص١٤٧).

[2] هەرگیز لەناو ناچێ ئەوە، وە بۆ قیامەت و زیندوبونەوەش لەوەوە ئینسان دروست دەبێتەوە، عیلم و زانستی ئێستاش گەیشتوەتە ئەوە شتێکی یەکجار بچوکە لە کرێنچەی ئینساندا هەیە، کاتێک ئینسان دەڕزێت، ئێسکەکەی و جسمەکەی و گۆشتەکەی و دەمارەکانی و هەرهەموی لەناودەچێت و دەبێتەوە خۆڵ و گڵ بەڵام ئەو شتە بچوکە لەناو ناچێ، عیلم و زانستی ئێستا بینیویەتیەوە دەڵێ وەکو سیمکارتێک وایە، ئەگەر تەماشای بکەیت و لێی ورد بیتەوە (شتێک هەبێ و بۆت بخوێنێتەوە) شاشەیەک کامل مواسەفاتی ئەو مرۆڤەی تێدا خەزن کراوە، بەژنی چەند بوە و شێوەی چۆن بوە و پێستی چۆنە و هەموو مواسەفاتەکانی الله تعالى نوسیوێتی، ئەوەش لە گەورەیی الله دەوەشێتەوە، لەسەر ئەو مواسەفاتانە بەهێز و توانایەکی تر الله تعالى جارێکی تر ئەو مرۆڤە دروست دەکاتەوە.

[3] «اكْتُبْ. قَالَ: رَبِّ، وَمَاذَا أَكْتُبُ؟ قَالَ: اكْتُبْ مَقَادِيرَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ» حكم الحديث: صحيح، سنن أبي داود (٤٧٠٠)، سنن الترمذي (٢١٥٥) (٣٣١٩)، مسند أحمد (٢٢٧٠٥) (٢٢٧٠٧). واتە: یەکەم شتێ کە اللّٰه

جا إبن تيمية دەفەرموێ سەلەفی ئومەت زاناکان و پێشەواکانی ئومەتی ئیسلام و پێغەمبەر (ﷺ) و سەلەفی ساڵح یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەو هەشت شتەن بۆچونی دروست کە کۆتاییان پێ نایەت.

**تەوەری دووەم:** ڕۆژی دوایی و زیندوبونەوە و مەیدانی حەشر و حیساب:

**پێناسەی ڕۆژی دوایی:** لەلای هەموان ڕون و ئاشکرایە بە لەناوچونی هەموو گیانلەبەر و زیندوەکان ڕۆژی دوایی پەیدا دەبێت، کاتێک مرۆڤەکان و جنۆکەکان و ئەوانەی لەسەر ڕوی زەوین وەفات دەکەن و دەمرن دەگەڕێنەوە لای الله تعالى ئەوە یەکەم و سەرەتای بەرپابونی ڕۆژی دواییە، کە الله تعالى دەفەرموێت: ﴿كُلُّ مَن عَلَيهَا فَانٍ * وَيَبقَىٰ وَجهُ رَبِّكَ ذُو ٱلجَلَٰلِ وَٱلإِكرَامِ﴾ [الرحمن: ٢٦-٢٧] واتە: هەرچی کەس لەسەر زەوی دایە نامێنێ و تیا دەچێ * وە هەر پەروەردگارت دەمێنێ کە خاوەن شکۆی ڕێزدارە. ﴿كُلُّ شَيءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجهَهُ﴾ [القصص: ٨٨] واتە: هەموو شتێك لەناو دەچێ جگە لەزاتی الله[١].

ڕۆژی دوایی کە دێت الله تعالى ئاسمانەکان و زەوی و ئەستێرەکان و هەموو شتەکان لەناو دەبات وە مرۆڤ و جنۆکەکانیش بە هەمان شێوە تەنانەت فریشتەکانیش مردنیان بۆ هەیە لەسەر بۆچونی دروستی ئەهلی سونە و جەماعە و لە شوێنی خۆیدا باسی دەکەین کە کەس نامێنێت لەسەر ڕوی زەوی لە ئاسمانەکانیش مەگەر الله ئەو کەسەی بیەوێ بیهێڵێتەوە.

## کاتی ڕۆژی دوایی:

الله تعالى ئێمەی دڵنیا کردوەتەوە دەبێ بڕوامان وابێت ڕۆژی دوایی هەر دێت بەڵام چ کاتێکە لێمان دیار نیە، یەکێکە لە ڕوکنەکانی ئیمان ڕۆژی دوایی، دەبێت بیروبڕوات وابێت کە هەر بەرپا دەبێت و دێت بەڵام کاتەکەی لە ئێمە دیار نیە وەکو الله تعالى دەفەرموێ: ﴿لَّيسَ ٱلبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُم قِبَلَ ٱلمَشرِقِ وَٱلمَغرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلبِرَّ مَن ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱليَومِ ٱلأٓخِرِ وَٱلمَلَٰٓئِكَةِ

---

تعالى دروستی کرد قەڵەم بوو، فەرمووی: بنوسە، گوتی پەروەردگارم چی بنوسم؟ فەرمووی: قەدەر و ئەندازەگیری هەموو شتێ هەتا ڕۆژی قیامەت.

[١] ئیلا هەشت شتەکە نەبێت کە لە پێشودا باسمان کرد.

وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ [البقرة: ١٧٧] واتە: چاکە ئەوە نیە کە ڕو بکەنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەڵکو چاکە ئەوەیە کە مرۆڤ بڕوای ببێ بە الله و ڕۆژی دوایی و فریشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەران.

﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ وَٱلۡمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱلۡمُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ أُوْلَٰٓئِكَ سَنُؤۡتِيهِمۡ أَجۡرًا عَظِيمًا﴾ [النساء: ١٦٢] واتە: باوەڕدارەکان بڕوایان هەیە بەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ وە بەوەش پێش تۆ نێردراوەتە خوارەوە، وە بەجێ هێنەرانی نوێژ و زەکات دەران و باوەڕداران بە الله و بە ڕۆژی دوایی ئەوانە لە داهاتویەکی نزیکدا پێیان دەبەخشین پاداشتێکی زۆر گەورە.

﴿ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ [الروم: ١١] واتە: الله خۆی ئەو خەڵکە دروست دەکات و دواجاریش دەیهێنێتەوە گۆڕێ و بەتەنیا و بێهاوەڵ و یارمەتیدەر پاشان بۆ لای ئەو (الله) دەگەڕێنەوە.

﴿وَيَوۡمَ يُرۡجَعُونَ إِلَيۡهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُواْ﴾ [النور: ٦٤] واتە: ئەو ڕۆژەش کە دەگەڕێنرێنەوە لای الله ئەوسا ئاگاداریان دەکاتەوە بەو کردەوانەی کردویانە.

﴿وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞۖ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ﴾ [الحجر: ٨٥] واتە: وە بێگومان ڕۆژی دوایی دێت تۆش بەجوانی چاوپۆشی بکە لێیان.

﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ [غافر: ٥٩] واتە: بەڕاستی ڕۆژی دوایی دێت هیچ گومانی تێدا نیە بەڵام زۆربەی خەڵکی باوەڕ ناکەن.

﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ﴾ [النساء: ٨٧] واتە: هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لە الله، سوێند بە الله بێگومان کۆتان دەکاتەوە بۆ (لێپرسینەوەی) ئەو ڕۆژی دواییەی کە هیچ گومانی تێدا نیە.

﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا * فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا * فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا * فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا * إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٞ * وَإِنَّ ٱلدِّينَ لَوَٰقِعٞ﴾ [الذاريات: ١-٦] واتە: سوێند بەو بایانەی تۆز و پوش و تۆوی گیاکان بڵاودەکەنەوە بە بڵاوکردنەوە * ئینجا سوێند بەو هەورانەی کە هەڵگری بارانن * ئینجا سوێند بەو کەشتیانەی کە بەئاسانی دەگەڕێن لەناو دەریادا * ئینجا سوێند بەو فریشتانەی کار دابەشکەرن، دیارە فریشتەکان هەر کۆمەڵەیان کارێکیان پێ سپێردراوەو لە سنوری خۆیاندا پێی هەڵدەسن * بێگومان هەر بەڵێنێ کە پێتان دەدرێ ڕاستە * وە بەڕاستی (ڕۆژی) پاداشت و تۆڵە ڕوودەدات.

﴿وَٱلطُّورِ * وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ * فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ * وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ * وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ * وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ * إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٞ * مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٖ﴾ [الطور: ١-٨] واتە: سوێند بە کێوی طور * سوێند بەکتێب و نامەیەکی نوسراو، تەورات، یان قورئان، یانامەی کردەوەکان، یا لەوحولمەحفوز * کە لە لاپەڕەی تەنگی گرنگدایە، کە لە سەرەتادا قورئان لەو شتانە ئەنوسرایەوە * وە سوێند بەو ماڵە ئاوەدانە، کە لە ئاسمانی حەوتەمدایە و فریشتەکان تەوافی دەکەن هەروەك لە زەویدا خەڵکی تەوافی کەعبە دەکەن[1] * وە سوێند بەبانی بڵندکراو واتە ئاسمان * وە سوێند بە دەریای پڕ لە ئاو یان دەریای داگیرساو * کە بێگومان سزای پەروەردگاری تۆ (ئەی موحەممەد (ﷺ)!) هەر پێش دێت * هیچ ڕەتکەرەوەیەکیشی بۆ نیە، کەس ناتوانێ بەریبگرێ.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَأۡتِينَا ٱلسَّاعَةُ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأۡتِيَنَّكُمۡ﴾ [سبأ: ٣] واتە: بێ باوەڕان گوتیان: ڕۆژی دواییمان بەسەردا نایەت (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ (وانیە) سوێند بە پەروەردگارم ئەو (قیامەتە)تان بۆ دێ.

[1] لە فەرموودەدا هاتوە کە شەوی میعراج پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرمویەتی: پاش ئەوەی کە لە ئاسمانی حەوتەمدا تێپەریم «ثم رفع بي إلى البيت المعمور، وإذا هو يدخله في كل يوم سبعون ألفا لا يعودون إليه آخر ما عليهم» صحيح البخاري (٣٢٠٧) (٣٣٩٣) (٣٤٣٠)، صحيح مسلم (١٦٤) (١٦٨)، سنن الترمذي (٣١٣٠) (٣٣٤٦). پاشان بەرزکراوەتەوە بۆ (بيت المعمور) کەچی دی هەموو ڕۆژێک حەفتا هەزار فریشتە دەچتە ناویەوە بۆ تەواف و جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆ تەوافکردنی، واتە: هەریەک جاریان بەردەکەوێت.

﴿إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ﴾ [لقمان: ٣٣] واتە: بێگومان بەڵێنی الله حەق و ڕاستە کەواتە با ژیانی دونیا هەڵتان نەخەڵەتێنێ وە با شەیتانی فریودەر بە (بیانوی بەزەیی و لێبوردنی) الله نەتان خەڵەتێنێ.

**پرسێك:** ئایە ڕۆژی دوایی هاتنی نزیکە یان دورە؟

**وەڵام:** بەڵێ قیامەت زۆریش نزیکە الله تعالی دەفەرموێ: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾ [القمر: ١] واتە: ڕۆژی دوایی نزیك بویەوە وە مانگ لەت بوو.

﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ [النحل: ١] واتە: ئەوە فەرمانی الله (بە سزادانیان) هات بۆیە پەلە مەکەن (لە هاتنی).

﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ * مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ إِلَّا ٱسۡتَمَعُوهُ وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ * لَاهِيَةٗ قُلُوبُهُمۡ﴾ [الأنبياء: ١-٣] واتە: لێپرسینەوەی خەڵکی نزیك بۆتەوە بەڵام ئەوان لە بێ ئاگایی و غەفڵەتدا پشت تێکەر و ڕوو وەرگێڕن لە ئاینی الله * هەر پەیامێکی تازەیان لە پەروەردگاریانەوە بۆ بێت (کە قورئانە) ئەوان دەیبیستن و گاڵتەی پێ دەکەن * دڵەکانیان بێ ئاگایە.

﴿وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖ﴾ [الحشر: ١٨] واتە: وە هەموو کەسێك با سەرنج بدات (بزانێ) چی پێش خۆی ناردوە بۆ پاشەڕۆژی.

﴿إِنَّهُمۡ يَرَوۡنَهُۥ بَعِيدٗا * وَنَرَىٰهُ قَرِيبٗا﴾ [المعارج: ٦-٧] واتە: کافران ئەم ڕۆژە کە ڕۆژی قیامەتە بەدوری ئەزانن * ئێمەش زۆر بە نزیکی دەبینین، یاخود باوەڕداران وای ئەبینن کە ئەمە ڕۆژێکی نزیکە لەبەر ئەوەی هەر شتێك کە بێت ئەوا نزیکە و ئیلا ڕو ئەدات.

پێغەمبەریش (ﷺ) لە نزیکی هاتنی قیامەت ئاگادارمان دەکاتەوە لە چەندین فەرموودەدا هاتوە دەفەرموێ: «إِنَّمَا أَجَلُكُمْ فِيمَا خَلَا مِنَ الْأُمَمِ كَمَا بَيْنَ صَلَاةِ الْعَصْرِ إِلَى مَغَارِبِ الشَّمْسِ[1]» واتە:

[1] صحيح البخاري (٥٥٧) (٢٢٦٨) (٢٢٦٩)، سنن الترمذي (٢٨٧١)، مسند أحمد (٤٥٠٨) (٥٩٠٢) (٥٩١١).

ماوەی ژیانی دونیاتان لە ماوەی ژیانی ئومەتانی پێش خۆتان وەک ماوەی نێوان نوێژی عەسر و خۆرئاوابونە.

لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «إِنَّمَا بَقَاؤُكُمْ فِيمَا سَلَفَ قَبْلَكُمْ مِنَ الْأُمَمِ، كَمَا بَيْنَ صَلَاةِ الْعَصْرِ إِلَى غُرُوبِ الشَّمْسِ[١]» واتە: ماوەی مانەوەی ئێوە لەچاو مانەوەی ئەو نەتەوانەی تردا کە لە پێش ئێوەوە لە جیهاندا بون بەقەد نێوان نوێژی عەسر و خۆرئاوابونە.

لە فەرمودەیەکی تردا فەرمویەتی: «بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ[٢]» واتە: من و کۆتا زەمان بە یەکەوەین و لە یەک نزیکین وەک ئەو دوو پەنجەیە.

**پرسێك:** ئایە کاتی دیاریکراوی قیامەت زانراوە؟

**وەڵام:** ئەو پرسیارە جوبڕائیل لە پێغەمبەری پێشەوای کرد (ﷺ) کە جوبڕائیل پێی فەرموو لەو فەرمودە دورو درێژەی کە ئیمامی عومەر دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پیاوێک هات ئاسەواری سەفەر و گەشتی پێوە دیار نەبوو وە موەکانی ڕەش بوو جل و بەرگ کەی ڕەشبوو تۆزی سەفەری لەسەر نەنیشتبوو، نەیشمان دەناسی لەناو کۆمەڵی سەحابیان. چۆکی بە چۆکی پێغەمبەرەوە نا (ﷺ)، لە ڕیوایەتێکی تر دەڵێ دەستەکانی لەسەر ڕانەکانی خۆی دانا، و لە یەکێکی تر دەڵێ لەسەر ڕانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) داینا، چەند پرسیارێکی ئاراستەی پێغەمبەر(ﷺ) کرد فەرموی ئیمان چیە ئیسلام چیە ئیحسان چیە یەکێکیش لە پرسیارەکان ئەوەبوو فەرموی: «فَأَخْبِرْنِي عَنِ السَّاعَةِ، قَالَ: مَا الْمَسئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ[٣]» پێم بڵێ کەی رۆژی دوای دێت پێغەمبەر (ﷺ)، فەرموی: من زاناتر نیم لەو کەسەی کە پرسیار دەکات کە تۆی.

[١] صحيح البخاري (٥٥٧) (٢٢٦٨) (٢٢٦٩)، سنن الترمذي (٢٨٧١ )، مسند أحمد (٤٥٠٨) (٥٩٠٢) (٥٩١١).

[٢] صحيح البخاري (٦٥٠٥)، سنن ابن ماجه (٤٠٤٠).

[٣] صحيح مسلم (٨)، سنن أبي داود (٤٦٩٥)، سنن الترمذي (٢٦١٠).

الله تعالى ش له قورئاندا فه‌رمویه‌تی ئه‌وه یه‌کێکه له پێنج شته غه‌یب و نادیاره‌کان له‌لای خۆی هێشتویه‌تیه‌وه که ده‌فه‌رموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي﴾ [الأعراف: ١٨٧] واته: ئه‌ی موحه‌ممه‌د (ﷺ) پرسیارت لێ ده‌که‌ن له باره‌ی ڕۆژی دواییه‌وه که‌ی ده‌بێت بڵێ زانینی ئه‌وه ته‌نها لای په‌روه‌ردگارمه.

﴿يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ [الأحزاب: ٦٣] واته: ئه‌ی موحه‌ممه‌د (ﷺ) خه‌ڵك پرسیارت لێ ده‌که‌ن ده‌رباره‌ی (به‌رپابونی) ڕۆژی دوایی بڵێ زانینی (به‌رپابونی) ئه‌و ڕۆژه ته‌نیا لای اللهیه.

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا * فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ * إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ * إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا﴾ [النازعات: ٤٢-٤٥] واته: پرسیارت لێ ده‌که‌ن ده‌رباره‌ی ڕۆژی دوایی که چ کاتێ ڕوئه‌دا؟ * جا تۆ چیته له باسکردنی ئه‌و ڕۆژه؟ واته تۆ هیچی لێ نازانیت * زانینی ئه‌وه هه‌ر لای په‌روه‌ردگارته * بێگومان تۆ هه‌ر ترسێنه‌ری که‌سێکیت که‌له‌و ڕۆژه بترسێ.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي ٱلْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌۢ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ [لقمان: ٣٤] واته: به‌ڕاستی ته‌نها لای اللهیه زانیاری (کاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی وه هه‌ر الله باران ده‌بارێنێ ته‌نها الله ده‌زانێ به‌وه‌ی له منداڵدانی (دایکان)دایه وه هیچ که‌س نازانێ سبه‌ینێ (له داهاتودا) چی ده‌کات وه هیچ که‌س نازانێ له چ شوێن و زه‌ویه‌کدا ده‌مرێ به‌ڕاستی الله زانا و ئاگاداره.

**پرسێك:** بۆچی کاتی دیاریکراوی هاتنی ڕۆژی دوایی له ئێمه‌ی مرۆڤ دیار نیه و حیکمه‌ت تێیدا چیه؟

**وه‌ڵام:** زانایانی فه‌رمویانه دیارینه‌کردنی هاتنی ڕۆژی دوایی په‌یوه‌ندی به خودی مرۆڤه‌کان و ده‌رونیانه‌وه هه‌یه، به‌رپابونی نادیاره له ئێمه‌ی مرۆڤ چونکه کار و ڕوداوێکی مه‌زنه بۆ مرۆڤ که دێته پێش، ئه‌وانه‌ی که ئیمانیان هه‌یه به فه‌رموده‌ی الله و پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) دڵنیان که ئه‌و ڕۆژه هه‌ر دادێت بۆ ئه‌وانه ده‌بێته مایه‌ی ئه‌وه‌ی هه‌رده‌م له چاوه‌ڕوانیدابن هه‌موو

ڕۆژێک و لەحزە و چرکەیەکی ژیانیان لە ئامادە باشیدابن هەوڵبدەن گوناح و تاوان نەکەن، تا هەر کاتێک لە هەر چرکە و لەحزەیەکی ژیانیاندا ئەگەر مردنەکە هات یان ڕۆژی دوایی بەرپا بوو ئەوان لەوپەڕی ئامادەبوندا بوبن و لە گوناح و تاواندا نەژیابن.

سەید قوتب -رحمە الله- الله بە شەهید قبوڵی بکات دەفەرموێ: بزری و نهێنی شتێکی بنەڕەتی و ئەساسیە لە ژیانی مرۆڤدا، زۆر شت هەیە لە مرۆڤدا ونە لە پێکهاتەی دەرونی مرۆڤدا ونە، هەر دەبێ بزری و ونیەک هەبێ لە ژیانی مرۆڤەکان تاوەکو بۆی بڕوانن و چاوەڕوانی بن، ئەگەر هەموو شتێک ئاشکرا بوایە بۆ مرۆڤەکان ئەوانیش لەسەر ئەو سروشت و فترەتە بونایە ئەوە چالاکیەکانیان دەوەستا و کۆنکریت دەبو، بەدوای ونبوو نەزانراوەکەدا نەدەڕۆیشتن و ڕاو سەرنجیان نەدەدا و تێی ڕانەدەمێنان و چاوەڕوانیان نەدەکرد هەردەم لە ئاگاداریبوندا نەدەبون، ئومێدیان بۆ نەدەما، کە تەجروبە و ئەزمونگەریەکان بکەن لە دەوروبەریان و ئەو شتانەی لەگەڵی دەژین لە بونەوەردا، جا هەموو شتەکانیان پێ نەدەکرا ئاشکرا بکەن لە وزە ونبوەکانیان ئەو تاقەت و هێزەیان هەبوایە کە بەدواداچونی بۆبکەن تەجروبە و ئەزمونگەریەکان لە شتەکان بهێننەجێ و چونکە دەترسان و ئەژنۆیان دەشکا دەیانگوت ئەوە ڕۆژێکی دیاریکراو هەیە ئەگەر بڕواشیان پێی هەبوایە لە فلان سەعات و فلان کاتژمێر و فلان ڕۆژ و فلان ساڵ و فلان مانگ ڕۆژی دواییە و کۆتایی پێ دێت، ئێمە بۆ خۆمان ماندو بکەین بەو شێوەیە زەوی ئاوەدان بکەینەوە و ئەوە ئەنجام بدەین یان ئەو شتە ئاوا لێبکەین لەبەر ئەوە الله تعالى هاتنی ڕۆژی دوایی ون کردوە و بزری کردوە و بەدیاری نەخستوە بۆ هیچ کەسێک تەنانەت بۆ پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) بۆ فریشتە زۆر نزیکەکانی خۆشی وە هیچێکی تر و کەسێکی تریش لە مرۆڤەکان عیلم و زانستی نیە بە کاتی دیاریکردنی هاتنی ڕۆژی دوایی[1].

[1] اليوم الآخر في ظلال القرآن، جمع وإعداد/ أحمد فائز: ص ٩٨.

کەواتە بەڵێ هەردەم بڕوادار لە ئامادەباشیدا دەبێ و کردەوەی چاک دەکات و بە ئومێدی ئەوەیە ڕۆژی دوایی و قیامەتی لێ دابێت و ئەو کاتەی کە لێی داهات بیباتەوە و سەرفراز و سەرکەوتوبێت، ئەو کەسەشی کە بایەخ بەو شتە نادا و لەلای ون و بزرە و گوێشی پێ نادات کە ڕۆژی قیامەت دێت یان نا ئەویش لە ناکاودا تێ دەکەوێت و ئەو ڕۆژەی بەسەردا دێت و تۆڵەی لێ دەستێندرێتەوە.

**پرسێك:** ئایە دروستە مرۆڤ خۆی سەرقاڵ بکات بە دیاریکردن و هاتنی ڕۆژی دوایی قسەی لێبکات؟

**وەڵام:** الله تعالى لە قورئانی پیرۆز بە ئایەتی ڕاشکاوانە بڕاندویەتیەوە عیلم و زانستیەکەی تەنها لای اللهیە کاتی دیاریکراوی هاتنی ڕۆژی دوایی وە پێغەمبەریش (ﷺ) بە هەمان شێوە لە فەرموودە سەحیحەکانیدا ئەوەی بڕاندوەتەوە بۆمان، کەواتە سنور دیاریکراوە و بۆت نیە لەو سنورە تێپەڕ بکەیت و بیریشی لێ بکەیتەوە و خۆشتی پێوە سەرقاڵ بکەیت و بەدواداچونی بۆ بکەیت ئایە بۆت دەرکەوێ چ ڕۆژ و کاتێک و مانگێک و ساڵێک ڕۆژی دوایی دێت و ڕوددەدات، گرنگ ئەوەیە خۆتی بۆ ئامادە بکەیت و یەقین و دڵنیا بیت ڕۆژێک هەر دادێت و ڕوددەدات ئەگەر تۆش نەیبینی مردنی خۆت و قیامەتی خۆت کە بە مردنەکەتە و گەڕانەوەیە بۆلای الله تعالى لێت بەرپا دەبێ و دوایش دونیا هەر تێکدەچێ و قیامەت هەر دادێت، ئەوەتا الله تعالى دەفەرموێ: ﴿يَسۡـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِۚ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا﴾ [الأحزاب: ٦٣] واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) خەڵك پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی (بەرپابونی) ڕۆژی دوایی بڵێ زانینی (بەرپابونی) ئەو ڕۆژە تەنیا لای اللهیە تۆ چوزانیت لەوانەیە ڕۆژی دوایی نزیك بێت (بەڵام خەڵك) نازانن.

﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرۡسَىٰهَا * فِيمَ أَنتَ مِن ذِكۡرَىٰهَآ * إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ * إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخۡشَىٰهَا﴾ [النازعات: ٤٢-٤٦] واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) پرسیارت لێ ئەکەن کەی ڕۆژی قیامەت دێت؟ * ئەی موحەممەد (ﷺ) تۆ هیچ زانیارییەکت پێ نیە سەبارەت بە هاتنی

ڕۆژی قیامەت * زانینی ئەوە هەر لای پەروەردگارتە * تەنها ئیشی تۆ ئەوەیە هەر کەسێك لەو ڕۆژە بترسێ تۆ ئاگاداری بکەیتەوە و بیانترسێنی لە سزای الله تعالی لەو ڕۆژەدا.

وە پێغەمبەریش وەکو باسمانکرد فەرمویەتی: «فَأَخْبِرْنِي عَنِ السَّاعَةِ، قَالَ: مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ[1]» واتە: جوابرئیل گوتی پێم بڵێ کەی رۆژی دوایی دێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی من زاناتر نیم لەو کەسەی کە پرسیار دەکات کە تۆی.

کەواتە ئێمە لەسەرمانە بەدوای حەدیسی سەحیحی پێغەمبەر (ﷺ) بکەوین بیریش نەکەینەوە لەوەی ئایە بەدواداچون بکەین یان نا بۆ دیاریکردنی هاتنی ڕۆژی دوایی، هەر ئەوەندەمان لەسەرە دڵنیابین ئەو ڕۆژە بەرپا دەبێت و دێت بەدڵنیایەوە و ئیمانمان پێی هەبێ.

بەڵێ ڕاستە هەندێک لە زانایان لە ئیجتیهاد و کۆشش کردنەکەیان هەڵەیان کردوە لە ئەهلی سونە و جەماعەدا لەوانە دوو زانا زۆر ئاشکرا و دیارن ئیمامی (تەبەری و ئیمامی سیوطی- رحمهم الله-) هەموو زانایەکانی ئەهلی سونە و جەماعە ئەو دوانەیان بە هەڵە داناوە کە هەوڵیان داوە هاتنی ڕۆژی دوایی دیاری بکەن، کە دیاریشیان کرد بەو شێوەیەش دەرنەچو نەهاتە پێشیش.

خەڵکانێکیش هەبونە لەوانە ئیبنو عەرەبی کە بڕوای بە وەحدەتول وجود هەبوە قسەیەکی زۆر نارێک و نالەباری هەیە بۆ دیاریکردنی ئەو ڕۆژانە، زانایان زۆر بە جوانی ڕەدیان داوەتەوە و زۆربەی قسەکانیش نەهاتوەتەجێ و واقیعەن ڕوی نەداوە، ئەوەی پوچەڵ کردوەتەوە کە ڕۆژی قیامەت دیاریکردنی زانراوبێ لەلای هیچ مرۆڤ و کەسێک ئەگەر هەوڵ و کۆششیش بکات بۆ دیاریکردنەکەی، وە پێشەوا سوهەیلیش بە پیت و حەرفە موقەتەعەکانی سەرەتاکانی سوڕەتەکانی قورئانی پیرۆز لێکدانەوەی کردوە و چەند سەد ساڵێکی دانابوو بەڵام هی ئەویش تێپەڕی و نەهاتەجێ و قیامەت بەرپا نەبو[2].

[1] صحيح مسلم (٨)، سنن أبي داود (٤٦٩٥)، سنن الترمذي (٢٦١٠).

[2] المقدمة لابن خلدون: ص ٥٩١.

الدكتور عمر بن سليمان الأشقر سەبارەت بە ئەوەی ئیمامی تەبەری کە فەرمویەتی لە دوای پێنج سەد ساڵ دوای هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) قیامەت ڕوودەدات، ئێستا نۆ سەد ساڵیش زیاتر بەسەر ئەو قسە و دیاریکردنەی ئیمامی تەبەریدا ڕۆیشتو هێشتا قیامەت بەرپا نەبو، بەڵکو هەندێک لە نیشانەکانی هاتنی قیامەت لە بچوکەکانیش ماوە تەواو بەرپا ببێت نەک نیشانە گەورەکان کە هیچیان لێ ڕونەداوە[1].

کەواتە بۆمان نیە دیاری بکەین ئەو ئیمامە بەڕێزە لەو خاڵەدا هەڵەی کردوە ئەگەرنا زانایەکی سەنگینە و یەکەم موفەسیری قورئانە کە قورئانی تەفسیری کردبێ لە (فاتیحەوە هەتا سورەتی الناس) بە نوسینەوە و ڕیوایەتەکان و هەموو موفەسیرینی تر لەدوای ئەو تەفسیریان لە ئەو وەرگرتوە وەکو مەسدەر و سەرچاوە بەکاریان هێناوە.

ئیمامی سیوطیش لە پەرتوکێکدا بەناوی-الكشف- دەفەرموێ قیامەت لە سەد ساڵی پێنجەمی پاش هەزار پەیدا دەبێت لەگەڵ ئەوەدا بە دەیەها ساڵ دوای قسەکەی ئیمامی سیوطی ئەوە ڕۆیشت و قیامەتیش بەرپا نەبوو[2]، لە پاشان خەڵکانێکی تر هەبوە لەوانە بەهائی گوتویانە بەڵکو قیامەت بەرپا دەبێت و دێت لە ساڵی (١٧١٠) ئەوە ساڵی (١٧١٠) هات و ڕۆیشت بەرپا نەبوو نەهات.

کەواتە باشترین ڕێگا ئەوەیە کە إبن تيمية-رحمه الله- دەفەرموێ: (ومن تكلم في وقتها المعين مثل الذي صنف كتاباً سماه -الدر المنظم في معرفة الأعظم- وذكر فيه عشر دلالات بين فيها وقتها، والذين تكلموا على ذلك من حروف المعجم، والذي تكلم في عنقاء مُغْرب[3]، وأمثال هؤلاء، فإنهم وإن كان لهم صورة عظيمة عند اتباعهم، فغالبهم كاذبون مفترون[4]، وقد تبين لديهم من وجوه كثيرة أنهم يتكلمون بغير علم، وإن ادعوا في ذلك الكشف ومعرفة الأسرار،

[1] كتاب القيامة الصغرى [عمر سليمان الأشقر] ص: ١٢٢.

[2] لوامع الأنوار البهية: (٢/٦٦).

[3] هو ابن عربي القائل بوحدة الوجود.

[4] قال الشيخ: (غالبهم) لأن بعض الذي بحثوا في ذلك أخطؤوا، ولم يقصدوا التضليل، أمثال الطبري والسيوطي رحمهما الله.

وقد قال تعالى: ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُواْ بِاللهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ [الأعراف: ٣٣][1])

واتە: هەرکەسێک قسەی کردبێ لەسەر دیاریکردنی کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوە هەڵەی کردوە بۆ نمونە ئەو کیتابە -الدُّرَّ الْمُنَظَّمَ فِي مَعْرِفَةِ الْأَعْظَمِ- کە دانراوە لەلایەن إبن عربي دەڵێ هەڵەی کردوە و قسەکانی هەموی ناڕاست دەرچون و تێکی نەکردەوە لەگەڵ واقیع ئەگەر لەلای شوێنکەوتوەکانی زۆر بە گەورە و مەزنیش دادەنرا و پێشتر زۆر بایەخی پێدەدرا ئەوە واقیعەن نەهاتەجێ و زەمەنیشی بەسەردا ڕۆیی چۆن دەڵێی ئەو قسە ڕاستە، چ بە حەرفە موقەتیعەکان لێکدانەوەی بۆ بکەی، یان بە هەر بیروبۆچونێکی تر بەدواداچونی بۆ بکەیت و دیاری بکەیت بڵێی لەو کات و زەمەنە ڕۆژی دوایی دادێت بەهەڵەدا چوی و تێکت نەکردوەتەوە لەگەڵ قورئانی پیرۆز کەواتە بوختانیان کردوە بە الله تعالى[2]، ئەگەر بە نەزانینەوە بێت موجتەهید بوبن وەکو (ئیمامی تەبەری، ئیمامی سیوطی، ئیمامی سوهەیلی) ئەوانە ئێمە گومانی باشیان پێ دەبەین دەڵێین ئیجتیهادەکەیان غەڵەت بوە -إن شاء الله- ئەجر و پاداشتێکیان هەیە بەڵام خەڵکانی تر کە جێی گومانی باش نین دەبێ ئێمە پێیان بڵێین ڕاست نیە و بۆتان نیە قسە بکەن لەو ڕۆژ و دیاریکردنە چونکە الله تعالى فەرمویەتی: ﴿قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلۡإِثۡمَ وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ [الأعراف: ٣٣] واتە: بڵێ بێگومان پەروەردگارم تەنها ئەو کردەوانەی حەرام کردوە کە زۆر بەد و خراپن ئەوانەی کە ئاشکران و ئەوانەش نهێنین وە گوناحی (حەرام کردوە) وە دەست درێژی بە ناهەق وە (حەرامی کردوە) شتێك بکەنە هاوبەش بۆ الله کە بەڵگەی بۆ نەهاتوە وە (حەرامی کردوە) کە بەدەم الله وە شتانێك بڵێن کە نایزانن.

[1] مجموع الفتاوى ج: ٤ ص: ٣٤٢

[2] ئەوە إبن عربي یيە کە قائیلە بە وحدة الوجود.

وه الدكتور عمر بن سليمان الأشقر دهفەرموێ: (ولا شك أن دعوى معرفة وقتها المحدد قول بلا علم[1]) واتە: وە بێگومانیش هەرکەسێک بڵێ من دەزانم لە چ ڕۆژێک هەوڵم داوە دیاری بکەم قیامەت دادێت و بەرپا دەبێت سەدا سەد تەحدیدی بکات ئا ئەو کەسەش بەبێ عیلم و زانیاری قسەی کردوە لەو شتانەی الله تعالی قەدەغەی لێکردوە قسەی لێبکرێ.

## ڕونکردنەوەیەک لەسەر ئەو فەرمودانەی کە هەستی ئەوەیان لێدەکرێت ڕۆژی دواییان دیاری کردبێ:

ابن قيم الجوزية لەسەر ئەو حەدیسە «وأنها سبعة آلاف سنة، ونحن في الألف السابعة[2]» واتە: تەمەنی دونیا حەوت هەزار ساڵە ئێمەش وا لە هەزارەمین ساڵی حەوتەمداین، دەفەرموێ: (وهذا من أبين الكذب، لأنه لو كان صحيحاً لكان كل أحد عالماً أنه قد بقي من وقتنا هذا مئتان واحد وخمسون سنة أي في الوقت الذي كان يكتب فيه الشيخ ابن القيم مؤلفه[3]) واتە: ئەوە ئاشکراترین درۆیە ناڕاستە و نادروستە، ئەگەر وابێت هەر یەکێک لە ئێمە دەزانین کەواتە دوو سەد و پەنجا ساڵێک ماوە بژین و دوایە دونیا تێک دەچێ.

ئێستاش نزیکەی چوارسەد ساڵ بەسەر ئەو قسەدا تێپەڕبوو وە ئێمە هەر دەژین و قیامەت هێشتا بەرپا نەبوە و بەڵکو یەکێک لە نیشانە گەورەکانیش بەدی نەهاتوە، کەواتە بۆمان نیە قسەی لێبکەین و ئەوە ڕاست و دروست نیە.

## زانایان بەم شێوەیە ئیشکالەکەیان تێدا چارەسەر کردوە:

١.عەبدوڵای کوڕی عومەر -رضي الله عنهما- دەفەرموێ: «صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ذَاتَ لَيْلَةٍ صَلاَةَ الْعِشَاءِ فِي آخِرِ حَيَاتِهِ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ فَقَالَ: أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ؟ فَإِنَّ عَلَى رَأْسِ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لاَ يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَحَدٌ[4]» واتە: شەوێکیان پێغەمبەری الله (ﷺ)

---

[1] كتاب القيامة الصغرى [عمر سليمان الأشقر] ص: ١٢٣.

[2] ابن القيم، المنار المنيف (٦٨)، موضوع.

[3] المنار المنيف، لابن القيم: ص ٨٠.

[4] صحيح مسلم (٢٥٣٧)، صحيح البخاري (١١٦) (٥٦٤) (٦٠١)، سنن أبي داود (٤٣٤٨).

لە کۆتایی ژیانیدا بەرنوێژی نوێژی عیشای بە کۆمەڵ بۆ کردین، کاتێ کە سەلامی دایەوە هەستایەوە فەرموی: پێتان نیشاندەم ئەم شەو ئەوەی من بینیم و زانیم؟ هەریەکێ لە ئێوە کە ئەم شەو لەم مزگەوتەدا ئامادەیە سەد ساڵی تر کەستان نامێنێ بەسەر ئەم زەویەوە هەموتان دەمرن.

جا زانایان دەفەرمون ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی واتە لەهەر قەرنێک خەڵکەکە لەناو دەچێ، بەڵێ ئەوەش هاتوەتەجێ و تەواوە و دروستە و قیامەتی بچوکی خەڵکەکە پەیدا دەبێت، کە یەکێک لە موستەڵەح و زاراوەکانی مردن بۆ هەرکەسێک کە پەیدا دەبێت قیامەتی تۆ بەرپا بوو واتە قیامەتە بچوکەکەت بە مردن لە دونیا دادەبڕێی، تەواو ئەوەڵ مەنزڵگاتە بۆچونت بۆ قیامەت و ئاخیرەتی یەکجارەکی و جارێکی تر ناگەڕێیتەوە دونیا، مەبەستی پێغەمبەریش (ﷺ) هەر ئەوە بوە، بەڵێ لە هەر سەد ساڵێک خەڵکی ئەو سەد ساڵە زۆربەی هەرە زۆریان نامێنن و وەفات دەکەن و دەمرن، تەمەنی ئێمە پێغەمبەر (ﷺ) دیاریکردوە و دەفەرموێ: «أعمارُ أمَّتي ما بينَ السِّتِّينَ والسَّبعينَ وأقلُّهم من يجوزُ ذلِكَ[1]» واتە: تەمەنی ئومەتی من لەنێوان شەست تا حەفتا ساڵە وە کەمیان هەیە لە حەفتا ساڵی تێپەڕ بکەن.

ئێمەش وا بە چاوی خۆمان دەیبینین بەڵێ زۆربەی تەمەنی ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) بە تایبەت لە فیتنە و ئاشوب و حادیسە و ڕوداوەکانی ئێستای سەردەم ئاژاوە و کوشتنکاریەکان ئێستا هەر زۆر چاک لێمان ئاشکرایە زۆربەی خەڵکەکە لە تەمەنی گەنجی و منداڵیدا دەمرێ و دەگەڕێتەوە لای الله تعالی نەک بگاتە شەست ساڵی و حەفتا ساڵی، تاک و لۆکێک هەیە ڕەنگە تەمەنی لە حەفتا ساڵی بگاتە (سەد) و هەشە جاروبارێکە ئەگەر بوو لە (سەد) ساڵی ڕەد بکات، کەواتە ئەو فەرمودە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە هەر سەدەیەک خەڵکی ئەو سەدەیە نامێنن، ئێستا سەدەکەی ئێمە کە ئێمە تێیدا دەژین بە دڵنیاییەوە دوای حەفتا ساڵی تر

[1] هذا حديث حسن غريب من حديث محەمەد بن عمرو، عن أبي سلمة، عن أبي هريرة، عن النبي صلى الله عليه وسلم، لا نعرفه إلا من هذا الوجه، وقد روي عن أبي هريرة من غير هذا الوجه. حكم الحديث: حسن، سنن الترمذي (٣٥٥٠)، سنن الترمذي (٢٣٣١)، سنن ابن ماجه (٤٢٣٦).

ئەوپەڕی سەد ساڵی تر ئەوەی لەو مزگەوتە دانیشتوە ئەگەر قیامەتی گەورەی بەرپا نەبێ قیامەتی بچوکی خۆمانمان لێ دادێت و هەمومان ڕەش بوینەوە و ژێر خاک کراینە و لە خزمەت الله تعالی ین، یان ڕۆحمان لە بەهەشتدایە یان لە ئاگری دۆزەخ و عەزاب و ئاگردایە.

عەبدوڵای کوڕی عومەر دەفەرموێ: « فَوَهَلَ النَّاسُ فِي مَقَالَةِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) تِلْكَ فِيمَا يَتَحَدَّثُونَ عَنْ هَذِهِ الْأَحَادِيث عَنْ مِائَةِ سَنَةٍ، وَإِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): لَا يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ الْيَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ. يُرِيدُ بِأَنْ يَنْخَرِمَ ذَلِكَ الْقَرْنُ[1]» خەڵکەکە بە هەڵە لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەری الله (ﷺ) تێگەیشتن وا حاڵی بوو بون کە فەرمویەتی سەد ساڵی تر قیامەت بەرپا دەبێ، پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی ئەوەبوو تەمەن کورتە هیچ کەس لەوانەی کە ئەم ڕۆژە لەسەر زەوین لەدوای سەد ساڵی تر کەسیان نامێنێ.

٢.عائشە -رضي الله عنها- دەڵێ: «كَانَ الْأَعْرَابُ إِذَا قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) سَأَلُوهُ عَنِ السَّاعَةِ: مَتَى السَّاعَةُ؟ فَنَظَرَ إِلَى أَحْدَثِ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ، فَقَالَ: (إِنْ يَعِشْ هَذَا لَمْ يُدْرِكْهُ الْهَرَمُ قَامَتْ عَلَيْكُمْ سَاعَتُكُمْ[2]» واتە: دەشتەکیەکان کاتێ دەهاتنە خزمەت پێغەمبەری الله (ﷺ) پرسیاری قیامەتیان لێدەکرد، کەی قیامەت دێت؟ ئەویش تەماشای گەنجترین کەسیانی کرد و فەرموی: (ئەگەر ئەمە بژی تا دەگاتە قۆناغی پیریی قیامەتی ئێوە هەڵدەسێت).

هیشام کە یەکێکە لە ڕاوی ئەو حەدیسە ڕونیکردەوە و هیچ گومانێکی تێدا نەهێشتەوە فەرموی واتە مردنتان دادێت بەو مەبەستە فەرموی پێغەمبەر (ﷺ) نەک قیامەتی گەورە، واتە قیامەتی هەریەک لە ئێوە کە مردنتدانە دادێت.

٣.(أنس)ی کوڕی (مالك) -رضي الله عنه- دەڵێ: «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: مَتَى [تَقُومُ] السَّاعَةُ؟ قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) هُنَيْهَةً، ثُمَّ نَظَرَ إِلَى غُلَامٍ بَيْنَ يَدَيْهِ مِنْ أَزْدِ شَنُوءَةَ، فَقَالَ: (إِنْ عُمِّرَ هَذَا لَمْ يُدْرِكْهُ الْهَرَمُ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ). قَالَ: قَالَ أَنَسٌ:

[1] صحيح البخاري (٦٠١) (١١٦) (٥٦٤)، صحيح مسلم (٢٥٣٧)، سنن أبي داود (٤٣٤٨).

[2] صحيح مسلم (٢٩٥٢)، صحيح البخاري (٦٥١١).

ذَاكَ الْغُلَامُ مِنْ أَتْرَابِي يَوْمَئِذٍ[1]» واتە: پیاوێك لە پێغەمبەری (ﷺ) پرسی کەی قیامەت هەڵدەسێت؟ دەڵێ: ئەویش کەمێك مات بوو پاشان تەماشای منداڵێکی کرد لەبەردەمیدا لە هۆزی (أَزْدِ شَنُوءَةَ)، ئینجا فەرموی: (ئەگەر ئەمە عومری باقی بێت پیر نابێت تا قیامەت هەڵدەسێت) (أنس)ی کوڕی (مالك) دەڵێ: ئەو منداڵە ئەو ڕۆژە لە تەمەنی مندا بوو. زانایان دەڵێن: مەبەست لەم فەرمودەیە قیامەتی ئەوانە، واتە مردنیانە.

## ناوەکانی ڕۆژی دوایی و لێکدانەوە و ژماردنی هەندێکیان:

لە قورئانی پیرۆز و لە فەرمودەی پێغەمبەریش (ﷺ) ڕۆژی دوایی دەیەها ناوی بۆ هاتوە، ئیمامی قوڕتوبیش دەفەرموێ ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕۆژی قیامەت زۆر گەورەیە وجێگای بایەخ پێدانە، چونکە لە زمانی عەرەبیدا هەرشتێک جێگای بایەخ بێت ناوی زۆری بۆ دەهێنرێتەوە و لێدەنرێت، بۆ نمونە: (شمشێر) نزیکەی پێنج سەد ناوی هەیە لە زمانی عەرەبی، نزیکەی پێنج سەد کەلیمە و وشە هەیە هەموی مانا و ناوە بۆ شمشێر، چونکە لەلای عەرەبەکان شمشێر یەکلا کەرەوەی جەنگەکان بوە لەبەر ئەوە جێگای بایەخ بوە و بەرگریان پێی لە خۆیان کردوە، لەبەر ئەوەشە ڕۆژی دوایی ناوی زۆری لێنراوە لە قورئانی پیرۆز و لە حەدیسە سەحیحەکانی پێغەمبەری دڵسۆز (ﷺ)، چونکە ڕۆژی دوایی جێگای بایەخ و خۆ بۆ ئامادەکردنە و زۆر گەورەیە.

زانایان هەندێکیان پەرتوکی سەربەخۆیان داناوە ئەو ناوانەیان تێدا کۆ کردوەتەوە و چەندەها ناویان ژماردوە، لەوانە: (ئیمامی غەزالی -رحمه الله- لە إحياء علوم الدين دا، ئیمامی قوڕتوبی) نزیکەی پەنجا ناویان بۆ ڕۆژی دوایی ژماردوە کە شێخ ابن حجر العسقلاني ئەو قسەی لەو دوو بەڕێزە ڕیوایەت کردوە لە (فتح الباري)، وە زانایان دەفەرمون ئیمامی قوڕتوبی هەستاوە بۆ هەر یەکێک لە ناوەکانیش لێکدانەوە و تەفسیرێکی کردوە، بەڵام ئیمامی قوڕتوبی ئەو لێکدانەوە و تەفسیرەی لەو زانا بەڕێزە ابن العربي[2] وەرگرتوە (سراج المريدين) هەندێکیشی

[1] صحيح البخاري (٦١٦٧)، صحيح مسلم (٢٩٥٣) (٢٩٥٣)، مسند أحمد (١٢٩٩٣) (١٣٢٢٤) (١٣٣٨٦).

[2] جیاوازی نێوان إبن العربي و إبن عربي:

بۆخۆی لەسەری زیاد و کەم کردوە، وە ابن قتیبة لە (عیون الأخبار)دا ئەویش دوبارە ناوەکانی کۆکردوەتەوە و ژماردویەتی، إبن نجاح لە کیتابی (سبیل الخیرات) ئەویش بە تەنها ناوەکانی قیامەتی کۆکردوەتەوە و هێناویێتی.

## بەناوبانگترین ناوەکانی ڕۆژی قیامەت:

١.یوم القیامة: ئەو ناوە لە حەفتا شوێن لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز تۆمار بوە و هاتوە، الله تعالی دەفەرموێت:﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ

---

| إبن العربي | إبن عربي |
|---|---|
| بە أبو بکر بن العربي ناسراوە، زانایەکی قازی ئەندەلوسی بوە، مالیکی بوە، وە یەکێکە لە زانایانی ئەهلی سونە، وە خاوەن کۆمەڵێ کتێبی زۆر بەسودە وەک: (عارضة الأحوذي بشرح صحيح الترمذي، تفسير آيات الأحكام، العواصم من القواصم)، ئەم زانا بەڕێزە لە ساڵی (٥٤٣) کۆچی وەفاتی کردوە. | بە محيي الدين بن عربي ناسراوە، غولاتی سۆفیەکانە، خاوەن چەند کتێبێکی مەشهورە وەک: (فصوص الحكم، الفتوحات المكية)، کە زۆرێک لە زانایانی هاوسەردەمی کۆن لەسەر ئەوەن ئەو کتێبانە کوفری سەریحیان تێدایە، بۆیە کەمن ئەو زانایانەی کە إبن عربي یان بێ ئەلف و لام تەکفیر نەکردبێ، بەڵکو لەبەر ئەو قسانەی بە کافریان زانیوە، کە پێی وایە ئەم کەونە یەک وجودی تێدایە واتە وجودەکە هەر اللەیە و ئیتر بەندەکانیش هەر بە الله ئەزانێت لەبەر ئەوەی دەڵێ ئەمانە وجودی حەقیقەتیان نیە نەزەریەی (وحدة الوجود)ی پێ دەگوترێ، هەروەها دەڵێن نەزەریەی (حلول)یشی هەبوە واتە الله تعالی هاتوەتە ناو لاشەی بەندەکانیەوە، ئینجا بە ڕونی وەکو زەهەبی باسی دەکات گوتویەتی ئیبراهیم اللەیە، هەتا لەوەوە ئیتر زەهەبی تەکفیری کردوە و گوتویەتی ئەگەر ئەوە کوفر نەبێ ئیتر کوفر نیە، هەروەها شیعریشی هەیە لە شیعرەکانیشی بەهەمان شێوە کوفری هەیە. |

إبن العربي لەگەڵ إبن عربي سۆفی چەند خاڵێکی هاوبەشیان هەیە:

١. لە یەک سەردەمدا ژیاون.

٢. هەردوکیان ئەندەلوسی بون.

ٱللَّهِ حَدِيثًا﴾ [النساء: ٨٧] واته: هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لە الله، سوێند بە الله بێگومان کۆتان دەکاتەوە بۆ (لێپرسینەوەی) ئەو ڕۆژی دواییەی کە هیچ گومانی تێدا نیە جا کێ لە الله قسە(و بەڵێنی) ڕاسترە.

قیامەت لە (قام، یقوم) هاتوە لە زمانی عەرەبیدا، وە ئەو تایەی ئاخیر بۆ موبالەغەی تەئنیسی پێیوە نوسێنراوە (واتە تاوەکو موبالەغەی تێدا بکرێ)، ڕۆژەکە زۆر مەزن و گەورەیە جێگای سەرنجدانە لەبەر ئەوەیە ئەو تایەی پێوە نوسێنراوە، ئیمامی قورتوبی دەفەرموێ قیامەت بە واتای هەستانەوەی خەڵکیە، بۆ خزمەت پەروەردگای جیهانیان (واتە بۆ مەیدانی حەشر و حیساب).

٢.الیوم الآخر: ﴿وَلَـٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡـَٔاخِرِ وَٱلۡمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَـٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾.

٣.اخرة: الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وَلَقَدِ ٱصۡطَفَيۡنَـٰهُ فِى ٱلدُّنۡيَا وَإِنَّهُۥ فِى ٱلۡـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ﴾ [البقرة: ١٣٠].

٤.ٱلدار ٱلـٔاخرة: الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡـَٔاخِرَةَ لَهِىَ ٱلۡحَيَوَانُ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾ [العنکبوت: ٦٤].

٥.ٱلساعة: الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَـَٔاتِيَةٌ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ﴾ [الحجر: ٨٥] ئیمامی قورتوبی دەفەرموێ ساعە وشەیەکە لە زمانی عەرەبیدا بە واتای بەشێک و کاتێک دێت لە کات و زەمەنەکان، بەڵام دیاری ناکرێت بە هیچ دەقیقە و چرکەیەک و ژماردنێک، بەڵام لە عورفدا بەو بیست و چوار بەشانەی بەشکراوە بۆ شەو و ڕۆژێ هەریەک لەوانە پێی دەگوترێ ساعە، ئەوە مانایەکی تایبەتی ترە وەرگیراوە لەو ساعەی یەکەم، بەڵام لە کۆتایدا هۆکاری ئەوەیە ڕۆژی دوایی ناوی لێنراوە ساعە چونکە زۆر نزیکە، ساعە بە واتای زەمەنێکی کەم واتە زەمەنێکی زۆر کەمتان ماوە حیسابکەن مادەم قیامەت بڕیاری

بۆ دراوه پێی دەگەن و بەرپا دەبێ بەسەرتاندا هەندێکیش دەفەرمون لەبەر ئەوەیە چونکە لەناکاو دێت بەسەرتاندا ئێوە ئاگادار نین[١].

٦.یوم البعث (ڕۆژی زیندوبونەوە): الله تعالی دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ﴾ [الحج: ٥] واتە: ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە لە گوماندان دەربارەی زیندو بونەوە ئەوسا (بزانن) بەڕاستی ئێمە ئێوەمان دروست کردوە لە خاك (خۆڵ).

البعث إبن منظور دەفەرموێ: (الإحياء من الله تعالى للموتى، وبعث الموتى نشرهم ليوم البعث[٢]) واتە: زیندو کردنەوەی گیاندبەرەکانە کە الله تعالی ئەوانی مراندوە زیندویان دەکاتەوە بەوە دەگوترێت البعث کە دەیانبات بۆ مەیدانی حەشر و حیساب.

٧.القارعة: الله تعالی دەفەرموێ: ﴿الْقَارِعَةُ * مَا الْقَارِعَةُ * وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ﴾ [القارعة: ١-٣] ئیمامی قورتوبی دەفەرموێ لەبەر ئەوە ئەو ناوەی لێنراوە چونکە ئەوەندە ناخۆشە هاتن و بەرپابونی قیامەت هەواڵ و ترسناکیەکانی بەڕاستی توشی دڵ دەبێت توشی ناخۆشیت دەکات توشی ڕاچڵەکینت دەکات توشی لێدانی زیادی دڵت دەکات، لەبەر ئەوەیە دڵت دادەگیرێت و ئەوە وات لێدەکات دڵت ڕابچڵەکێت و بلەرزێیت و بتاسێیت[٣].

٨.یوم الفصل: الله تعالی دەفەرموێ: ﴿هَذَا يَوْمُ الْفَصْلِ الَّذِي كُنتُمْ بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ [الصافات: ٢١] لەبەر ئەوەیە ئەو ناوەی لێنراوە دەڵێن چونکە لەو ڕۆژەدا الله تعالی یەکلای دەکاتەوە لەگەڵ خەڵکەکە و جیاوازی دەخاتە نێوان چاکە و خراپەکانیان و حوکمیان بەسەردا دەدات، وەکو الله تعالی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ [السجدة: ٢٥].

[١] التذكرة للقرطبي: ٢١٦.
[٢] لسان العرب: مادة: (ب ع ث) (١/٢٣٠).
[٣] التذكرة للقرطبي: ٢٠٩.

٩.یوم الدين: الله تعالى فەرمویەتی: ﴿وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ * يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ﴾ [الانفطار: ١٤-١٩] جا (الدين) لە زمانەوانیدا إبن منظور دەڵێ (الجزاء والحساب) واتە: پاداشت دانەوە و حیساب لەگەڵ کردن، جا بەڵێ لەو ڕۆژەدا پاداشتیش هەیە حیسابیشت لەگەڵ دەکرێ کە قیامەتە.

١٠. الصاخة: الله تعالى فەرمویەتی: ﴿فَإِذَا جَاءتِ الصَّاخَّةُ﴾ [عبس: ٣٣] لەبەر ئەوەی ناوە بۆ فوکردنی یەکەمجار بە صوردا لەلایەن ئیسرافیلەوە کە هەموو مرۆڤ و خەڵکەکە پێی لەناو دەچن، هەندێکیش دەڵێن نا هەر خودی ناوی قیامەتە و بۆ قیامەت گوتراوە، (الصاخة) مانایە لە جێیەکەی ئەوەیە کە ئیمامی بەغەوی دەفەرموێ: (الصاخّة يعني صيحة يوم القيامة[1]) واتە: ئەو هاوار و دەنگە بەرز و گەورەی ڕۆژی قیامەتە کە کەڕت دەکات.

١١. الطامة الكبرى: الله تعالى فەرمویەتی: ﴿فَإِذَا جَاءتِ الطَّامَّةُ الْكُبْرَى﴾ [النازعات: ٣٤] لەبەر ئەوە ئەو ناوەی لێنراوە چونکە زۆر ترسێنەرە بەڕاستی زاڵ دەبێ بەسەر هەموو شتێک و هەموو شتێک دەپێچێتەوە و لولی دەدات و ئەو کاتەیە کە هیچ شتێک هیچی بەسەر هیچەوە نامێنێت.

١٢. یوم الحسرة: الله تعالى فەرمویەتی: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ [مريم: ٣٩] (يوم الحسرة) بە واتای ڕۆژی پەشیمان بونەوە و دەست شکانەوەیە بۆ ئەو کەسانەی کە بڕوادارن دەڵێن خۆزگە زیاتر کردەوەی چاکمان کردبا و ئیمانمان دامەزراندبا وە ئەوانەی کافریشن دەڵێن لە دەستمان چوو.

١٣. الغاشية: الله تعالى فەرمویەتی: ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ﴾ [الغاشية: ١] واتە ئەو ڕۆژەی کە داپۆشەرە بە غەم و پەژارە هێنەرە بۆ خەڵکەکە.

١٤. یوم الخلود: الله تعالى فەرمویەتی: ﴿ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ﴾ [ق: ٣٤] ڕۆژی هەتا هەتایی و بێکۆتا وەکو الله تعالى دەفەرموێ ﴿وَالَّذِينَ كَفَرواْ وَكَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ [البقرة: ٣٩] ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ ابْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِي رَحْمَةِ اللهِ

[1] تفسیر ابن کثیر: (٢١٧/٧).

هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ [آل عمران: ١٠٧] زانایان دەفەرمون هەتا هەتاییە کە کافرەکان هەمیشەیی دەبن لە ئاگری جەهەنەم، بڕوادارانیش هەمیشەیی دەبن و کۆتاییان بەسەردا نایەت.

١٥. يوم الحساب: الله تعالی فەرمویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ﴾ [ص: ٢٦] چونکە ئەو ڕۆژە حیساب لەگەڵ خەڵکدا دەکرێت و یەکلا دەکرێتەوە.

١٦. الواقعة: الله تعالی فەرمویەتی: ﴿إِذَا وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ﴾ [الواقعة: ١] لەبەر ئەوە ئەو ناوەی لێنراوە چونکە سەدا سەد ڕوودەدات و دێتە پێش.

١٧. يوم الوعيد: الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ ذَلِكَ يَوْمُ الْوَعِيدِ﴾ [ق: ٢٠] ڕۆژی تۆڵە سەندنەوەکان.

١٨. يوم الآزفة: الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْآزِفَةِ إِذِ الْقُلُوبُ لَدَى الْحَنَاجِرِ كَاظِمِينَ﴾ [غافر: ١٨].

١٩. يوم الجمع: الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ [الشورى: ٧] چونکە خەڵکەکەی تێدا کۆدەکرێتەوە.

٢٠. الحاقة: الله تعالی فەرمویەتی: ﴿الْحَاقَّةُ * مَا الْحَاقَّةُ﴾ [الحاقة: ١-٢] چونکە لەو کاتەوە بەڵێنەکانی الله وە تۆڵەکانی الله سەدا سەد تەحقیق دەبێ و دێتەجێ.

٢١. يوم التلاق: الله تعالی فەرمویەتی: ﴿رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ ذُو الْعَرْشِ يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ لِيُنذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ﴾ [غافر: ١٥].

٢٢. يوم التناد: الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وَيَا قَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ التَّنَادِ﴾ [غافر: ٣٢] ئەو ڕۆژە هەموو خەڵکێک بەناوی خۆی بانگ دەکرێت.

٢٣. يوم التغابن: الله تعالی فەرمویەتی: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ذَلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ﴾ [التغابن: ٩].

ئەو ناوانە کۆکراوەن زانا بەڕێزەکان هێناویانەتەوە ئەو زۆرینەی ناویش بۆ ڕۆژی قیامەت وەکو گوتمان ئیمامی قورتوبی و هەندێک لە زانایانی تر فەرمویانە لەبەر گەورەیی و مەزنی ڕۆژی قیامەتە لەبەر گرنگی و جێی بایەخی ئەو ڕۆژەیە کە ڕۆژی یەکلا کردنەوەیە کە یەکجار مەزن و گەورەیە.

## تێکچونی دونیا و کاتی هاتنی فوکردن بە صوردا:

لەگەڵ لێدانی صور و فوکردنە صوردا بە بەڵگەی ڕاست و دروست بە ئایەتی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) گیانلەبەرەکان هەر هەمویان گیانیان لێ دەستێندرێتەوە و گیانیان دەردەچێ و دەچنەوە فەنا و نامێنێن، هەروەکو الله تعالی فەرموی: ﴿كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٖ * وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ رَبِّكَ ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ﴾ [الرحمن: ٢٦-٢٧] واتە: هەرچی کەس لەسەر زەویدایە نامێنێ و تیا دەچێ * وە هەر پەروەردگارت دەمێنێ کە خاوەن شکۆی ڕێزدارە.

﴿كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥ﴾ [القصص: ٨٨] واتە: هەموو شتێك لەناو دەچێ جگە لەزاتی الله.

﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ﴾ [الزمر: ٦٨] واتە: کاتێ فوکرا بە کەڕەنادا (بە شەیپوردا) یەکسەر هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدان دەمرن مەگەر کەسانێ الله بیەوێ (نەمرن) پاشان جارێکی تر فو دەکرێ بە کەڕەنادا جا لە پڕ هەموو ڕاست دەبنەوە چاوەڕوان دەکەن.

جا بەراستی ئەو فوکردنە بە صوردا فەرمانی اللەیە و دونیا دەبێ تێک بچێ دەبێ ئاسمانەکان تێک بچێ دەبێ گیانلەبەرەکان تەواو ڕۆحیان بکێشرێ و بگەڕێنەوە لای الله تعالی، ئەوە ئەو کاتە ئەگەر تۆ لەماڵەوە دەرچوی توانای گەڕانەوەت نیە تازە لە کوێیت لەوێ ڕۆحت دەردەچێ و قیامەتت بەسەردا دێت، ئەوە ئەو کاتەیە کە توانای ئەوەت نیە ئەگەر لە پێشتردا وەسیەت و ئامۆژگاری و قسە و شتێکت نەنوسیبێتەوە و نەتگوتبێت پێڕا ناگەیت کاتێک فو دەکرێت بە صور، الله تعالی دەفەرموێ: ﴿مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ تَأۡخُذُهُمۡ وَهُمۡ

يَخِصِّمُونَ * فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ تَوۡصِيَةٗ وَلَآ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ يَرۡجِعُونَ﴾ [يس: ٤٩-٥٠] واتە: ئەمانە چاوەڕوانی هیچ ناکەن مەگەر شریخە و دەنگێکی بەهێز (فو کردن بە صوردا) بیانگرێت لە کاتێکدا لەنێو خۆیاندا دەمە قاڵێ دەکەن * ئەوسا ناتوانن هیچ وەسیێتێك بکەن یا بگەڕێنەوە لای کەس و کاریان.

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمویەتی: «ثُمَّ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ، فَلَا يَسْمَعُهُ أَحَدٌ إِلَّا أَصْغَى لِيتًا وَرَفَعَ لِيتًا، قَالَ: وَأَوَّلُ مَنْ يَسْمَعُهُ رَجُلٌ يَلُوطُ حَوْضَ إِبِلِهِ، قَالَ: فَيَصْعَقُ، وَيَصْعَقُ النَّاسُ[١]» واتە: پاشان فو دەکرێت بە صوردا، هیچ کەس گوێی لێ نابێت ئیلا مل دەسوڕێنێ و هەست ڕادەگرێ و سەری خۆی بەرز دەکاتەوە ملی بەدیار دەکەوێ، دەفەرموێ: یەکەم کەس کە گوێی لە دەنگی فوکردن بە صوردا دەبێت پیاوێکە و دەیەوێت وشترەکەی لە حەوزی ئاوەکە ئاو بدات، دەفەرموێ: ئەو پیاوە لەوێ لەهۆش خۆی دەچێ و گیانی دەردەچێ و دەمرێ، خەڵکەکانیش بەدوای ئەودا دەڕۆن و لەگەڵ فوکردنەکە بە صوردا و دەنگەکە کە دەیبیستن هەمویان دەمرن.

لە فەرمودەیەکی تر پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەمان بۆ ڕوندەکاتەوە کە فودەکرێ بە صور زۆر بە خێرایی مرۆڤەکان و شتەکان لەناو دەچن بە ڕادەیەک خێرایە کە تۆ بیرت لێ نەکردوەتەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ نَشَرَ الرَّجُلَانِ ثَوْبَهُمَا بَيْنَهُمَا، فَلَا يَتَبَايَعَانِهِ وَلَا يَطْوِيَانِهِ، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدِ انْصَرَفَ الرَّجُلُ بِلَبَنِ لِقْحَتِهِ، فَلَا يَطْعَمُهُ، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَهُوَ يَلِيطُ حَوْضَهُ فَلَا يَسْقِي فِيهِ، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ، وَقَدْ رَفَعَ أُكْلَتَهُ إِلَى فِيهِ، فَلَا يَطْعَمُهَا[٢]» واتە: قیامەت بەرپا دەبێت و فو دەکرێت بە صور ئەو کاتە کەسێکی کوتاڵ فرۆش لەگەڵ کەسێکی کڕیار تۆپە قوماشێکیان هێناوە و هەندێک لە تێکەڵبونی تۆپە قوماشەکەیان خاو کردوەتەوە ئەو ئەوسەری لە دەستە دەڕوانێتە قوماشەکە دەیەوێ لێی بکڕێ و ئەوی تریش تۆپەکەی بە دەستە فرۆشیارەکە ئا لەوکاتانەدا هیچ لە گۆڕ نیە هێشتا ئینجا هێشتا ئەو قسە لە دەمی نەهاتوەتە دەرەوە کە ڕای لەقوماشەکەیە یان نا ئەویش لە دەمی نایەتە دەرەوە بڵێ

[١] صحيح مسلم (٢٩٤٠)، سنن أبي داود (٢٤٨٢)، مسند أحمد (٦٥٥٥) (٦٨٧١) (٦٩٥٢).
[٢] صحيح البخاري (٦٥٠٦) (٤٦٣٥) (٤٦٣٦)، صحيح مسلم (١٥٧) (١٥٨) (٢٧٠٣)، سنن أبي داود (٤٣١٢).

دەتەوێ یان نا، ئینجا بە هیچ ڕاناگەن ئەو دوو کەسە نە کوتاڵ فرۆشەکە بەوە ڕادەگات لولی بداتەوە نە کەسەکەی تریش بەوە دەکات کڕین و فرۆشتنەکەی لەگەڵ ئەنجام بدات قیامەت بەرپا دەبێ و نەفخی صور لێدەدات و لەوێ دەستبەجێ لەناو دەچن، قیامەت بەرپا دەبێ هیچ لە ئارادا نیە پیاوێک کەسێک دەبینێ دەچێ ئەو شیرەی دۆشراوە لە حوشترەکە دەیهێنێ کە لێی تام بکات و بیخواتەوە شیرەکە دەهێنێت پێ ڕاناگات بیخواتەوە ئەوەندە بە خێرایی قیامەتی لێ بەرپا دەبێ، قیامەت بەرپا دەبێ دەیەوێ بچێت ئاو بخواتەوە لە حەوزەکە دەست دەداتە ئاوەکە و پێی ناکرێت پێشتر هیچ لە گۆڕدا نەبوە لەو لەحزە و چرکە لەناو دەچێ، کەسێک پارویەکی بۆخۆی دروستکردوە هیچ لە ئارادا نەبوە لەناکاو فو دەکرێت بە صوردا تیکەی بەرز کردوەتەوە بۆ دەمی دەیەوێ تامی بکات و بیخوا ناتوانێت بیخوات پاروەکەی لە دەست ڕەق دەبێ و قیامەتی لەسەر بەرپا دەبێ و دەگەڕێتەوە لای الله تعالی.

## جۆرەکانی صور:

صور لە زمانی عەرەبیدا بە واتای (القرن) دێت واتە وەکو قۆچێکی خواربوەوە، ئەو قۆچەی بەسەری ئاژەڵ و مانگا و گایەکانەوەیە، ئەستورە و دەرگایەکی هەیە و لایەکەی تری باریک بوەتەوە، دەڵێ بەو نەوعە بابەتە شتانە دەگوترێت کە بوقە یان وەکو قۆچە، لە پێغەمبەریان پرسی بەم شێوەیە پێناسەی صوری کرد: «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: مَا الصُّورُ؟ قَالَ: قَرْنٌ يُنْفَخُ فِيهِ[١]» واتە: لە عەبدوڵای عەمری کوڕی عاسەوە دەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: پیاوێکی عەرەبی (دەشتەکی) هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: صور چیە؟ فەرموی: شەیپور یان کەڕەنایە فوی پێدا دەکرێت.

لە پاشان حەسەنی بەصری بۆچونێکی تری هەیە دەفەرموێ (الصُوْر) بە (الصُوَر) دەخوێنرێتەوە، بە واتای ئەوەی فو دەکرێت بە لاشە و جەستەی مرۆڤەکان، ئەو کاتە ڕۆحیان

[١] سنن الترمذي (٢٤٣٠) (٣٢٤٤)، سنن أبي داود (٤٧٤٢)، سنن الدارمي (٢٨٤٠).

وەبەر دێتەوە، نەک شتێکی دیاریکراو بێت و (الصُوْر) بێت[1]، بەڵام بوچونی دروستتر (الصُوْر)ە چونکە الله تعالى لە قورئانی پیرۆز بەو شێوەی هێناوەتەوە.

**پرسیٚك:** ئایە الصور لە چ بابەتێک دروستکراوە؟

**وەلاٚم:** هەندێک بیروبۆچون و ڕیوایەت و گێڕانەوە هەیە لەسەر ئەو شتانە بەڵام بۆچونی دروست ئەوەیە بۆمان نیە قسەی لێبکەین، چونکە دیارینەکراوە لە حەدیسە سەحیحەکان هیچ بەڵگەی سەحیحمان بە دەستەوە نیە کێ فو دەکات بەو صورەدا لە فریشتەکان، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی فەرمویەتی: (اشتهر أن صاحب الصور إسرافيل عليه السلام، ونقل فيه الحليمي الإجماع، وقع التصريح به في حديث وهب ابن منبه، وفي حديث أبي سعيد عند البيهقي، وفي حديث أبي هريرة عند ابن مردويه، وكذا في حديث الصور الطويل[2]) واتە: بەو شێوەیە بەناو بانگە و بڵاو بۆتەوە کە ئەو فریشتەی فو دەکات بە صوردا ئیسڕافیلە، ئیمامی الحليمي ئیجماع و یەکدەنگی لەسەر هێناوە کە دەفەرموێ ئەوەی فو دەکات بە صوردا ئیسڕافیلە، وە بە ڕاشکاوی لە فەرمودەیەکدا هاتوە کە وەهەبی کوڕی مونەبیھ دیاریکردوە و دەفەرموێ مەبەست پێی ئیسڕافیلە لە فریشتەکان کە فو دەکات بە صوردا، ئیمامی بەیهەقی لێی گێڕاوەتەوە، لە حەدیسی ئەبو هورەیرەش هاتوە لەلای پێشەوا مەردەوەیهی، وە هەروەها حەدیسی دور و درێژیش هاتوە لەسەر ئەوەی ڕیوایەت کراوە وەهەبی کوڕی مونەبیھ و هەندێکی تر لە زانایانی تابیعی لێیان وەرگرتوە و دەفەرمون ئیسڕافیلە ئەوەی فو دەکات بە صوردا.

لە حەدیسێکدا هاتوە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمویەتی: «إن طرفَ صاحبِ الصورِ منذ وكِّلَ به مُستعدٌ ينظرُ نحو العرشِ مخافةَ أن يؤمرَ قبلَ أن يرتدَّ إليه طرفُهُ كأن عينيْهِ كوكبانِ دُريانِ[3]» واتە: ئەو فریشتەی الله پێی سپاردوە کە فو بکات بە صوردا لەوەتەی الله تعالى ئەو

[1] . كتاب القيامة الكبرى [عمر سليمان الأشقر] ص: ٣٣.

[2] «فتح الباري» (١١/ ٣٦٨).

[3] ابن حجر العسقلاني، فتح الباري لابن حجر (٣٧٦/١١)، إسناده حسن.

فەرمانەی پێداوە ئەو وا چاو دەبڕێتە عەرشی الله تعالی چاوەڕوانە کە الله تعالی فەرمانی پێبدا و ئەو فەرمان و ئەرکی فوکردن بە صوردا جێبەجێ بکات فریشتەکە لەوە دەترسێت نەوەک ئەگەر چاوی لابدات لەسەر عەرشی الله بەوەندە چاو تروکانە و لادان و هێنانە خوارەوەی لەو کاتەدا الله فەرمان بکات فو بکە بە صوردا ئەو ئاگای لێ نەبێت و فەرمانەکەی الله تعالی بە لەحزە و چرکەیەک دوابخات هەر دوو چاوەکانیشی وەکو مرواری وایە و دەبریسکێتەوە و ڕوناکن.

پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەیەکی تریشدا دەفەرموێ: «كَيْفَ أَنْعَمُ وَقَدِ الْتَقَمَ صَاحِبُ الْقَرْنِ الْقَرْنَ، وَحَنَى جَبْهَتَهُ، وَأَصْغَى سَمْعَهُ يَنْتَظِرُ أَنْ يُؤْمَرَ أَنْ يَنْفُخَ فَيَنْفُخَ؟. قَالَ الْمُسْلِمُونَ: فَكَيْفَ نَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: قُولُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، تَوَكَّلْنَا عَلَى اللَّهِ رَبِّنَا[1]» واتە: چۆن کەیف خۆش بم لەکاتێکدا (ئیسرافیل) خاوەن کەڕەنا، کەڕەناکەی لە دەم ناوە و نێوچەوانی بەسەردا شۆڕ کردوەتەوە، و گوێی هەڵخستوە چاوەڕوانە هەر کاتێک فەرمانی پێ بکرێت دەستبەجێ فوی پێدا بکا و کۆتایی بە جیهان بێنێ؟ موسڵمانان گوتیان: ئەی پێغەمبەری الله ئێمە چی بڵێین؟ فەرموی بڵێن حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، تَوَكَّلْنَا عَلَى اللَّهِ رَبِّنَا.

**پرسێك:** چ ڕۆژ و کاتێکە فو بە صوردا دەکرێت؟

**وەڵام:** پیغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: «خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ، وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا، وَلَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ[2]» چاکترین ڕۆژێ کە خۆری تێدا هەڵهاتبێت ڕۆژی جومعەیە لەو ڕۆژەدا ئادەم دروست کراوە، لەو ڕۆژەدا خراوەتە بەهەشتەوە، لەو ڕۆژەشدا لەبەهەشت دەرکرا، ڕۆژی قیامەتیش نایەت لەڕۆژی جومعەدا نەبێ.

[1] سنن الترمذي (٣٢٤٣) (٢٤٣١)، سنن ابن ماجه (٤٢٧٣)، مسند أحمد (١١٠٣٩) (١١٦٩٦) (١٩٣٤٥).

[2] صحيح مسلم (٨٥٤) (٢٧٨٩)، سنن أبي داود (١٠٤٦)، سنن الترمذي (٤٨٨) (٤٩١) (٣٣٣٩).

پێغەمبەری الله (ﷺ) لە فەرموودەیەکی تردا فەرمویەتی: «إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وَفِيهِ الصَّعْقَةُ؛ فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ فِيهِ؛ فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ[1]» واتە: ڕۆژی هەینی یەکێکە لە هەرە ڕۆژە چاکەکانتان: لەو ڕۆژەدا ئادەم دروستبوو، هەر لەو ڕۆژەدا وەفاتی کرد، لەو ڕۆژەدا فو دەکرێت بە کەڕەنادا، هەر لەو ڕۆژەشدا نەعرەتە گەورەکە دەبێ و مەرگی سەرتاسەری پەیدا دەبێت؛ جا ئێوەش لەو ڕۆژەدا سەڵاواتی زۆرم لەسەر لێبدەن؛ چونکە سەڵاواتەکانتان دەگاتەوە پێم و من هەستی پێ دەکەم و هەواڵ و خەبەرم پێ دەدرێت.

لە فەرموودەیەکی تریشدا هاتوە فەرمویەتی: «عُرِضَتْ عليَّ الأيّامُ فعُرِض عليَّ فيها يومُ الجُمُعةِ فإذا هي كمِرآةٍ حَسناءَ وإذا في وسَطِها نُكتةٌ سَوداءُ فقُلْتُ ما هذا قيل السّاعةُ[2]» واتە: ڕۆژەکانیان بە من پیشاندا و نمایشیان کرد من بینیم ڕۆژی هەینیش لەو ڕۆژانەدا هەبوو هەموی وەکو ئاوێنەیەک سپی و خاوێن بوو تەنها بینینم نوختەیەکی ڕەشی لەناودا بوو ئەو ئاوێنە گوتم ئەو نوختە ڕەشە چیە گوتیان ئەوە ڕۆژی بەرپابونی قیامەتە.

لە فەرموودەیەکی تردا فەرمویەتی: «وَمَا مِنْ دَابَّةٍ إِلَّا وَهِيَ مُسِيخَةٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مِنْ حِينِ تُصْبِحُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ شَفَقًا مِنَ السَّاعَةِ، إِلَّا الْجِنَّ وَالْإِنْسَ[3]» واتە: هەرچی گیانەوەر هەیە جگە لە جنۆکە و ئادەمیزاد هەمویان لە ڕۆژی هەینیدا هەر لە سپێدەی بەرەبەیانەوە هەتا ئەو کاتەی خۆر ئاوا دەبێ گوێ هەڵدەخەن و چاوەڕوانن لە ترسی هەڵسانی قیامەت ئیلا جنۆکە و مرۆڤ نەبێت خۆیان لەو ڕۆژە بێمنەت کردوە و لەبیریان نیە.

**پرسێك:** ئایە یەک جار فو دەکرێت بە صوردا یان دوو جارە یان سێ جارە؟

**وەڵام:** لەگەڵ لێدانی صور و فوکردنە صوردا بە بەڵگەی ڕاست و دروست بە ئایەتی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) گیانلەبەرەکان هەر هەمویان گیانیان لێ دەستێندرێتەوە و

[1] سنن أبي داود (١٠٤٧) (١٥٣١)، سنن النسائي (١٣٧٤)، سنن ابن ماجه (١٦٣٦).

[2] الطبراني، المعجم الأوسط (٢١٤/٧).

[3] مسند أحمد (١٠٣٠٣) (٧١٥١) (٧٤٨٧)، صحيح البخاري (٩٣٥) (٥٢٩٤) (٦٤٠٠)، صحيح مسلم (٨٥٢) (٨٥٤) (٢٧٨٩).

گیانیان دەردەچێ و دەچنەوە فەنا و نامێنێن، زۆربەی هەرە زۆری زانایان ئەوە بە دروست دادەنێن دوو جارە بە گوێرەی ئایەتەکانی قورئان، دوو جار فو دەکرێت بە صوردا، و کۆمەڵێکیش دەفەرمون سێ جارە، ئەوانەی دەفەرمون دوو جارە دەفەرمون جارێکیان پێی دەگوترێ (الصعق) بە واتای مردنی هەموو گیانلەبەرەکانە کە فو دەکرێت بە صوردا هەموویان پێکەوە دەمرن، جاری دوەمیشیان پێی دەگوترێت (یحصل بها البعث) زیندوبونەوەیە و هەموو خەڵکەکە زیندو دەکرێنەوە بۆ مەیدانی حەشر و حیساب، لەگەڵ فوکردنی جاری دوەم بە صوردا کە الله تعالی دەفەرموێت: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ﴾ [الزمر: ٦٨] واتە: کاتێ فوکرا بە کەڕەنادا (بە شەیپوردا) یەکسەر هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدان دەمرن مەگەر کەسانێ الله بیەوێ (نەمرن) پاشان جارێکی تر فو دەکرێ بە کەڕەنادا جا لە پڕ هەموو ڕاست دەبنەوە چاوەڕوان دەکەن.

لە ئایەتێکی تردا الله تعالی دەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ * تَتۡبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ﴾ [النازعات: ٦-٧] واتە: لە ڕۆژێکدا (فو دەکرێ بە شەیپوردا) بومەلەرزە زەوی دەلەرزێنێ * دوبارە فوی پیادەکرێتەوە، بومەلەرزەیەکی تریشی بەدوادا دێت، مردوان زیندو دەبنەوە.

﴿مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ تَأۡخُذُهُمۡ وَهُمۡ يَخِصِّمُونَ * فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ تَوۡصِيَةٗ وَلَآ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ يَرۡجِعُونَ * وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يَنسِلُونَ﴾ [یس: ٤٩-٥١] واتە: ئەمانە چاوەڕوانی هیچ ناکەن مەگەر شریخە و دەنگێکی بەهێز (فو کردن بە صوردا) بیان گرێت لە کاتێکدا لەنێو خۆیاندا دەمە قاڵێ دەکەن * ئەوسا ناتوانن هیچ وەسێتێك بکەن یا بگەڕێنەوە لای کەس و کاریان * وە (جارێ تر) فو دەکرێ بە شەیپوردا ئینجا ئەوان کتوپڕ لە گۆڕەکان دێنە دەرەوە و بەپەلە دەڕۆن بۆ لای پەروەردگاریان.

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمویەتی: «(مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ). قَالُوا: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، أَرْبَعُونَ يَوْمًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ، قَالُوا: أَرْبَعُونَ شَهْرًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ، قَالُوا: أَرْبَعُونَ سَنَةً؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالَ: (ثُمَّ يُنْزِلُ اللَّهُ

مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيَنْبُتُونَ كَمَا يَنْبُتُ الْبَقْلُ، قَالَ: وَلَيْسَ مِنَ الْإِنْسَانِ شَيْءٌ إِلَّا يَبْلَى، إِلَّا عَظْمًا وَاحِدًا وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ، وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)[1]» (ماوەی نێوانی هەردو فوەکە چلە گوتیان: ئەی (ابوو هريره) چل ڕۆژ؟ گوتی: ناڵێم. فەرموی: (پاشان الله بارانێك لە ئاسمانەوە دەبارێنێت (خەڵکی) سەوز دەبنەوە وەك چۆن دانەویڵە سەوز دەبێتەوە، هیچ شتێکیش نییە لە مرۆڤ کە نەڕزێت جگە لە یەك ئێسك ئەویش کلێنچکەیە، لەو کلێنچکەوە دروستکراوەکان پێکدەهێنرێنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا).

«ثُمَّ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ، فَلَا يَسْمَعُهُ أَحَدٌ إِلَّا أَصْغَى لِيتًا وَرَفَعَ لِيتًا، قَالَ: وَأَوَّلُ مَنْ يَسْمَعُهُ رَجُلٌ يَلُوطُ حَوْضَ إِبِلِهِ، قَالَ: فَيَصْعَقُ، وَيَصْعَقُ النَّاسُ، ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ أَوْ قَالَ: يُنْزِلُ اللَّهُ مَطَرًا، كَأَنَّهُ الطَّلُّ، أَوِ الظِّلُّ- نُعْمَانُ الشَّاكُّ- فَتَنْبُتُ مِنْهُ أَجْسَادُ النَّاسِ، ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ أُخْرَى ﴿فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ﴾ [الزمر: ٦٨][2]» واتە: پاشان فو دەکرێت بە صوردا، هیچ کەس گوێی لێ نابێت ئیلا مل دەسوڕێنێ و هەست ڕادەگرێ و سەری خۆی بەرز دەکاتەوە ملی بەدیار دەکەوێ، دەفەرموێ: یەکەم کەس کە گوێی لە دەنگی فوکردن بە صوردا دەبێت پیاوێکە و دەیەوێت وشترەکەی لە حەوزی ئاوەکە ئاو بدات، دەفەرموێ: ئەو پیاوە لەوێ لەهۆش خۆی دەچێ و گیانی دەردەچێ و دەمرێ، خەڵکەکانیش بەدوای ئەودا دەڕۆن و لەگەڵ فوکردنەکە بە صوردا و دەنگەکە کە دەیبیستن هەمویان دەمرن. الله تعالی دەینێرێ یان دایدەبەزێنێ ڕاویەکە لە بەینی ئەو دوو وشەیە گومانی هەیە، بارانێک دادەبەزێنێ الله تعالی ئەو بارانە ئەوەندە چڕ و پڕە هەر دەڵێی سێبەرێکە دروستی کردوە لەسەر ڕوی زەوی بەو شێوەیە بە خوڕ دێتە خوارەوە بەهۆی ئەو بارانەوە الله تعالی لاشەکان زیندو دەکاتەوە و شینیان دەکاتەوە پاشان جارێکی تر فوی پیادا دەکرێت: ﴿فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ﴾ [الزمر: ٦٨] واتە: جا لە پڕ هەموو ڕاست دەبنەوە چاوەڕوان دەکەن.

[1] صحيح البخاري (٤٨١٤) (٤٩٣٥)، صحيح مسلم (٢٩٥٥)، سنن أبي داود (٤٧٤٣).

[2] صحيح مسلم (٢٩٤٠)، سنن أبي داود (٢٤٨٢)، مسند أحمد (٦٥٥٥) (٦٨٧١) (٦٩٥٢).

لە فەرمودەیەکی تردا فەرمویەتی: «ثمَّ يقومُ ملَكٌ الصُّورِ بينَ السَّماءِ والأرضِ فينفخُ فيهِ والصُّورُ قرنٌ فلا يبقى خلقٌ للهِ في السَّماواتِ ولا في الأرضِ إلاَّ ماتَ إلاَّ من شاءَ ربُّك ثمَّ يَكونُ بينَ النَّفختينِ ما شاءَ اللَّهُ أن يَكونَ[1]» واتە: پاشان ئەو فریشتەی کە فوکردن بە صوری پێ سپێردراوە لە نێوان ئاسمانەکان و زەوی دەبێت فو دەکاتەوە بە صورەکەدا و صوریش بریتیە لە قەرنێک کەس نامێنێتەوە لە ئاسمانەکان و زەوی ئیلا دەمرێ مەگەر ئەوەی الله تعالی حەز بکات و ویستی لەسەر بێت بیانهێڵێتەوە لە پاشان لە نێوان هەردو فوکردنەکەدا چەنێک الله بیەوێ ئەوەندە مەودا و مۆڵەت دەدات.

لە فەرمودەیەکی تردا فەرمویەتی: «إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وَفِيهِ الصَّعْقَةُ[2]» واتە: ڕۆژی هەینی یەکێکە لە هەرە ڕۆژە چاکەکانتان لەو ڕۆژەدا ئادەم دروستبوو هەر لەو ڕۆژەدا وەفاتی کرد لەو ڕۆژەدا فو دەکرێت بە کەڕەنادا هەر لەو ڕۆژەشدا نەعرەتە گەورەکە دەبێ و مەرگی سەرتاسەری پەیدا دەبێت.

جا ئەو ئایەتانەی کە باسمان کرد وە فەرمودە سەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەو بوارەدا هەیە لە زانایان هەمویانی لە یەک کیتابدا کۆکردوەتەوە لەوانە: (ئیمامی القرطبي[3]، ابن حجر العسقلاني[4]).

ئەوانە بۆچونی زۆرینەی زانایان بوو دوو فو کردنە بە صوردا، بەڵام هەندێک لە زانایان دەفەرمون سێ فوکردنە بە صوردا، یەکەمیان پێی دەگوترێت: (نفخة الفزع)، واتە هی ترسانە خەڵکەکە ترسی لێدەنیشێ کە فو دەکرێت بە صوردا، دوەمیان پێی دەگوترێت: (ونفخة الصعق) خەڵکەکە گیان لەدەست دەدات و دەمرێ، سێیەمیان پێی دەگوترێت: (ونفخة القيام

---

[1] ابن حجر العسقلاني، فتح الباري لابن حجر (٣٧٧/١١)، موقوفاً [و] إسناده قوي.
[2] سنن أبي داود (١٠٤٧) (١٥٣١)، سنن النسائي (١٣٧٤)، سنن ابن ماجه (١٦٣٦).
[3] التذكرة للقرطبي: ١٨٣، ١٨٤.
[4] فتح الباري: (٣٦٩/١١).

لرب العالمين) خەڵکەکە لە گۆڕەکانیان زیندو دەبنەوە، ئەو زانایان لەسەر ئەو بۆچونەن (ابن العربي[1]، وابن تيمية[2]، وابن كثير[3]، والسفاريني[4].

بەڵگە بەو ئایەتە دەهێننەوە: ﴿وَيَومَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلأَرضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ وَكُلٌّ أَتَوهُ دَٰخِرِينَ﴾ [النمل: ٨٧]واتە: ئەی (موحەممەد (ﷺ) باسی) ئەو ڕۆژە بکە فو دەکرێ بە شەیپوردا جا هەرچی کەس لە ئاسمانەکان و زەویدایە دەترسێ و ڕادەچڵەکێ (هەمو دەمرن) جگە لەو کەسانەی الله بیەوێ (ئارام بن و نەمرن) وە هەموو بە ملکەچی و سەرشۆڕی دێنەوە لای الله.

یان ئەو فەرمودەیە: «ثم ينفخُ في الصورِ ثلاثَ نفخاتٍ نفخةَ الفزعِ ونفخةَ الصعقِ ونفخةَ القيامِ لربِّ العالمين[5]» واتە: فو دەکرێت بە صوردا سێ جار جارێک بۆ ترسانە جارێک بۆ مردن و گیاندانە جارێک بۆ هەڵسانەوەیانە بۆ خزمەت الله تعالى.

ئەو فەرمودە سەنەدی سەدا سەد دیار نیە و هەندێک لە زانایان و فەرمودەناسان بە وەرگیراویان داناوە و ئیمامی تەبەری ڕیوایەتی کردوە بەڵام زانای تر هەیە دەفەرموێ سەحیح نیە و وەرگیرا و نیە.

کورتەی باس شێخ ابن حجر العسقلاني دەفەرموێ: (ولا يلزم من مغايرة الصعق الفزع أن لا يحصلا معاً من النفخة الأولى[6]) واتە: لە فەرمودە و ئایەتەکانیش ئەوە وەرناگیرێ ئێمە بڵێین فەزەع و صەعیق ناوی هاتوە لەدوای ئەو بیکەینە دوو فو کردن بەڵکو ئەوە دەتوانین بڵێین لە یەک فو کردندا خەڵکەکە سام و هەیبەتی لێ دەنیشێت و فەزەعی توش دەبێ و لەگەڵ ئەو فەزەعەش دەم و دەست دەمرێ و گیان لە دەست دەدات و صەعیقی توش دەبێ.

[1] فتاوي شيخ الإسلام: (٢٦٠/٤).
[2] فتح الباري: (٣٦٩/١١) تذكرة القرطبي: ص ١٨٤.
[3] النهاية لابن كثير: (٢٥٣/١).
[4] لوامع الأنوار البهية: (١٦١/٢).
[5] ابن حجر العسقلاني، فتح الباري لابن حجر (٣٧٧/١١)، إسناده ضعيف ومضطرب.
[6] فتح الباري: (٣٦٩/١١).

ئیمامی القرطبي دەفەرموێ: (ونفخة الفزع هي نفخة الصعق، لأن الأمرين لازمين لها، أي: فزعوا فزعاً ماتوا منه[1]) واتە: فوکردنی فەزەع و صەعیق هەر یەک شتە نابێ لە یەک جیا بکرێتەوە چونکە لەگەڵ ئەوەی فو دەکرێت بە صوردا خەڵک سام و هەیبەت و ترسێکی زۆری لێ دەنیشێ لەگەڵ ئەو ترسەشدا دەم و دەست دەمرێ و صەعیقەی توش دەبێ چونکە هەردو شتەکان لازم و مەلزومی یەکن و پێکەوە دێن ترسێکیان لێ دەنیشێت ترسەکان زۆرە پێیەوە دەمرن.

ئەو فەرمودانەیش دەربارەی ئەوە هاتوە کە سێ فو کردنە زانایان فەرمویانە زەعیفە، لەوانە: (ابن حجر العسقلاني و البيهقي[2]).

ابن حزم دەفەرموێ چوار فوکردنە: (الأولى: نفخة إماتة، والثانية: نفخة إحياء، يقوم بها كل ميت، وينشرون من القبور، ويجمعون للحساب. والثالثة: نفخة فزع وصعق، يفيقون منها كالمغشي عليه، لا يموت منها أحد. والرابعة: نفخة إفاقة من ذلك الغشى[3]) واتە: یەکەمیان: هی مردنە، و دوەمیان: هی زیندوبونەوەیە، و خەڵکی هەموی پێی هەڵدەستنەوە لە گۆڕەکە، هی سێیەمیش: ترسانە بەهۆش خۆیان دێنەوە وەک چۆن یەکێک لە هۆشی خۆی چوبێت بڕێک ئاوی پێدا بکەی سەری بڵند بکات و بەهۆش خۆی بێتەوە تەواو بەهۆش خۆی دێتەوە و هەست دەکات چی ڕویداوە و چی بوە و هەموو شتەکان دێتەوە بەرچاوی، چوارەمیشیان: خەڵکی پێ کۆدەکرێتەوە بۆ حیساب لەگەڵ کردنیان.

بەڵام ئەوە ڕای دروست و بە بەڵگە و دەلیلترە زانایان دەفەرمون دوو فو کردنە نەک سێ و چوار لە فوکردنی یەکەم خەڵکی پێ دەترسێ و دەمرێ، لە فوکردنی دوەم خەڵکی پێ زیندودەبێتەوە.

---

[1] تذكرة القرطبي: ١٨٤.
[2] فتح الباري: (١١/٣٦٩).
[3] فتح الباري: (٦/٤٤٦).

**پرسێك:** ئایە ئەوانەی دەپارێزرێن لە صەعقە[1] كێن؟

**وەڵام:** ئیختیلاف و جیاوازی لەسەرە، الله تعالى دەفەرموێت: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُرُونَ﴾ [الزمر: ٦٨] واتە: كاتێ فوكرا بە كەڕەنادا (بە شەیپووردا) یەكسەر هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەكان و زەویدان دەمرن مەگەر كەسانێ الله بیەوێ (نەمرن) پاشان جارێكی تر فو دەكرێ بە كەڕەنادا جا لە پڕ هەموو ڕاست دەبنەوە چاوەڕوان دەكەن.

ابن حزم-رحمه الله- دەفەرموێ: (إلى أنهم جميع الملائكة، لأن الملائكة في اعتقاده أرواح لا أرواح فيها، فلا يموتون أصلاً[2] ) واتە: ئەوانەی صەعقەیان توش نابێت هەر هەموو فریشتەكانن، چونكە فریشتەكان خۆیان گیانن ئەوە نەبێت گیانیان لەبەربێ هەرگیز مردنیان بەسەردا نایەت.

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمویەتی: «إذا سمعتِ الملائكةُ كلامَه صعقوا [3] » واتە: كە مەلائیكەتەكان گوێبیستی وتەی الله تعالى بون توشی صەعقە دەبن.

ئەگەر ئەو فەرموودەیەی كە إبن تيمية هێناویەتیەوە دروست بێت زانایان دەفەرمون بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قسەكەی ابن حزم هەڵدەوەشێنێتەوە.

پێشەوا مقاتل و جگە لەویش دەفەرمون ئەوانەی صەعقەیان توش نابێ تەنها جوبرائیل و میكائیل و ئیسرافیل و و(ملك الموت)ن لە نێو فریشتەكان[4].

---

[1] صەعقە هەندێک لە زانایان دەفەرمون بە واتای مردن دێت هەندێكیش دەفەرمون بە واتای لەهۆش خۆچون دێت لەسەر بۆچونی جیاوازی زانایان.

[2] فتح الباري: (٣٧١/٦).

[3] ابن تيمية، مجموع الفتاوى (٣٥/١٦)، صحيح من غير وجه.

[4] الروح لابن القيم: ص ٥٠، وفتح الباري: (٣٧١/٦).

هەندێکی تر لە زانایان ئەو بۆچونەی مقاتل دەهێننەوە لەگەڵ ئەو بۆچونەدان دەڵێن بەڵام لەنێو فریشتەکانی تریش هەڵگرانی عەرشی الله تعالى ئەوانیش صەعقەیان توش نابێ[1].

ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش دەفەرموێ ئەوانە صەعقەیان توش نابێت کە لەناو بەهەشتن لە (الحور العين والولدان)ەکان أبوو إسحاق بن شاقلا کە یەکێکە لە زاناکانی مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، لەگەڵ الضحاك بن مزاحم دەفەرمون ئەوانەی ئیمامی ئەحمەد گوتویەتی (الحور العين والولدان)ەکان خزمەت کارەکانی بەهەشت وە ئەوانەی دەرگاوانی بەهەشتن لە فریشتەکانی دۆزەخ و جەهەنەمیش وە لەگەڵ ئەو مار و دوپشکانەی لەناو جەهەنەمن ئەوانەن صەعقەیان توش نابێت لەکاتی فوکردنی یەکەمجار بە صوردا لەلایەن ئیسرافیلەوە[2].

أبوو العباس القرطبي خاوەن کیتابی (المفهم إلى شرح مسلم) دەفەرموێ مەبەست پێی مردووەکانە صەعقەیان توش نابێ چونکە مردووەکان جارێک مردون و لە ژێر خاکن و گیانیان لە دەستداوە جارێکی تر صەعقەیان توش نابێت کاتێک فو دەکرێت بە صوردا[3].

جا بەڵێ ئەگەر صەعقە مەبەست پێی مردن بێت زانایان هەندێکی تریان دەفەرمون کەواتە ئەو قسەی أبوو العباس القرطبي ڕاست و دروستە کە دەفەرموێ الله تعالى فەرمویەتی: ﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلۡمَوۡتَ إِلَّا ٱلۡمَوۡتَةَ ٱلۡأُولَىٰ﴾ [الدخان: ٥٦] واتە: لە بەهەشتدا هەرگیز مردن ناچەژن جگە لە مردنی یەکەم جار.

ابن القيم لە کیتابی الروح دەفەرموێ: زانایان بۆچونیان جیاوازە لەوەی ئایە ڕۆح و گیان کاتێک فو دەکرێت بە صوردا جارێکی تر دەمرێت[4]. بەڵام لەسەر بۆچونی دروستی زانایان مردن هەر ئەوەندەیە لە لاشەی ئینسان جیا دەبێتەوە، ڕۆح مردنی بەسەردا نایەت، ئەوەیان

---

[1] فتح الباري: (٦/٣٧١).
[2] الروح لابن القيم: ص ٥٠، وفتح الباري: (٦/٣٧١).
[3] فتح الباري: (٦/٣٧٠).
[4] الروح، لابن القيم: ص ٤٩.

پەسەند و ڕاجیحە، وەک: (ابن القیم، إبن تیمیة، کۆمەڵێکی تر لە زانایان بەو شێوەیان فەرموە).

هەندێکی تر لە زانایان فەرمویانە بەڵکو ئەوانەی صەعقەیان بەسەردا نایەت (الحور العین)ەکان و ئەوانەی لە بەهەشتن صەعقەیان بەسەردا نایەت و ئەگەرنا ئەوانی تر بەسەریاندا دێت لەو زانایانەی وایان فەرموە لەوانە (إبن تیمیة-رحمه الله-، ابن القیم) لەگەڵ ئەو بۆچونەدان[1].

**پرسێك:** ئایە الله تعالی هیچ بەڵگەیەکی ڕاست و ڕەوانی لە قورئانی پیرۆز ناردوە یان لە حەدیسی سەحیح هاتوە کە ئەوانەی صەعقەیان توشیان نابێت کێن؟

**وەڵام:** نەخێر زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی هیچ بەڵگە و دەلیلێکی ڕاشکاوانە و سەحیح لەسەر ئەوە نیە دیاریکرابێ کێیە، ئیلا بە ئیجتیهاد و بۆچونی ئەو زانایانەی پێشتر دیاریکرا، وە بەهەمان شێوە هیچ حەدیسی سەحیحیش لەسەر ئەوە نیە، کەواتە بەشێک لە زانایان دەڵێن خۆمان بێدەنگ بکەین نەڵێین کێن ئەوانەی الله تعالی جیای کردونەتەوە و جیایان دەکاتەوە کە صەعقەیان توش نابێ لەکاتی فوکردن بە صوردا.

**پێناسەی زیندوبونەوەی ڕۆژی دوایی:** ئەو زیندوبونەوەیە الله تعالی لە دەیەها ئایەت جێگیری کردوە وە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەیەها فەرمودەی سەحیحی لەسەر فەرموە کە یەکێکە لەو خاڵە گرنگانەی کە ئەوەی بڕوای پێ نەبێت لە ئیسلام دەردەچێ و بە کافر لە قەڵەم دەدرێ، کە الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ﴾ [الزمر: ٦٨] واتە: کاتێ فوکرا بە کەڕەنادا (بە شەیپوردا) یەکسەر هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدان دەمرن مەگەر کەسانێ الله بیەوێ (نەمرن) پاشان جارێکی تر فو دەکرێ بە کەڕەنادا جا لە پڕ هەموو ڕاست دەبنەوە چاوەڕوان دەکەن.

[1] مجموع فتاوی شیخ الإسلام: (٢٦١/٤). الروح، لابن القیم: ص ٤٩.

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: «ثُمَّ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ، فَلاَ يَسْمَعُهُ أَحَدٌ إِلَّا أَصْغَى لِيتًا وَرَفَعَ لِيتًا، قَالَ: وَأَوَّلُ مَنْ يَسْمَعُهُ رَجُلٌ يَلُوطُ حَوْضَ إِبِلِهِ، قَالَ: فَيَصْعَقُ، وَيَصْعَقُ النَّاسُ، ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ- أَوْ قَالَ: يُنْزِلُ اللَّهُ- مَطَرًا، كَأَنَّهُ الطَّلُّ، أَوِ الظِّلُّ- نُعْمَانُ الشَّاكُّ- فَتَنْبُتُ مِنْهُ أَجْسَادُ النَّاسِ، ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ أُخْرَى ﴿فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ﴾ [الزمر: ٦٨][1]» واتە: پاشان فو دەکرێت بە صوردا، هیچ کەس گوێی لێ نابێت ئیلا مل دەسوڕێنێ و هەست ڕادەگرێ و سەری خۆی بەرز دەکاتەوە ملی بەدیار دەکەوێ، دەفەرموێ: یەکەم کەس کە گوێی لە دەنگی فوکردن بە صوردا دەبێت پیاوێکە و دەیەوێت وشترەکەی لە حەوزی ئاوەکە ئاو بدات، دەفەرموێ: ئەو پیاوە لەوێ لەهۆش خۆی دەچێ و گیانی دەردەچێ و دەمرێ، خەڵکەکانیش بەدوای ئەودا دەڕۆن و لەگەڵ فوکردنەکە بە صوردا و دەنگەکە کە دەیبیستن هەموویان دەمرن، الله تعالی دەینێرێ یان دایدەبەزێنێ ڕاویەکە لە بەینی ئەو دوو وشەیە گومانی هەیە، الله تعالی بارانێک دادەبەزێنێ، ئەو بارانە ئەوەندە چڕ و پڕە هەر دەڵێی سێبەرێکە دروستی کردوە لەسەر ڕوی زەوی بەو شێوەیە بە خوڕ دێتە خوارەوە، بەهۆی ئەو بارانەوە الله تعالی لاشەکان زیندو دەکاتەوە و شینیان دەکاتەوە پاشان جارێکی تر فوی پیادا دەکرێت: ﴿فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ﴾ [الزمر: ٦٨] واتە: جا لە پڕ هەموو ڕاست دەبنەوە چاوەڕوان دەکەن.

وە الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يُرۡسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَيۡ رَحۡمَتِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ سَحَابٗا ثِقَالٗا سُقۡنَٰهُ لِبَلَدٖ مَّيِّتٖ فَأَنزَلۡنَا بِهِ ٱلۡمَآءَ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ كَذَٰلِكَ نُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾ [الأعراف: ٥٧] واتە: وە ئەو (الله) زاتێکە بایەکان دەنێرێ بە موژدەدەر پێش (بارانی ڕەحمەتی) پەروەردگار هەتا کاتێ هەوری قورس(ی باراناوی) هەڵدەگرن دەینێرین بۆ وڵاتێکی مردو (وشکی بێ گیا) جا بەو (هەورە) باران دەبارێنین بە هۆی ئەوەوە هەموو جۆرە بەروبوم و میوەیەك (دەڕوێنین و) دەردەهێنین هەر بەو شێوەیەش مردوەکان لەزەوی دەر دەهێنین (زیندویان دەکەینەوە) بەشکو ئێوە بیربکەنەوە.

[1] صحيح مسلم (٢٩٤٠)، سنن أبي داود (٢٤٨٢)، مسند أحمد (٦٥٥٥) (٦٨٧١) (٦٩٥٢).

کەواتە بەڵێ، مرۆڤەکان زیندو دەکرێنەوە لە کوێ و چۆن، پێغەمبەری الله (ﷺ) دەفەرموێ: «وَلَيْسَ مِنَ الْإِنْسَانِ شَيْءٌ إِلَّا يَبْلَى، إِلَّا عَظْمًا وَاحِدًا وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ، وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[١]» واتە: هیچ شتێکیش نییە لە مرۆڤ کە نەڕزێت جگە لە یەك ئێسك ئەویش کلێنچکەیە، لەو کلێنچکەوە دروستکراوەکان پێکدەهێنرێنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا.

عیلم و زانستی ئێستاش تەجروبەیان لەسەر کردوە لەناو نەچوە و لەناو ناچێت لەبەر ئەوەی ئەوە موعجیزە و گەورەیی الله تعالی دەردەخات و خەڵکەکەی دەستەوەستان کردوە بتوانن ئەو شتە لەناو ببەن، چەندەها جار لە کورەی زۆر گەرمدا سوتێنراوە وە بە ئاسنی زۆر بەهێزەوە لەنێوان دوو ئاسندا دانراوە بە چەندەها طەن لێدراوە هەروەکو خۆی ماوەتەوە، ئەو شتە بچوکە لە کلێنچکەی ئینساندا هەیە کە الله تعالی لەوەوە مرۆڤی دروست کردوە وە لەوەشەوە جارێکی تر زیندوی دەکاتەوە.

ئینجا زیندوبونەوە خۆی لە خۆیدا دروست بونەوەیەکی نوێیە و ژیانێکی تری نوێیە، کاتێک کە الله تعالی مرۆڤەکان زیندودەکاتەوە زیندوبونەوە بە نەوعە لاشە و جەستە و شێواز و توانایەکی ترە کە الله تعالی بە مرۆڤەکانی دەبەخشێ کە بتوانن و لێی ڕابێن و تەحەمول بکەن بۆ مەیدانی حەشر و حیساب لە پاشان بۆ ناو بەهەشت و بۆناو جەهەنەمیش ئەو لاشە و جەستانەی دونیایە ڕەنگە عەزابەکە تەواو نەتوانن تام بکەن زو زو لەناو دەچن لە نێو ئاگری دۆزەخ، بەڵام یەکێک لە عەزابەکانی ئاگری دۆزەخ ئەوەیە لاشە و جەستەکان گەورە دەبن و تەحەمولی ئەو عەزابە ناڵێین دەکەن بەڵام لەبەر ئەوە بەو شێوەیە بنیات دەنرێنەوە و دروست دەکرێنەوە کە زیاتر و زۆرتر تامی عەزابەکە بکەن بۆ ئەوەی ئێش و ئازار و ژانەکانیان پێ بگات، عمرو بن میمون الأودي دەفەرموێ: «قَامَ فِينا مُعاذُ بنُ جَبَلٍ، فقالَ: يا بَني أَوْدٍ، إنيِّ رسولُ رسول اللهِ (ﷺ)، تَعْلَمونَ المَعادَ إلى اللهِ، ثُمَّ إلى الجَنَّةِ أَوْ إلى النّارِ، وإقامَةٌ لا ظَعْنَ فيه، وخُلودٌ لا مَوْتَ في أَجْسادٍ لا تَموتُ[٢]» واتە: موعازی کوڕی جەبەل لەناومان

[١] صحيح البخاري (٤٨١٤) (٤٩٣٥)، صحيح مسلم (٢٩٥٥)، سنن أبي داود (٤٧٤٣).

[٢] الحاكم، المستدرك على الصحيحين (٢٨٤)، صحيح الإسناد.

هەستایەوە و گوتی: من نوێنەری پێغەمبەرم (ﷺ) قسەی پێغەمبەری اللەتان پێ دەڵێم، ئایە ئێوە دەزانن گەڕانەوەیەک (زیندوبونەوەیەک) هەیە بۆلای الله، لە پاشان چونە بەهەشت و چونە ئاگر هەیە، بە دڵنیاییەوە دڵنیابن هیچ گومانی تێدا نیە هەمیشە ژیانی دواڕۆژ و مردن نیە لە پاشان لاشەکان لەناوچونیان بۆ نیە.

## یەکەم کەس کە زەوی بۆ لەت دەبێ لە زەویەوە دێتە دەرەوە:

ئەوەشیان پلە و پایەیەکە دیارە دەبەخشرێ بە زاتێکی بەرز و بەڕێزی وەکو پێغەمبەر (ﷺ)، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَأَوَّلُ مَنْ يَنْشَقُّ عَنْهُ الْقَبْرُ، وَأَوَّلُ شَافِعٍ وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ[1]» واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا من گەورەی ڕۆڵەکانی ئادەمم، یەکەم کەسیشم سەرلە گۆڕ دێنمە دەر، یەکەم شەفاعەتکارم و یەکەم شەفاعەت وەرگیراوم.

لە ڕیوایەتێکی تر هاتوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «يَصْعَقُ النَّاسُ حِينَ يَصْعَقُونَ، فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ قَامَ، فَإِذَا مُوسَى آخِذٌ بِالْعَرْشِ، فَمَا أَدْرِي أَكَانَ فِيمَنْ صَعِقَ؟. رَوَاهُ أَبوو سَعِيدٍ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)[2]» واتە: فو دەکرێت بە صوردا ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویە ئیلا ئەوەی الله حەز بکات دەمێنێتەوە ئەوانی تر هەمویان دەمرن، پاشان جارێکی تر فو دەکرێت بە صوردا من یەکەم کەسم کە زیندو دەکرێمەوە، دەڵێ چاو هەڵدێنم و تەماشا دەکەم یەکەم کەسم زیندو دەکرێمەوە دەبینم موسا لە ژێر عەرشی الله تعالى یە، لە ڕیوایەتێکی تر دەڵێ موسا بە یەکێک لە پێچکەکانی عەرشی الله خۆی گرتوە، جا من نازانم ئایە موسا صەعقەی توش نەبوە تەنها ئەو صەعقەی کە لە کێوی طور الله ئەوەی بۆ حیساب کردوە واتە هەر نەمردوە و زیندوبونەوەی لەبەر ئەوەیە بۆ نەبوە یان ئەوەیە موسا لە پێش من زیندو کراوەتەوە، ئەگەرنا کەس لە پێش من زیندو ناکرێتەوە.

[1] صحيح مسلم (٢٢٧٨) (٢٣٧٣)، صحيح البخاري (٢٤١١) (٣٣٤٠) (٣٤٠٨)، سنن أبي داود (٤٦٧١) (٤٦٧٣).
[2] صحيح البخاري (٦٥١٨) (٢٤١١) (٢٤١٢)، صحيح مسلم (٢٢٧٨) (٢٣٧٣)، سنن أبي داود (٤٦٧١) (٤٦٧٣).

**پرسیار:** لەدوای ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) و خەڵکەکەی تریش زیندوکرانەوە ئایە چیان لێدەکرێت ئەو خەڵکە؟

**وەڵام:** ئەو خەڵکە دەبردرێن و کۆدەکرێنەوە بۆ مەیدانێک کە پێی دەگوترێت مەیدانی حەشر و حیساب، الله تعالى دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ يَوۡمٞ مَّجۡمُوعٞ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوۡمٞ مَّشۡهُودٞ﴾ [هود: ١٠٣] واتە: ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە کە ئادەمی بۆ کۆ دەکرێتەوە و ئەوە ڕۆژێکی دیار و بەرچاوە (هەموان ئامادەن تێی)دا.

﴿قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَوَّلِينَ وَٱلۡأٓخِرِينَ * لَمَجۡمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوۡمٖ مَّعۡلُومٖ﴾ [الواقعة: ٤٩-٥٠] واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ بێگومان هەموو پێشینان و پاشینان * کۆدەبنەوە بۆکاتی ڕۆژێکی دیاریکراو، ئەویش کاتی ڕۆژی قیامەتە.

﴿أَيۡنَ مَا تَكُونُواْ يَأۡتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ [البقرة: ١٤٨] واتە: لەهەر کوێبن الله هەموتان کۆدەکاتەوە بەڕاستی الله بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا.

﴿إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا * لَّقَدۡ أَحۡصَىٰهُمۡ وَعَدَّهُمۡ عَدّٗا * وَكُلُّهُمۡ ءَاتِيهِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَرۡدًا﴾ [مريم: ٩٣-٩٥] واتە: بەڕاستی هەرچی لەناو ئاسمانەکان و زەویدایە هەموو بە بەندێتی و خوڵامەتی دێنە لای پەروەردگاری بەخشەر و ملکەچی دەبن * سوێند بە الله بەڕاستی هەمویانی سەرژمێری کردوە بە ژماردن * هەر هەمویان بە تاك و تەنها دێنەوە بۆ لای (الله) لە ڕۆژی قیامەتدا.

﴿وَحَشَرۡنَٰهُمۡ فَلَمۡ نُغَادِرۡ مِنۡهُمۡ أَحَدٗا﴾ [الكهف: ٤٧] واتە: هەموو (خەڵکی) کۆ دەکەینەوە و هیچ کەسیان بەجێ ناهێڵین.

جا مرۆڤەکان و جنۆکەکان و فریشتەکان و هەتا ئاژەڵەکان و گیانلەبەرەکانی تریش کۆدەکرێتەوە بۆ مەیدانی حەشر و حیساب، زانایان تەنها ئیختیلاف و جیاوازیەکیان لەسەر ئەوە هەیە ئایە گیانلەبەران و ئاژەڵان کۆدەکرێنەوە لەوێ و چیشیان بەسەر دێت لەوانە إبن تیمیة -رحمه الله- دەفەرموێ: (وأما البهائم فجميعها يحشرها الله سبحانه، كما دل عليه الكتاب

والسنة، قال تعالى: ﴿وَمَا من دَآبَّة في ٱلأَرض وَلَا طَٰئِر يَطِيرُ بِجَنَاحَيه إِلَّآ أُمَمٌ أَم ثَالُكُم مَّا فَرَّطنَا في ٱلكِتَٰبِ من شَيء ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم يُحشَرُونَ﴾ [الأنعام: ٣٨]، وقال تعالى: ﴿وَإِذَا ٱلوُحُوشُ حُشِرَت﴾ [التكوير: ٥]، وقال تعالى: ﴿وَمِن ءَايَٰتِهِۦ خَلقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلأَرضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا من دَآبَّة وَهُوَ عَلَىٰ جَمعِهِم إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ﴾ [الشورى: ٢٩][1]) واتە: بەڵێ گیانلەبەرەکانی تریش لە ئاژەڵ و تەیر و تار و باڵندەکانیش کۆ دەکرێنەوە و ڕۆحیان وەبەر دەهێنرێتەوە و بۆ مەیدانی حەشر و حیساب دەهێنرێن، کە الله تعالى فەرمویەتی: ﴿وَمَا من دَآبَّة في ٱلأَرضِ وَلَا طَٰئِر يَطِيرُ بِجَنَاحَيهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَم ثَالُكُم مَّا فَرَّطنَا فِي ٱلكِتَٰبِ مِن شَيء ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم يُحشَرُونَ﴾ [الأنعام: ٣٨] واتە: هیچ زیندەوەر و گیانلەبەرێک نیە کە بەسەر زەویدا بڕوات  هەموو باڵندەیەکیش کە بە دوو باڵان دەفڕێ هەموو ئەمانە چەند ئوممەتێکن وەکو ئێوە (دروستکراوی خۆمانن و یاسای تایبەتیان داناوە بۆ ژیانیان) هیچ شتێکمان فەرامۆش نەکردوە لەم کتێبەدا (لوح المحفوظ یا قورئان)دا پاشان ئەوانە (لە ڕۆژی دوایی)دا لای پەروەردگاریان کۆدەکرێنەوە. وە فەرمویەتی: ﴿وَإِذَا ٱلوُحُوشُ حُشِرَت﴾ [التكوير: ٥] واتە: ئەوانەی کە عەقڵ و هۆشیان نیە لە حەیوان و ئاژەڵەکان ئەوانەش کۆ دەکرێنەوە و حەشریان دەکرێت. وە فەرمویەتی: ﴿وَمِن ءَايَٰتِهِ خَلقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلأَرضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا من دَآبَّة وَهُوَ عَلَىٰ جَمعِهِم إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ﴾ [الشورى: ٢٩] واتە: وە لە بەڵگەکانی (دەسەڵاتی) اللەیە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و و ئەو زیندەوەر و جم و جووڵکەرانە تییایاندا بڵاو بوونەتەوە وە الله هەر کاتێ بیەوێ بە توانایە بەسەر کۆکردنەوەیاندا.

بەڵام ئیمامی القرطبي دەفەرموێ: (واختلف الناس في حشر البهائم، وفي قصاص بعضها من بعض، فروي عن ابن عباس أن حشر البهائم موتها، وقاله الضحاك. وروي عن ابن عباس في رواية أخرى أن البهائم تحشر وتبعث، وقاله أبوو ذر وأبوو هريرة وعمرو بن العاص، والحسن البصري وغيرهم، وهو الصحيح، لقوله تعالى: ﴿وَإِذَا ٱلوُحُوشُ حُشِرَت﴾ [التكوير: ٥]، ﴿وَمَا من دَآبَّة فِي ٱلأَرضِ وَلَا طَٰئِر يَطِيرُ بِجَنَاحَيهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمثَالُكُم مَّا فَرَّطنَا فِي ٱلكِتَٰبِ من شَيء ثُمَّ إِلَىٰ

[1] مجموع فتاوي شيخ الإسلام: (٤/٢٤٨).

رَبِّهِم يُحشَرُونَ﴾ [الأنعام: ٣٨]. قال أبو هريرة يحشر الله الخلق كلهم يوم القيامة: البهائم، والطير، والدواب، وكل شيء، فيبلغ من عدل الله أن يأخذ للجماء من القرناء، ثم يقول: كوني تراباً، فذلك قوله تعالى حكاية عن الكفار ﴿وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا﴾ [النبأ: ٤٠](١)

واتە: ئیختیلاف و جیاوازی ڕاستە هەیە لەسەر ئەوەی کە ئایە ئاژەڵەکان حەشر دەکرێن یان نا، بەڵام بۆچونی دروست لەسەر ئەوەیە کە حەشر دەکرێن و کۆدەکرێنەوە، لەبەر بەڵگە سەحیحەکان کە پێغەمبەریش (ﷺ) لێی ڕیوایەت کراوە و گێڕدراوەتەوە کاتێک کە کۆمەڵێک لە زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە لەوانە ئیبنو عەباس فەرمویانە بەڵێ ئاژەڵەکان زیندو دەکرێنەوە و حەشریشیان دەکرێت و کۆدەکرێنەوە ئەوەیان بۆچونی دروستە ئەوانەشیان کردوە بە بەڵگە: ﴿وَإِذَا ٱلوُحُوشُ حُشِرَت﴾ [التكوير: ٥] واتە: ئەوانەی کە عەقڵ و هۆشیان نیە لە حەیوان و ئاژەڵەکان ئەوانەش کۆ دەکرێنەوە و حەشریان دەکرێت. ﴿وَمَا من دَآبَّة فِي ٱلأَرضِ وَلَا طَٰئِر يَطِيرُ بِجَنَاحَيهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمثَالُكُم مَّا فَرَّطنَا فِي ٱلكِتَٰبِ من شَيء ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم يُحشَرُونَ﴾ [الأنعام: ٣٨] واتە: هیچ زیندەوەر و گیانلەبەرێک نیە کە بەسەر زەویدا بڕوات هەموو باڵندەیەکیش کە بە دوو باڵان دەفڕێ هەموو ئەمانە چەند ئوممەتێکن وەکو ئێوە (دروستکراوی خۆمانن و یاسای تایبەتیمان داناوە بۆ ژیانیان) هیچ شتێکمان فەرامۆش نەکردوە لەم کتێبەدا (لوح المحفوظ یا قورئان)دا پاشان ئەوانە (لە ڕۆژی دوایی)دا لای پەروەردگاریان کۆدەکرێنەوە. أبوو هريرة دەفەرموێ: هەموو بەدیهێنراوەکان الله تعالى لە ڕۆژی دوایدا کۆیان دەکاتەوە: هەموو ئەوانەی گیانلەبەرن ئاژەڵەکان، باڵندەکان، ئەوانەی کرمۆلەن یان لەسەر سکن و دەخشن وەکو مار و کرم و... وە ئەوانەی چوار پێشن و دەڕۆن، وە هەموو شتەکانی تریش، ئەوە دادوەری و عەدالەتی اللهیەکە لەوێدا ئاژەڵە بێ قۆچەکان تۆڵەی ئاژەڵە بە قۆچەکانیان لێ دەستێنێتەوە کە قۆچیان لێیان دابێت پاشان الله فەرمانیان پێدەدات دەفەرموێ ببنە خۆڵ و گڵ ئەوان چونە بەهەشت و دۆزەخیان نیە ئا ئەوەشە گێڕانەوەی الله تعالى کە ئایەتی قورئانی لەسەر هێناوە و فەرمویەتی: ﴿وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا

---

(١) تذكرة القرطبي: ٢٧٣.

لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا﴾ [النبأ: ٤٠] واتە: ئەو دەمە کافر و بێ بڕوایش دەڵێت: ئای خۆزگە هەر خاك و خۆڵ بومایە نەك ئادەمی.

**پرسێك:** ئایە مرۆڤەکان کە دەبردرێن بۆ مەیدانی حەشر و حیساب شێوە و شکڵیان چۆنە و چیان لەبەردایە و سیفەتی ئەو کۆبونەوەیە چۆنە؟

**وەڵام:** عائیشە -رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا- دەڵێ: لە پێغەمبەری اللهم (ﷺ) بیست کە دەیفەرموو: «يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، النِّسَاءُ وَالرِّجَالُ جَمِيعًا يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ؟ قَالَ (ﷺ): يَا عَائِشَةُ، الْأَمْرُ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يَنْظُرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ[١]» واتە: خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا بەپێی پەتی و ڕوت و قوتی و خەتەنە نەکراوی حەشر دەکرێن گوتم: ئەی پێغەمبەری الله، ژنان و پیاوان هەموو لەناویەکدا هەندێکیان تەماشای هەندێکیان دەکەن؟ ئەویش (ﷺ) فەرموی: کارەکە لەوە سەختترە کە هەندێکیان تەماشای هەندێکیان بکەن.

فەرمودەیەکی تری پێغەمبەرمان هەیە (ﷺ) هەندێک لە زانایان دەفەرمون لەگەڵ ئەو فەرمودەدا ئیشکالێکی لەسەر دروست دەبێت بەڵام زانایەکی ناودار و بەڕێز لەوانە ئیمامی بەیهەقیە چارەسەری کردوە جوان و ڕێک بۆمان ڕون دەکاتەوە ئێمەش بۆتان دەهێنینەوە.

ئەویش ئەو فەرمودەیە کە لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە: «أَنَّهُ لَمَّا حَضَرَهُ الْمَوْتُ دَعَا بِثِيَابٍ جُدُدٍ فَلَبِسَهَا، ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: إِنَّ الْمَيِّتَ يُبْعَثُ فِي ثِيَابِهِ الَّتِي يَمُوتُ فِيهَا[٢]» واتە: کە لە کاتی سەرەمەرگدا داوای جل و بەرگە تازەکانی کرد بۆیان هێنا لەبەری کرد، پاشان فەرموی: بیستم لە پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموی: (بێگومان مردو بەو پۆشاک و جل و بەرگەوە زیندو دەکرێتەوە کە کاتێک مردوە لەبەریدا بوە).

[١] صحيح البخاري (٦٥٢٧)، صحيح مسلم (٢٨٥٩)، سنن النسائي (٢٠٨٣) (٢٠٨٤).

[٢] سنن أبي داود (٣١١٤).

لێرە لەلایەک پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی حەشریان دەکرێت و کۆدەکرێنەوە بە پێ پەتی بە ڕوت و قوتی بە خەتەنە نەکراوی لەلایەکی تریش ئەبو سەعیدی خودری دەڵێ گوێبیستی پێغەمبەر (ﷺ) بوم فەرمویەتی مردو بە چ شمەکێکەوە بمرێت بەو شمەکەشەوە زیندو دەکرێتەوە، ئایە دەکرێت لە یەک کاتدا کەسەکە بڵێین ڕوتە و بەو شمەکەش زیندو بکرێتەوە ئەو جل و بەرگەشی لەبەردا بێت؟ ئیمامی بەیهەقی دەفەرموێ: (وقد وفق البيهقي بين هذا الحديث وسابقه بثلاثة أوجه:

الأول: أنها تبلى بعد قيامهم من قبورهم، فإذا وافَوْا الموقف يكونون عراة، ثم يلبسون من ثياب الجنة.

الثاني: أنه إذا كسي الأنبياء ثم الصديقون، ثم من بعدهم على مراتبهم فتكون كسوة كل إنسان من جنس ما يموت فيه، ثم إذا دخلوا الجنة لبسوا من ثياب الجنة.

الثالث: أن المراد بالثياب ها هنا الأعمال، أي يبعث في أعماله التي مات فيها من خير أو شر، قال الله تعالى: ﴿وَلِبَاسُ التَّقْوَىَ ذَلِكَ خَيْرٌ﴾ [الأعراف: ٢٦]، وقال: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ [المدثر: ٤].

واستشهد البيهقي على هذا الجواب الأخير بحديث الأعمش، عن أبي سفيان، عن جابر، قال: قال رسول الله (ﷺ): يبعث كل عبد على ما مات عليه[1]) واتە: من ئەو سێ وەڵامەم هەیە بۆ ڕێک و پێککردن لە نێوان ئەو دوو مانایەی ئەو دوو حەدیسەدا ئیشکالی نەمێنێت:

١. من پێموایە خەڵکەکە لەناو گۆڕەکەی یەکەمجار زیندو دەکرێتەوە بەو جل و بەرگە زیندو دەکرێتەوە و چاو هەڵدەهێنێ و هەڵدەستێتەوە کە تێیدا مردوە و لەبەریدا بوە لەکاتی گیان کێشان و مردنەکەی، بەڵام دواتر دەڕزێت شمەکەکە بە ماوەیەکی زۆر کەم و کورت ئینجا کە دەیهێنن بۆ مەیدانی حەشر و حیساب و مەوقیف ڕای دەگرن لەوێ بە ڕوت و قوتی ماوەتەوە و جل و بەرگەکەی ڕزیوە، ئینجا لەوێوە ئەو کەسانەی شایستەن و ئەهلی بەهەشتن الله تعالى فەرمان دەکات جل و بەرگی بەهەشتیەکانی لەبەر بکەن.

[1] النهاية لابن كثير: (٢٨٨/١).

٢.لە پاش ئەوەی پێغەمبەران جل و بەرگیان بەبەردا دەکرێت لەو مەیدانەدا لە پاشان ڕاستگۆیەکان، لە پاشان پلە پلە ئەوەی لە ئەوان نزمتر واتە شەهیدەکان دێت ئینجا خەڵکەکەی تر لە دوای ئەوان ئەوەی پلەی لەوان نزمترە جل و بەرگی هەریەک لەوانە بەگوێرەی ئەوە لەبەری دەکرێت کە پێیوە مردوە بە جل و بەرگەکە، ئەگەر ئەو جل و بەرگەی پێیوە مرد جل و بەرگێکی جوان و ڕێک و پێک و باش بێت ئەو کاتە لەوێدا جل و بەرگێکی جوان ڕێک و پێکی باشیان لەبەر دەکرێت، پاشان ئەگەر بردرانە ناو بەهەشتیش جل و بەرگی بەهەشتیەکانیان لەبەر دەکەن ئەوەیان لەبەردا دادەکەنن.

٣ مەبەست بە جل و بەرگ لە زمانی عەرەبی ئەو مانایەی لێ وەردەگیردرێت کە بڵێین بەو جل و بەرگە کە دەمرێ زیندو دەکرێتەوە مەبەست پێی کردەوەکانە واتا بەو عەمەل و کردەوەی کە لەسەری دەمری و ئاخر کردەوە و عەمەلت چی بوە لەسەر ئەو عەمەل و کردەوەش جارێکی تر زیندو دەکرێیتەوە نەک ئەو جل و بەرگەی کە تۆی داپۆشیوە، لەسەر چ عەمەلێک مردوە خێر یان شەڕ لەسەر ئەوە زیندو دەکرێتەوە، وەکو الله تعالى فەرمویەتی: ﴿وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ ذَٰلِكَ﴾ [الأعراف: ٢٦] واتە: بەڵام پۆشاکی ترسان لە الله و پارێزگاری چاکتر و باشترە. وە فەرمویەتی: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ﴾ [المدثر: ٤] واتە: دڵ و دەرونت، کارو کردارت هەموی بەخاوێن رابگرە.

جا ئیمامی بەیهەقیش لەسەر ئەو وەڵامەی سێیەمیان ئەو فەرمودەیەی هێناوەتەوە: جابر الله لێی ڕازی بێت دەڵێ: لە پێغەمبەری اللهم (ﷺ) بیست کە دەیفەرموو: (هەموو کەس لەسەر ئەو حاڵەتە زیندو دەکرێتەوە کە لەسەری مردوە).

ئەو کەسە وەڵامی چیە بۆ الله تعالى کاتێک بتڵی ئارەقی بە دەستەوەیە و دەمرێ بە بتڵی ئارەقەوە؟ زیندو دەبێتەوە بە بتڵی ئارەقەوە، ئەو کەسە وەڵامی چیە بۆ الله ئەو گەنجەی مۆبایلی لە دەستدایە و فیلمی ڕوت و قوتی کردوەتەوە و لەقتەیەکە تەماشای دەکات؟ مایە پوچە هەم لە دونیا (ئەگەر بمێنێ)، ئەگەر لەسەر ئەو بار و حاڵە مرد وەڵامی چیە بۆلای الله؟

بە خۆی و ئەو لەقتە ناشرین و نارێک و بەد ڕەوشتیە دەگاتەوە خزمەت الله و زیندو دەکرێتەوە، ئەو کەسە وەڵامی چیە بۆ الله تعالی کە لە شوێن و بارەگایەک دانیشتبێت (پەڕلەمان) لەوێ بڕیار بدات دژی قورئان و ئیسلام و موسڵمانان یان تەهدیدی مامۆستایان و پیاوە حەق بێژ و دیندارەکان بکات؟ لەوێدا ئەگەر ڕۆح و گیانت دەرچو هەر لەسەر ئەو کردارە لەسەر ئەو کەچە مێزە زیندو دەکرێیتەوە بە دڵنیایەوە لە بەرامبەر الله ڕادەوەستێنرێیتەوە، ئەو کەسە وەڵامی چیە کۆنترۆڵەکەی لە دەستدایە و پێیوایە شەو تاریکە کەسیشی لە ماڵەوە نیە شاشە شەیتانیەکەی لە بەرامبەرە (کە سەتەلایتەکەیە یان کۆمپیوتەرەکەیە) فلیمی ڕوت و قوت لێدەدا بە کەیفی خۆی ترسی اللەی لە دڵدا نەماوە لە ناکاو ئەگەر الله تعالی (ملك الموت)ی نارد و مرد؟ لەسەر ئەو کار و کردەوە زیندو دەکرێتەوە، بەڵێ زۆر کەس هەبوە لەناو گوناحدا ڕۆحی کێشراوە و بە نمونەش هێنراوەتەوە.

جا لەبەر ئەوە پێویستە هەموو ڕۆژ و شەو و کاتەکانمان هەموی بترسێین لە الله تعالی، تێکەڵ بین لەگەڵ قورئان خوێندن و لەگەڵ زیکرەکان و یادی الله تعالی، لە پاشان ئەگەر وامان کرد لە دونیادا سەر بڵندین، کێ لە دونیادا زۆر ئازایە؟ ئەوانەی الله تعالی یان تەواو ناسیوە و دەزانن ئەجەل بە دەست اللەیە، ڕزق و ڕۆزیش بە دەست اللەیە، منەتی هیچ کەسێک نازانن، دەزانن الله تعالی هەر کاتێک (ملك الموت)یان بۆ بنێرێت ئەو ئەجەلە ڕەت نابێتەوە، لە ژیانیاندا کردەوەی چاکیان کردوە و دڵ و ویژدانی خۆیان مورتاح کردوە لەبەرامبەر شاشەکاندا حەقیان گوتوە منەتی کەسیان هەڵنەگرتوە لە الله نەبێ لە کەسی تر نەترساون، ئەوانە ئامادەن کە (ملك الموت) بێت و ڕۆح و گیانیان دەکێشرێت لەسەر خێر و چاکە و هەر لەسەر ئەوەش زیندو دەبنەوە، ئەو کەسەی ئەهلی مزگەوت بێت بەڕاستی یان لەناو مزگەوتدا ڕۆحی دەکێشرێ یان لە ڕێگای مزگەوتدا ڕۆحی دەکێشرێ یان لە مزگەوت دێتەوە بەرەو ماڵەوە و هەر خێرە ڕۆحی دەکێشرێ یان لەسەر جێگایە و دڵی بەوەوەیە چ کاتێک کاتی مزگەوت دادێتەوە و بچێتە مزگەوت لەو حاڵەتە ڕۆحی دەکێشرێ، خۆشبەختی بۆ ئەو کەسانەی لە مزگەوت یان بەرەو مزگەوت بێت یان لە مزگەوت بچێتەوە یان لەناو

مزگەوت بێت یان لە خەیاڵ و دڵ و هۆشیدا پەیوەست بێت بە مزگەوتەوە و ڕۆح و گیانی دەربچێت لەسەر ئەو حاڵ و باڵەی زیندو دەکرێتەوە.

عەبدوڵای کوڕی عومەر -رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَ- دەڵێ: لە پێغەمبەری اللهم (ﷺ) بیست، کە دەیفەرموو: «إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ عَذَابًا أَصَابَ الْعَذَابُ مَنْ كَانَ فِيهِمْ، ثُمَّ بُعِثُوا عَلَى أَعْمَالِهِمْ[١]» واتە: هەر کاتێك الله ویستی سزای هۆزێك بدات، سزاکە توشی ئەو پیاوچاکانەش دەبێت کەلەنێوانیاندان، پاشان الله هەریەکەیان لەسەر کاروکردەوەی خۆیان زیندو دەکاتەوە.

ابن عباس -رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَ- دەڵێ: «خَرَّ رَجُلٌ مِنْ بَعِيرِهِ فَوُقِصَ، فَمَاتَ. فَقَالَ: اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ، وَلَا تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّيًا[٢]» واتە: پیاوێك لە حوشترەکەی بەربۆوە و ملی شکا و مرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: بە ئاو و سیدر (سیدر لەجێی سابونی ئێستا بەکار دەهات) بیشۆن و لەهەردو پۆشاکەکەی خۆیدا کفنی بکەن، سەری دامەپۆشن، چونکە لەڕۆژی قیامەتدا الله تعالی بەدەم (لبیك) وتنەوەوە زیندوی دەکاتەوە.

لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمویەتی: «ولا تُمِسُّوه بطيب» واتە: بۆنی خۆشی لێمەدەن[٣].

ئەو کەسانەشی لە پێناو الله تعالی شەهید دەبن پلەی شەهیدی پلەیەکی یەکجار گەورە و مەزنە الله تعالی نایدات بە هەموو کەسێک (یا الله لێت دەپاڕێینەوە بۆ خاتری گەورەیی خۆت پێمان ببەخشی و پێمان بدەیت) شەهید کاتێک لە مەیداندا خوێنی لێ دەهێنرێت گولەی بەر دەکەوێت شمشێری بەر دەکەوێت تیری بەر دەکەوێت لەبەر خاتری الله تعالی سینگی کردوەتەوە لە الله نەبێ لە کەس ناترسێ بەرگری دەکات لە دینی الله تعالی بوێرانە شێرانە

---

[١] صحيح مسلم (٢٨٧٩) صحيح البخاري (٧١٠٨)، مسند أحمد (٤٩٨٥) (٥٨٩٠) (٦٢٠٧).

[٢] صحيح البخاري (١٢٦٦) (١٢٦٥) (١٢٦٧)، صحيح مسلم (١٢٠٦)، سنن أبي داود (٣٢٣٨) (٣٢٤١).

[٣] چونکە بۆنی خۆش لە کاتی ئیحرامدا حەرامە حاجیەکان و ئەوانەی لە دوای جل و بەرگی ئیحرامن بەکاری بێنن.

لە مەیداندا ڕادەوەستێ ئەو کەسانەی بەو شێوەیەن لە پێناو الله تعالی با بزانین پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی چۆن زیندو دەبنەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «تَضَمَّنَ اللَّهُ لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِهِ، لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَإِيمَانًا بِي وَتَصْدِيقًا بِرُسُلِي، فَهُوَ عَلَيَّ ضَامِنٌ أَنْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ أَرْجِعَهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ، نَائِلًا مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ. وَالَّذِي نَفْسُ موحەممەد بِيَدِهِ، مَا مِنْ كَلْمٍ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِلَّا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَهَيْئَتِهِ حِينَ كُلِمَ، لَوْنُهُ لَوْنُ دَمٍ وَرِيحُهُ مِسْكٌ[1]» واتە: الله تعالی دەستەبەری ئەو کەسەی کردوە کە لە پێناوی ئەودا دەربچێت و فەرمویەتی: هەرکەس دەرچونەکەی تەنها لەڕێگەی مندا و باوەڕ بەمن و بەڕاست زانینی پێغەمبەرەکانمدا بێت ئەوە من زامنی ئەوەی بۆ دەکەم بیخەمە بەهەشت، یان بیگێڕمەوە بۆ ئەو ماڵەی لێی دەرچوە لەگەڵ ئەوەی بەدەستی هێناوە لەپاداشت و دەستکەوتی جەنگ سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە هیچ برینێك نییە کەلەڕێگەی اللەدا کرابێت مەگەر کاتێك (خاوەنەکەی) لە ڕۆژی قیامەت دێت و زیندو دەبێتەوە وەکو خۆی چۆن بریندار بوە لەو کاتەدا بریندار بوە ڕەنگی برینەکەی ڕەنگی خوێنە و بۆنەکەیشی بۆنی میسکە.

لەبەر ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) کردویەتی بە سونەت کاتێک کەسێک لە سەرەمەرگە پێویستە ئەوانەی دەوروبەری لەسەرخۆ پێی بڵێن (لا إله إلا الله) تەڵقینی بکەن بەبیری بهێننەوە وشەی (لا إله إلا الله) هەتاوەکو ئەوەی بەسەر زماندا بێت، چونکە کاتێک زیندوبویەوە ئاخیر وشەی ئەوە بێت پێش ڕۆح کێشانەکە و لەگەڵ ڕۆح کێشانەکە کە زیندوکرایەوە لە مەیدانی حەشر و حیسابدا ئەوەی بەسەر زماندا دێتەوە و لەسەر ئەو حاڵ و باڵەی زیندو دەکرێتەوە دەڵێ (لا إله إلا الله).

[1] صحيح مسلم (١٨٧٦) (١٨٧٦)، صحيح البخاري (٣٦) (٢٧٩٧) (٢٩٧٢)، سنن النسائي (٣٠٩٨) (٣١٢٢) (٣١٢٣).

## پۆشاککردنی بەندەکانی الله لە ڕۆژی دوایی و یەکەم کەس کە پۆشاك دەکرێت لەو مەیدانەدا:

هەندێک لەو پیاوانەی کە زۆر چاکن پۆشاک دەکرێن بە شمەکی ڕێز و ئیحتیڕامەوە، ئەوانەش کە خراپن پۆشاک دەکرێن بە جل و بەرگی ئاگرینەوە و ئەو جل و بەرگانەیان بەبەردا دەکرێت کە خۆی لە خۆیدا بێزی لێدەکات و دەبێتە مایەی ئازار و ئەزیەت و عەزاب بۆیان، یەکەم کەسیش لەو مەیدانەدا کە جل و بەرگی لەبەر دەکرێت ئیبراهیم پێغەمبەرە (ﷺ)، هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «أَلَا وَإِنَّ أَوَّلَ الْخَلَائِقِ يُكْسَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِبْرَاهِيمُ، أَلَا وَإِنَّهُ يُجَاءُ بِرِجَالٍ مِنْ أُمَّتِي[١]» واتە: یەکەمین کەس لە بەدیهێنراوەکان لە مەیدانی حەشر و حیساب لە ڕۆژی دوایدا کە جل و بەرگ و پۆشاکی لەبەر دەکرێ ئیبراهیم پێغەمبەرە کە خەلیلی اللەیە خەلیلیش پلەیەکی هەرە تایبەتە تەنها بەو و پێغەمبەر محەمەد (ﷺ) بەخشراوە.

**پرسێك:** بۆچی تەنها پێغەمبەر ئیبراهیم (ﷺ) بۆچی پێغەمبەری خۆمان محەمەد (ﷺ) یەکەم کەس نیە ئەو جل و بەرگەی لەبەر بکرێت لەبەرچی پێغەمبەرانی تر نین (عليهم الصلاة والسلام)؟

**وەڵام:** دیارە زانایان وەڵامیان هەیە بۆ ئەو پرسیارە، بەس پێش ئەوەی بچینە سەر وەڵامدانەوەی تەواو وتەی شێخ ابن حجر-رحمه الله- دەهێنینەوە، کە دەفەرموێ: ئیمامی البيهقي لە ڕێگای ابن عباس نمونەی ئەو حەدیسەی باسمانکرد گێڕاویەتیەوە ئەوەشی بۆ زیاد کردوە: «وأول من يكسى من الجنة إبراهيم، يكسى حلة من الجنة، ويؤتى بكرسي فيطرح عن يمين العرش، ثم يؤتى بي فأكسى حلة من الجنة لا يقوم لها البشر[٢]» واتە: یەکەمین کەس ئیبراهیم پێغەمبەرە (ﷺ) کە جل و بەرگی بەهەشتیەکانی بەبەردا دەکرێت، لە پاشان تاجێکی بەهەشتینی دەهێنن و لەسەری دادەنێن، وە کورسیەکی بۆ دادەنرێت لەلای ڕاستەی عەرشی

[١] صحيح البخاري (٤٦٢٥) (٣٣٤٩) (٣٤٤٧)، صحيح مسلم (٢٨٦٠)، سنن الترمذي (٢٤٢٣) (٣١٦٧) (٣٣٣٢).
[٢] فتح الباري: (٣٨٤/١١).

الله تعالی لەوێدا لەسەری دادەنیشێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی لەپاشان منیش دەهێنن و (حلة) لە بەهەشتدا دەهێنن من دەیپۆشم و لەبەری دەکەم و منیش دێمە ئەوێ.

زانایان لە وەڵامی ئەوەش بۆچی پێغەمبەر ئیبراهیم (ﷺ) یەکەم کەسە کە ئەو جل و بەرگەی لەبەر دەکرێ وەڵامەکەیان بە کورتی لەو دوو خاڵەدایە:

١.لە پێش و لە پاش (واتە لە یەکەمین جارەکان مەخلوق و دروستکراوەکان کەسیان نەبوە وە کەسیش نەبوە لەدوای خۆی ئیبراهیم) ئەوەندەی ئیبراهیم لە الله تعالی بترسێت، لەبەر ئەوە الله تعالی خێرایی دەکات لە جل و بەرگ پێدانی لە مەیدانی حەشر و حیساب هەتاوەکو دڵنیابێ و ترسەکەی لەسەر لابچێ تۆ بەهەشتیت ئەی ئیبراهیم بە دڵنیاییەوە و دڵ ئارامبە.

٢.مرۆڤ و مردوەکان یان ئەوانەی دەکوژرێن یان دەیانکوژن لەپێشدا وابوە جل و بەرگیان لەبەر داکەندون، لەبەر ئەوە ئیبراهیم پێغەمبەر (ﷺ) ئەو جل و بەرگەی لەبەر دەکەن تاوەکو ببێت بە شاهێد لەسەر خەڵکەکە کە کەسەکە ڕوت و قوت دەکەنەوە و ڕایدەکێشن و بۆناو ئاگر دەیبەن بە ڕوت و قوتی و لەوێوە جل و بەرگی جەهەنەمیان لەبەر دەکەن، و خەڵکەکەش شاهێد بێت و بە چاوی خۆیان ببینن کە ئیبراهیم پێغەمبەر (ﷺ) باوکی پێغەمبەرەکانە و الله تعالی ئەو ڕێزەی لێناوە و ئەویان دۆزەخی نیە و بەڵکو زیاتر هەتاوەکو پارێزراو بێت و عەیب و عارەکانی شاراوەبێت و بە بەرچاوەوە خەڵک ببینن ئەوە بەهەشتیە و دۆزەخی نیە[1].

## خاك و زەوی مەحشەر و گۆڕینی ئەو خاك و زەویەی دونیا و کاتی گۆڕینی:

زەوی مەحشەر ئەو زەویەی کە خەڵکی لەسەر کۆدەکرێتەوە لە مەیدانی حەشر و حیسابدا، ئەو زەویەیە ئێستا ئێمە لەسەری دەژین گۆڕانکاری بەسەردا دەهێنرێت یان زەویەکی تری سەربەخۆ دروستدەکرێ لەجێی ئەو زەویەدا خەڵکەکە لەسەری کۆ دەکرێتەوە و حەشریان

[1] تذكرة القرطبي: ٢٠٩.

دەکرێت؟ هەردو بۆچونەکە هەیە بۆچونی یەکەم کۆمەڵێکن لە زانایان کە دەفەرمون بە بەڵگەی ئەو ئایەتە ئەو زەویە نامێنێ زەویەکی ترە الله تعالی دروستی دەکات پاک و خاوێنە لە خوێن ڕشتن و گوناح و تاوانی لەسەر ئەنجام نەدراوە و ڕێک و ڕەوان و ڕاستە، ئەمسەر بۆ ئەوسەری لێ دیارە نە شاخ نە گرد نە هیچ بەربەستێک نە هیچ نیشانەیەکی لەسەر نیە، ئەو زەویە الله تعالی تایبەت بۆ مەیدانی حەشر و حیساب دروستی دەکات، کە الله تعالی دەفەرموێت: ﴿يَومَ تُبَدَّلُ ٱلأَرضُ غَيرَ ٱلأَرضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلوَٰحِدِ ٱلقَهَّارِ﴾ [إبراهيم: ٤٨] واتە: لە ڕۆژێكدا کە ئەم زەویە دەگۆڕێ بە زەویەکی تر و ئاسمانەکانیش (دەگۆڕێن بە ئاسمانی تر) ئەوسا هەموو (لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە) دەردەکەون بۆ پەروەردگاری تەنیای زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا. پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمویەتی: «يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ، كَقُرْصَةِ النَّقِيِّ، لَيْسَ فِيهَا عَلَمٌ لِأَحَدٍ[١]» واتە: خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا کۆدەکرێنەوە لەسەر زەوییەکی سپی خاکی، وەك کولێرەیەکی دروست کراو لە ئاردێکی بێژراوە هیچ کەس لەوێ هیچ نیشانەیەکی نیە وە شاخ و بەربەست و هیچێک لە نیشانە و ئاماژەکان بەرزی و نزمی هەتا بەردی گەورەش لەسەر ئەو زەویە نیە.

ئەوەیان بۆچونی کۆمەڵێکە لە زانایان، لەوانە: عەبدوڵای کوڕی مەسعود، پێشەوا عبد بن حميد والطبري لە تەفسیرەکانیان هێناویانەتەوە و ئیمامی البيهقي لە شعب الإيمان لە ڕێگای عمرو بن ميمون ئەویش لە عبد الله ابن مسعود دەربارەی تەفسیری ئەو ئایەتە کە پێشتر باسمان کرد: ﴿يَومَ تُبَدَّلُ ٱلأَرضُ غَيرَ ٱلأَرضِ﴾ [إبراهيم: ٤٨] عبد الله ابن مسعود لە تەفسیرەکەی فەرمویەتی کە ئەو پێشەوا و فەرموده ناسانە لێیان گێڕاوەتەوە فەرمویەتی: (تبدل الأرض أرضاً كأنها الفضة لم يسفك عليها دم حرام، ولم يعمل عليها خطيئة[٢]) واتە: زەویەکە وەکو یەک پارچە زیو وایە بەو شێوەیە دەبریسکێتەوە و جوانە و خوێنی حەرامی

---

[١] صحيح مسلم (٢٧٩٠)، صحيح البخاري (٦٥٢١).

[٢] ورجاله رجال الصحيح، وهو موقوف، وأخرجه البيهقي من وجه آخر مرفوع. وقال: الموقوف أصح(١) فتح الباري: (٣٧٥/١١).

لەسەر نەڕێژراوە واتە وەک ئەو زەویە نیە کە ئێستا ئێمە گوناحمان لەسەر کردوە و ڕۆژانە و شەوانە بە دەیەها و سەدەها و هەزارەها لەوەتەی دونیاش دونیایە بە ملیارەها یان بە ملیۆنەها خوێنی حەرامی لەسەر ڕژاوە، ئەو زەویە دەبێت کە گوناح و تاوانی لەسەر نەکرابێت.

لە فەرمودەیەکی تری دور و درێژدا گێڕدراوەیە دەفەرموێ: (تبدَّل الأرض غير الأرض والسماوات، فيبسطها ويسطحها، ويمدّها مدَّ الأديم العكاظي، لا ترى فيها عوجاً ولا أمتاً، ثم يزجر الله الخلق زجرة واحدة، فإذا هم في هذه الأرض المبدَّلة، في مثل مواضعهم من الأولى، ما كان في بطنها كان في بطنها، وما كان على ظهرها كان على ظهرها[1]) واتە: ئەو زەویە دەگۆڕێ لەگەڵ ئاسمانەکان بە زەویەکی تر و بە ئاسمانانێکی تر وە ئەو کاتەی ڕادەخسترێت الله تعالى تەواو ڕایدەخات و پان و ڕێکی دەکات، پێستی مەڕی (العكاظي) کە بەناو بانگ بوە جۆرە مەڕێک بوە چۆن پان و پۆڕە و کاتێک ڕادەخسترێت وەکو پێستەی زەویەکە بەو شێوەیە ڕادەخسترێ، ئەو کاتە ئەوانەی لەو زەویە گۆڕدراوەدان لە نمونەی ئەو شوێنانەی کە لە دونیادا پێشتر لێی بون ئەوەی لەناو سکی زەوی بوە هەر دەچێتەوە ناو سکی زەوی ئەوەی لەسەر پشتی زەویەکەش بێت لەوێشدا لەسەر پشتی زەوی دەبێت.

لە بۆچونی دوەم زانایان دەڵێن بەڵکو ئەو زەویەی خۆمانە کە ئێستا لەسەری دەژین، بەڵام گۆڕانکاری بەسەر ئاوەڵناو و سیفەتەکانیدا دێت، شاخەکان نامێنێت بەربەستەکان نامێنێت شوێنە نزمەکانی نامێنێت هەموی ڕاست و ڕێک دەکرێ بەڵام هەر ئەو زەویەیە ئێستا ئێمە لەسەری دەژین، ئەوەشیان لە عبد الله بن عمرو بە مەوقوفی گێڕدراوەیە کاتێک دەفەرموێ: (إذا كان يوم القيامة مُدت الأرض مد الأديم، وحشر الخلائق. ومن ذلك حديث جابر رفعه: تمدُّ الأرض مدّ الأديم، ثم لا يكون لابن آدم منها إلا موضع قدميه[2]) واتە: ئەگەر قیامەت بەرپابو مەیدانی حەشر و حیساب هات ئەو کاتە زەوی ڕادەخرێ وەکو پێستی حەیوان و ئاژەڵ، ئەو کاتە خەڵکەکان و بەدیهێنراوەکان حەشریان دەکرێت و لەوێدا کۆدەکرێنەوە. لە

[1] فتح الباري: (١١/٣٧٥).

[2] ورجاله ثقات، إلا أنه اختلف على الزهري في صحابيه، فتح الباري: (١١/٣٧٦).

گێڕانەوەیەکی تر دەفەرموێ: زەوی ڕادەخسترێت وەکو پێستی حەیوان و ئاژەڵ، لە پاشان هیچ شوێنێک نامێنێت لەسەر ئەو زەویە ئیلا هەر مرۆڤێک بە قەدەر هەردو پێیەکانی لەسەری دەوەستێ هەموی پڕ دەبێتەوە و پڕ دەبێ لە خەڵکی.

ابن عباس لە تەفسیری ئەو ئایەتە کە الله تعالى فەرمویەتی: ﴿يَومَ تُبَدَّلُ ٱلأَرضُ غَيرَ ٱلأَرضِ﴾ [إبراهيم: ٤٨] دەفەرموێ: (يزاد فيها، وينقص منها، ويذهب آكامها وجبالها، وأوديتها، وشجرها، وتمد مد الأديم العكاظي[1]) واتە: ئەو زەویە بەسەریەوە هەندێک زیاد دەکرێت، لە هەندێک شوێندا لێی کەم دەکرێتەوە، وە ئەوانەی بەرزی و نزمیەکەیەتی شاخەکانیەتی هەموی نامێنێت، دۆڵەکانیش نامێنێت، دار و باریشی لەسەر نامێنێ، ئینجا ڕادەخرێت وەکو پێستەی حەیوان و مەڕی (العكاظي).

**پرسیك:** ئایە لە چ کاتێکدایە ئەو زەویە بەو شێوەیە دەگۆڕدرێ کاتی تازە هاتنی قیامەتە یان زیندوبونەوەیە یان مرۆڤەکان لە کوێن ئەو زەویە بەو شێوەیەی بەسەر دێت؟

**وەڵام:** کاتەکەی بۆمان بەدیار دەکەوێت لە فەرمودەیەکدا، کە دایکە عائیشە دەفەرموێ پرسیارم کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿يَومَ تُبَدَّلُ ٱلأَرضُ غَيرَ ٱلأَرضِ وَالسَّمَاوَاتُ﴾ [إبراهيم: ٤٨] گوتم: «فَأَيْنَ يَكُونُ النَّاسُ يَوْمَئِذٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: عَلَى الصِّرَاطِ[2]» واتە: خەڵکی و مەردوم لە کوێن ئەو کاتە کە زەوی ئەو گۆڕانکاریەی بەسەردا دێت، فەرموی: خەڵکەکە لەسەر پردی سیراتن.

لە ثەوبانیشەوە هاتوە دەفەرموێ زانایەک لە زانایە جولەکەکان پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: «أَيْنَ يَكُونُ النَّاسُ يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): هُمْ فِي الظُّلْمَةِ دُونَ الْجِسْرِ[3]» واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) خەڵکی لە کوێن و چی

[1] فتح الباري: (١١/٣٧٦).
[2] صحيح مسلم (٢٧٩١)، سنن الترمذي (٣١٢١)، سنن ابن ماجه (٤٢٧٩).
[3] صحيح مسلم (٣١٥).

دەکەن ئەو کاتەی کە الله تعالى ئەو زەوی و ئاسمانە دەگۆڕێ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەوان لەو تاریکاییەن پێش ئەوەی کە جسرەکە و پردی سیراط بێت و ببینن.

## ئەو تاقم و کۆمەڵانەی ڕۆژی زیندوبونەوەیان بە درۆ هێناوەتەوە:

الله تعالى ئەو پۆلانەی دیاری کردوە، لەوانە إبن تيمية -رحمه الله- یەک لە دوای یەک ژماردونی و فەرمویەتی: ئەوانەی کافرن بە زیندوبونەوە و هاتنی ڕۆژی دوایی جولەکەکان و نەسڕانیەکانن، ئەوانە ئینکاری هەندێک شت دەکەن لە زیندوبونەوە و لە هاتنی ڕۆژی دوایی ئینکاری خواردن و خواردنەوە دەکەن یان هاوسەرگیرایەتی لە بەهەشتدا، هەندێکیان دانی پێدا دەهێنن هەندێکیشیان ئینکاری دەکەن، دەڵێن لە بەهەشتدا خۆشیەکان و ڕابواردن و فڵان بەو شێوەیە هەیە یان ئاوا نیە هەندێک لەو قسە و بیروبۆچونانە دەڵێن و دەکەن، بەڵام ئەوانەی ڕۆژی زیندوبونەوەیان بە درۆ هێناوەتەوە:

١.مولحیدەکان (بێباوەڕەکان): ئەوانەی کە هیچ بڕوایان نیە بە زیندوبونەوە و هاتنی ڕۆژی دوایی مولحیدەکانن، کە هەندێکیان دەڵێن اللەش بونی نیە، لە کۆنەوە و لە پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) و لە کاتی پێغەمبەریش (ﷺ) و لەدوای ئەویش کۆمەڵ و تاقمێک هەبوە بەناوی دەهریەکان، ئەوانە بڕوایان وابوە زەمەن و کات شتی لە دەستە، خێر و شەڕ و خەڵکی زیندو دەکاتەوە یان دروستی دەکات یان هەموو ئیش و کاری مرۆڤەکانی لە دەستە، ئەوان دەڵێن قیامەت نیە و زیندوبونەوە نیە ئەوانە پێیان دەگوترێت (الدهرية طباعية)، لەم سەردەمانەی ئەم دواییەشدا ئەو بیروبۆچونانەی کارل مارکسی هێنایە کایەوە (مارکسزمیەت و شوعیەت) زۆربەی بڕوایان بەوە نەبوە کە زیندوبونەوە هەبێ لەدوای مردن، ئەوانە ئینکاری ئەوەیان کردوە کە الله تعالى مرۆڤەکانی دروستکردوە یان دونیای بەدەیهێناوە، بەڵکو ئەوانە دەڵێن بە هەمان شێوە زیندوبونەوەش نیە موناقەشە و گفتوگۆی زۆریان لەسەر کردوە.

٢.ئەوانەی دان دەنێن بە بونی الله تعالی: بەڵام دەڵێن زیندوبونەوە نیە لەدوای مردن وەکو الله تعالی لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ قُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ [لقمان: ٢٥] واتە: سوێند بە الله ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوە بێگومان دەڵێن: الله (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ: سوپاس بۆ الله (کە دان بەو ڕاستیەدا دەنێن) بەڵام زۆربەیان نازانن، الله تعالی دەفەرموێ هەر ئەوانەن دەڵێن ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبٗا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخۡرَجُونَ * لَقَدۡ وُعِدۡنَا هَٰذَا نَحۡنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ [النمل: ٦٧-٦٨] واتە: ئەوانەی بێ باوەڕ بون دەیان وت ئایا کاتێ ئێمە و باو و باپیرانمان بوین بە خاك ئایا ئێمە دەردەهێنرێین (لە گوڕەکانمان و زیندو) دەبینەوە * سوێند بە الله بەڕاستی ئێمە و باو و باپیرانمان لەمەوپێش بەڵێنی ئەم (زیندوکردنەوە )مان پێدرا بوو ئەم (هەڕەشەی موحەممەد (ﷺ) لێمان دەکات ) تەنها درۆ و دەلەسەی گەلە پێشوەکانە (کە نوسراوە)تەوە.

ئەوانەش لێیان قبوڵ ناکرێت و بە کافر حیساب دەبن قوڕەیشیەکانیش زۆربەی هەرە زۆریان لەوانە بون ئەگەر بڕواشیان بە الله هەبوبێ بڕوایان بە زیندوبونەوە نەبو.

٣.ئەوانەی دەڵێن زیندوبونەوە هەیە: بەڵام بەلادان لە قورئان و سونەت وەسفی زیندوبونەوە و مەیدانی حەشر و حیساب دەکەن، ئەوانەش بەڕاستی ڕێیان لێ بزربوە و دەکاتە ئەوەی کە بڕوای تەواویان بە هاتنی ڕۆژی دوایی نیە بەو شێواز و سیفەتەی کە الله تعالی باسی کردوە یان پێغەمبەر (ﷺ) ڕونی کردوەتەوە.

## هەندێك بەڵگە لە بەڵگەکانی زیندوبونەوە:

ئەو پۆلانەی کە دەڵێن زیندوبونەوە نیە بەهەریەک لە بیروبۆچونەکانی خۆیان الله تعالی وەڵامی داونەتەوە، ئەو بەڵگانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی و زیندوبونەوە هەیە.

١.الله تعالی ئێمەی ئاگادار کردوەتەوە لە دەیەها ئایەتی قورئانی پیرۆز بەوەی کە ڕۆژی دوایی هەیە و قیامەت بەرپا دەبێ لە ڕابردودا هێنامانەوە ئێستاش هەندێکی تری دەهێنینەوە: ﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخۡفِيهَا لِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا تَسۡعَىٰ﴾ [طه: ١٥] واتە: بێگومان ڕۆژی دوایی دێت دەمەوێ (کاتی هاتنی لەخۆم) بشارمەوە.

﴿وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞۖ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ﴾ [الحجر: ٨٥] واتە: وە بێگومان ڕۆژی دوایی دێت تۆش بەجوانی چاوپۆشی بکە لێیان.

﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَأٓتٖ﴾ [الأنعام: ١٣٤] واتە: بێگومان هەر بەڵێنێکتان پێ دەدرێ هەردێت.

﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٞ﴾ [المرسلات: ٧] واتە: بەڕاستی ئەوەی کە بەڵێنتان پێ دراوە (لە هاتنی ڕۆژی دوایی) دێتە دی.

﴿وَيَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوۡفَ أُخۡرَجُ حَيًّا * أَوَلَا يَذۡكُرُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ وَلَمۡ يَكُ شَيۡـٔٗا﴾ [مريم: ٦٦-٦٧] واتە: ئادەمی (بێ بڕوا) دەڵێ ئایا کە مردم لە داهاتودا بەزیندویی (لە گۆڕ) دەردەهێنرێم * ئەوە ئادەمیزاد بۆ بیر ناکاتەوە کە بێگومان ئێمە لەسەرەتاوە ئەومان دروست کردوە کە ئەو شتێك نەبو.

﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدًا * أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُمۡ وَجَعَلَ لَهُمۡ أَجَلٗا لَّا رَيۡبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورٗا﴾ [الإسراء: ٩٨-٩٩] واتە: دەیان گوت ئایا ئەگەر ئێمە بوینە ئێسك و پروسکی پارەپارەی ڕزیو ئایا ئێمە زیندو دەکرێینەوە بە دروست کردنێکی تازە * ئایا ئەوانە نەیان زانیوە بێگومان ئەو پەروەردگارەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوە دەسەڵاتی هەیە بۆ جارێکی تر دروستیان بکاتەوە دیارە کە بۆ زیندو بونەوە و گەڕانەوەیان بۆلای خۆمان ڕۆژ و ماوەیەکی تایبەتیان بۆ دیاریکردون و هیچ گومانێکیش لەهاتنی ئەو ڕۆژەدا نیە بەڵام ستەمکاران هیچیان ناوێت بێ باوەڕی نەبێت.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلۡحَبِّ وَٱلنَّوَىٰۖ يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَمُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتِ مِنَ ٱلۡحَيِّۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ * فَالِقُ ٱلۡإِصۡبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ حُسۡبَانٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾ [الأنعام: ٩٥-٩٦] واتە: بەڕاستی الله لەتکەری دانەوێڵە و ناوکە تۆوە زیندو دەرئەهێنێ لە مردو وە (الله) دەرهێنەری مردوانە لە زیندو ئەوەیە پەروەردگاری ئێوە دەی کەواتە ئێوە چۆن (لە پەرستنی ئەو پەروەردگارە) لا دەدرێن؟ * الله بەدیهێنەری شەبەق و ڕوناکی ڕۆژ بونەوەیە و شەوی کردوە بەکات و هۆی ئارام گرتن و خۆر و مانگی کردۆتە هۆی حساب دیاری کردن و زانینی کات ئەوەش ئەندازەگرتنی پەروەردگاری بە دەسەڵاتی زانایە.

یەکێک لە مولحیدە بێبڕوا مولحیدە عەرەبەکان لە سەردەمی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) کە لە پەرتوکەکانی مێژو و فەرمودە تۆمار بوە هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ)، ئێسکێکی هێنابوو ئەو ئێسکە ڕزابوو ئێسکەکەی هێنا بە هەردو دەستیدا و وردی کرد و لەبەر چاوی پێغەمبەر (ﷺ) و سەحابەکان فویەکی لێکرد و بە ئاسمان کەوت، دواتر گوتی موحەممەد (ﷺ) تۆ وا گومان دەبەی الله ئەوە زیندو دەکاتەوە؟ ئینجا الله تعالی ئەو ئایەتەی بۆ دادەبەزێنێ و پێغەمبەر (ﷺ) بەسەریدا دەیخوێنێتەوە: ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلٗا وَنَسِيَ خَلۡقَهُۥۖ قَالَ مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٞ * قُلۡ يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلۡقٍ عَلِيمٌ﴾ [يس: ٧٨-٨١] واتە: نمونەمان بۆ دێنێتەوە و بەدیهێنانی خۆی لە بیرچۆتەوە (ئەو بێ بڕوایە) دەڵێ کێ ئێسکەکان زیندو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیون * ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ ئەو زاتە زیندویان دەکاتەوە کە لە یەکەم جارەوە بەدی هێناون و ئەو بە هەموو دروست کراوێك زانا و ئاگایە.

الله تعالی هەندێک جار هەر لە دونیادا بە ئێمەی نیشان داوە هەندێک لە مردوەکانی زیندوکردوەتەوە بۆ ئەوەی ئێمە حاڵی بکات و ئیمان و بڕوامان جێگیر بکات، زیندوبونەوە ئاسانە لەلای الله تعالی و لە توانایدا هەیە، یەکێک لە نمونەکان بەنو ئیسڕائیلیەکان پیاوێکیان کوشت لەناو خۆیاندا، لە سەردەمی بەنو ئیسڕائیلیەکان کە ئەو پیاوە کوژرا لە سەردەمی موسا پێغەمبەر بوو (ﷺ) ئەو چیرۆک و سەرگوزشتە قورئانیە بەناو بانگە،

کاتێک کە هاتنە لای و لێیان پرسی ئەی موسا چی بکەین باشە؟ بکوژەکەی دەبێت کێ بێت؟ چەندین جار پرسیاری دور و درێژ و وردەکاریان کرد، اللە تعالی لەبەر ئەوە تاقی کردنەوە و ئەرکەکەی لەسەر قورستر کردن لە کۆتایدا اللە بڕیاریدا و فەرموی: ﴿فَقُلۡنَا ٱضۡرِبُوهُ بِبَعۡضِهَا كَذَٰلِكَ يُحۡيِ ٱللَّهُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾ [البقرة: ٧٣] واتە: ئینجا وتمان بەئەندامێکی (مانگا سەربڕاوەکە) لەکوژراوەکە بدەن ئاوا اللە مردوان زیندو دەکاتەوە، وە نیشانەکانی خۆیتان پیشان دەدات بۆئەوەی تێبگەن.

نمونەیەکی تر، ئەو کەسە ئایە عوزێر پێغەمبەرە یان نا ئەوە ئیختیلاف و جیاوازی زۆری لەسەرە کێبوە سەدا سەد دیار نیە ئیلا لە ئیسرائیلیان هاتوە، کە دەچێت بەلای لادێیەک کە گوێدرێژەکەی لەگەڵە و خواردنی لەسەرە، ئینجا اللە تعالی لەوێ سەد ساڵ دەیمرێنێ وەکو دەفەرموێ: ﴿أَوۡ كَٱلَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرۡيَةٖ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحۡيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٖ ثُمَّ بَعَثَهُۥۖ قَالَ كَمۡ لَبِثۡتَۖ قَالَ لَبِثۡتُ يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۖ قَالَ بَل لَّبِثۡتَ مِاْئَةَ عَامٖ فَٱنظُرۡ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمۡ يَتَسَنَّهۡۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجۡعَلَكَ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِۖ وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ [البقرة: ٢٥٩] واتە: یا وەک ئەو کەسەی (عوزەیر) کە ڕابورد بەلای شارێکا (بیت المقدس) لە کاتێکدا ئەو (شارە) دیوارەکانی ڕوخا بوو بەسەر سەربانەکانیدا (عوزەیر) گوتی: اللە چۆن ئەم شارە ئاوەدان دەکاتەوە پاش مردنی؟ (واتە پاش وێران بونی) یەکسەر اللە تعالی سەد ساڵ مراندی پاشان زیندوی کردەوە (اللە تعالی) فەرموی: چەندە ماویتەوە لێرەدا؟ گوتی ڕۆژێک یا بەشێ لەڕۆژێک ماومەتەوە (اللە تعالی) فەرموی: نەخێر بەڵکو سەد ساڵ ماویتەوە جا تەماشای خواردن و خواردنەوەکەت بکە تێک نەچوە وە تەماشای گوێدرێژەکەت بکە بۆ ئەوەی ئەم مەسەلەی بەسەرهات و زیندوبونەوەیەت بکەینە موعجیزە و پەندێك بۆخەڵك وە تەماشای ئێسقانەکانی (گوێدرێژەکەت) بکە چۆن بەرزیان دەکەینەوە (لە شوێنی خۆیان) و یەکیان دەخەین پاشان گۆشتی بەسەردا دەهێنین ئینجا کاتێ ئەمانە دەرکەوت بۆی (عوزەیر) گوتی: بەچاکی تێگەیشتم بەڕاستی اللە خاوەن دەستەلاتە بەسەر هەموو شتێکدا.

ئەو ڕوداوەی ئیبراهیم پێغەمبەریش (ﷺ): ﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيۡفَ تُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ قَالَ أَوَلَمۡ تُؤۡمِنۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِيۖ قَالَ فَخُذۡ أَرۡبَعَةٗ مِّنَ ٱلطَّيۡرِ فَصُرۡهُنَّ إِلَيۡكَ ثُمَّ ٱجۡعَلۡ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٖ مِّنۡهُنَّ جُزۡءٗا ثُمَّ ٱدۡعُهُنَّ يَأۡتِينَكَ سَعۡيٗاۚ وَٱعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ﴾ [البقرة: ٢٥٩] واتە: وەبیر بێنە و باسی ئەمە بکە کە ئیبراهیم بۆ ئەوەی لە پلەی علم الیقین وە بگاتە پلەی عین الیقین گوتی: ئەی پەروەردگاری من! نیشانم دە -با بەچاوی سەر ببینم- کە تۆچۆن مردوان زیندو ئەکەیتەوە؟ الله فەرموی: مەگەر تۆ هێشتا بڕوات بەزیندو بونەوە نیە؟! ئیبراهیم گوتی: بەڵێ چاك باوەڕم هەیە، کە تۆ دەتوانی مردوان زیندو بکەیتەوە، بەڵام حەز دەکەم بە چاوببینم تا بەتەواوی دڵنیابم الله فەرموی: دەسا چوار پەلەوەر بگرە وجوان سەرنجیان بدە، ئەوسا هەرچواریش سەر برە، ئینجا پەل پەلیانکە و خوێن و گۆشتەکەیان تێکەڵ بکە و بیانکە چوار کوت پاشان هەر کوتێکیان لەسەر لوتکەی کێوێك دانێ ئەوجا بانگیان بکە و؛ بە فەرمانی الله بەپەلە زیندو دەبنەوە و دێنە لات و هەر پارچەی لەگەڵ پارچەکەی خۆیدا یەك دەگرێتەوە بزانە و بێگومانبە کە الله چەندە دەستەڵاتدار و کاردروستە بییەوێ هەرئیشێ بکات ئەیکات و پڕیشە لە حیکمەت.

وە عیسا پێغەمبەریش کە الله مۆڵەتی ئەوەی پێدابوو مردوەکانی زیندو دەکردەوە یەکێک بوو لە موعجیزەکان، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی الله تعالى لە دونیادا هەندێک جار مردوی زیندوکردوەتەوە لە پێناو موعجیزە و نیشاندانی بەڵگە و ئایەتەکانی خۆی، لە قیامەتدا ئەسانتریشە، کە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿أَنِّي قَدۡ جِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ أَنِّيٓ أَخۡلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ [آل عمران: ٤٩] واتە: بەڕاستی من نیشانەیەکم بۆ هێناون لە پەروەردگارتانەوە کە من بۆتان دروست دەکەم لە قوڕ(شتێک) لە وێنەی باڵندە ئینجا فوی پیادەکەم یەکسەر دەبێت بە باڵندە بە فەرمانی الله.

ئەو ڕوداوەی (ئەسحابی کەهف) یارانی ئەشکەوت کاتێک الله تعالى سێ سەد و نۆ ساڵ لەوێدا ئەوانی خەواند لە دوایدا بە ئاگای هێنانەوە، ئەوەش باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی

کە اللە تعالی لە توانایدا هەیە مردو زیندوبکاتەوە، و وەکو نمونەیەک لە قورئانی پیرۆز بۆ ئێمەی تۆمار کردوە کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ بَعَثۡنَٰهُمۡ لِنَعۡلَمَ أَيُّ ٱلۡحِزۡبَيۡنِ أَحۡصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓاْ أَمَدٗا﴾ [الكهف: ١٢] واتە: پاشان دوای ماوەیەکی دورو درێژ هەڵمان ساندن و خەبەرمان کردنەوە، تا بزانین و دەرکەوێ کام یەك لەو دوو دەستە و گروپەیان -کە قسەیان جیاوازە لەبارەی دیاریکردنی ماوەی مانەوەیان- هەر بە هەژمار ساڵەکانی مانەوەیان لەبیرماوە.

﴿وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡۚ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ كَمۡ لَبِثۡتُمۡۖ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۚ قَالُواْ رَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثۡتُمۡ فَٱبۡعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ طَعَامٗا فَلۡيَأۡتِكُم بِرِزۡقٖ مِّنۡهُ وَلۡيَتَلَطَّفۡ وَلَا يُشۡعِرَنَّ بِكُمۡ أَحَدًا﴾ [الكهف: ١٩] واتە: بەڵێ هەرچۆنێك خەواندمانن، هەرئاوایش وە خەبەرمان هێنان تا لە نێوان خۆیاندا لە یەکتر بپرسن: ئاخۆ چەند لە ئەشکەوتەکەدا ماونەتەوە؟ بۆیە قسەکەرێکیان گوتی باشە! دەبێ چەند مابنەوە و، نوستوبن لەم ئەشکەوتەدا؟ زۆر بە ئاساییەوە گوتیان رۆژێك، یان بەشێکی ماوینەتەوە دیارە قسە و بۆچونیان لێك جیاوازبو، بۆیە بە ئەنجام نەگەیشتن و، گوتیان لەڕاستییدا تەنها مەگەر هەر پەروەردگارتان بزانێ چەندە نوستون و چەند ماونەتەوە، بۆیە باش وایە حەواڵە بەزانیاریی پەروەردگاری زانا بکرێت.

﴿وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا﴾ [الكهف: ٢٥] واتە: ئەو کۆمەڵە لاوە مانەوە لەناو ئەشکەوتەکەیاندا (بە خەوتویی) ماوەی سێ سەد ساڵ (بەساڵی هەتاوی) نۆ ساڵی تریشیان زیاد کرد (ئەگەر بەساڵی مانگی عەرەبی حیساب بکرێ)ت.

ئەو دار عەسایەی موسا کە بێگیان بوە کاتێک هەڵیدەدا اللە تعالی دەیکاتە مارێکی گیانبەر: ﴿فَأَلۡقَىٰهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٞ تَسۡعَىٰ﴾ [طه: ٢٠] واتە: جا ئەویش (گۆچانەکەی) فڕێدا دەست بەجێ گۆچانەکە بوە مارێك بە خێرایی دەڕۆیشت.

موفەسیرین دەفەرمون اللە تعالی ئەوەی لە تواناداهەبێت زۆر ئاسانە مرۆڤ و گیاندارەکان گیانیان لێ بسێنێتەوە و جارێکی تر بۆیان بگەڕێنێتەوە و زیندویان بکاتەوە.

## دوارۆژ و زیندوبونەوە لەلای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام):

پێغەمبەران لەو شەش ڕوکنانەی ئیمان و بیروبڕوادا هەمویان یەک دەنگبون، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: «أَنْ تُؤْمِنَ بِالله، وَمَلائِكَتِه، وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الآخِر، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ[1]» واتە: ئیمان ئەوەیە باوەڕهێنانە بە الله تعالی وە بە فریشتەکان، وە بە کتێبەکان، وە بە پێغەمبەران، وە بە ڕۆژی دوایی، وە باوەڕهێنانە بەقەزاو قەدەر بە خێری و شەڕی.

جا یەکێکیش لەو کۆڵەکانە هاتنی ڕۆژی دوایی و زیندوبونەوەیە، کاتێک الله تعالی لە قورئانی پیرۆز ئەو قسانەمان بۆ پشت ڕاست دەکاتەوە و بەڵگەی بۆ دەخوێنێتەوە کە بەڵێ ئومەتانی پێشتریش لێیان دەپرسرێتەوە بەوەی کە بۆچی بڕواتان نەهێنا بە ڕۆژی دوایی و زیندوبونەوە ئەی پێغەمبەرەکانتان (علیهم الصلاة والسلام) بە ئێوەیان نەگوتبوو؟ لە یەکێک لە ئایەتەکان الله تعالی فەرمویەتی: ﴿كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ * قَالُواْ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَنَا نَذِيرٞ فَكَذَّبۡنَا وَقُلۡنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ كَبِيرٖ * وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾ [الملك: ٨-١٠] واتە: هەردەستە و تاقمێك لەبێ باوەڕان کە فڕێدەدرێنە نێویەوە پاسەوانەکانی لێیان دەپرسن ئایا هیچ پێغەمبەرێکی ترسێنەرتان بۆ نەهاتوە لە دونیادا * گوتیان بەڵێ بۆمان هاتوە بەڵام بەدرۆمان دەزانی، و دەمان وت (پێی) الله هیچی نە ناردۆتە خوارەوە ئێوە بەس لە گومڕاییەکی گەورەدان * وە گوتیان ئەگەر قسەی (پێغەمبەران)مان ببیستایە یا تێبگەشتینایە ئەمڕۆ لە هاوڕێیانی دۆزەخ نەدەبوین.

الله تعالی لە ئایەتێکی تردا فەرمویەتی: ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ [الزمر: ٧١] واتە: ئەوسا ئەوانەی بێ باوەڕ بون ڕاپێچ دەکرێن بۆ دۆزەخ کۆمەڵ کۆمەڵ تا کاتێ دێنە (نزیکی) دۆزەخ

---
[1] صحيح مسلم (٨)، سنن أبي داود (٤٦٩٥)، سنن الترمذي (٢٦١٠).

دەرگاکانی دەکرێنەوە وە دەرگاوانەکانی دۆزەخ بەوان دەڵێن ئایا پێغەمبەرانتان لە خۆتان بۆ نەهات کە ئایەتەکانی پەروەردگارتان بەسەردا بخوێننەوە وە بتانترسێنن لە گەشتنتان بەم ڕۆژە دەڵێن بەڵێ (هاتن ئاگاداریان کردین) بەڵام بڕیاری سزا دراوە بەسەر (ئێمەی) بێ باوەڕاندا.

ئەو ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئومەتەکانی پێشتر پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پێیان ڕاگەیاندون کە قیامەت پەیدا دەبێت و زیندوبونەوە و بەهەشت و دۆزەخ هەیە و پێویستە بڕوای پێ بێنن، پێغەمبەران لەسەر ئەو خاڵە بیروبڕواییانە یەک دەنگ بون.

**پرسێك:** ئایە هەموو گەل و نەتەوەیەک پێغەمبەری بۆ ڕۆشتوە؟

**وەڵام:** بەڵێ ڕاشکاوانە الله تعالى دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا﴾ [الإسراء: ١٥] واتە: ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین هەتا پێغەمبەر نەنێرین بۆیان.

﴿وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ﴾ [فاطر: ٢٤] واتە: هیچ ئوممەت و گەلێکیش نەبوە- بەرلە تۆ- ترسێنەرێکیان بۆ نەچوبێ.

الله تعالى لە شەیتانی ئیبلیسی نگریس غەزەبی گرت و لە ڕەحمەتی خۆی بەدەرینا، چونکە کاتێک کە شەیتانیش داندەنێت کە هاتنی ڕۆژی دوایی حەق و ڕەوایە تۆمەت و گوناحەکەی پاڵداوە لای الله تعالى، ئینجا لەبەر ئەوە مۆڵەت دەخوازێت، بزانە شەیتانیش هەر دەزانێت قیامەت هەیە و زیندوبونەوە هەیە لەبەر ئەوە شەیتان ڕو دەکاتە الله تعالى و دەڵێ: ﴿قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ * قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ * إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ﴾ [ص: ٧٩-٨١] واتە: گوتی ئەی پەروەردگارم دەی مۆڵەتم بدە تا ڕۆژێ (مردوان) زیندو دەکرێنەوە * الله فەرموی ئەوە بەڕاستی تۆ لە مۆڵەت دراوانی * تا ڕۆژێ کە کاتی دیاری کراوە.

پێغەمبەر نوح کە یەکەم ڕەسولە[1] کە پێی دەگوترێ ئادەمی دوەم چونکە لە سەردەمی ئەو کەمێکی زۆر کەم لە هەردو ڕەگەزەکانی نێر و مێ لە مرۆڤ و لە باقی گیاندارەکانی تر مانەوە ئەوانی تر الله تعالی هەمویانی بە تۆفان و لافاو خنکاند بەهۆی ئەو کردەوە خراپە و تاوانانەی کە دەیانکرد و نەدەهاتنە سەر ڕێ و بڕوایان بە نوح (ﷺ) و بە الله تعالی نەدەهێنا، ئینجا الله تعالی دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ ٱلأَرضِ نَبَاتًا * ثُمَّ يُعِيدُكُم فِيهَا وَيُخرِجُكُم إِخرَاجًا﴾ [نوح ١٧-١٨] واتە: وە الله ئێوەی ڕواندوە لە زەوی بە ڕواندن (وەک چۆن گیا لە زەوی شین دەبێ) * لەپاشان دەتان باتەوە ناوی (هەروەکو گیا لە سەوزایدا زەرد هەڵدەگەڕێ و کاتی دروێنەی دێت) وە دەرتان دەهێنێتەوە (لێی) بە دەرهێنان (کە ئەوە زیندوبونەوەیە).

جا باوکی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) کە ئیبراهیم پێغەمبەرە (ﷺ) ئەویش گەلەکەی خۆی ئاگادار کردوەتەوە و بڕوای بەوە هەبوە کە قیامەت هەیە و زیندوبونەوە هەیە و هەموی ئاگادار کردوەتەوە، دەفەرموێ: ﴿وَإِذ قَالَ إِبرَٰهِـمُ رَبِّ ٱجعَل هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرزُق أَهلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَن ءَامَنَ مِنهُم بِٱللَّهِ وَٱليَومِ ٱلأَخِرِ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلاً ثُمَّ أَضطَرُّهُۥ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ وَبِئسَ ٱلمَصِيرُ﴾ [البقرة: ١٢٦] واتە: وە بیربکەنەوە کاتێک کەئیبراهیم گوتی پەروەردگار ئەم شوێنە (کە مەککەیە) بکە بەشارێکی پڕ لەئاسایش وە ڕۆزی دانیشتوانی بدە لەمیوەهات ئەوانەیان کەبڕوایان بە الله و بە ڕۆژی دوایی هەیە (الله) فەرموی: ئەوەش بێبڕوابێ ڕۆزی پێ ئەدەم بۆچەند ڕۆژێکی کەم لەپاشان ناچاری دەکەم بەسزای ئاگری دۆزەخ کەخراپترین سەرئەنجامە.

وە هەر پێغەمبەر ئیبراهیم (ﷺ) دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا ٱغفِرلِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلمُؤمِنِينَ يَومَ يَقُومُ ٱلحِسَابُ﴾ [إبراهيم: ٤١] واتە: ئەی پەروەردگارمان لە من و باوکم و دایکم و هەموو بڕواداران ببورە و خۆش ببە لە ڕۆژێکدا کە لێپرسینەوە دەکرێ و بەرپا ئەبێ.

[1] لە بوچونی دروستی زانایان پێغەمبەر ئادەم تەنها نەبی بوە و ڕەسول نەبوە، نوح پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم ڕەسولە.

موسا پێغەمبەریش (ﷺ) گەلەکەی خۆی ئاگادار کردوەتەوە و حوجەی لەسەر کردون کە دەبێ ئیمانتان هەبێ بە ڕۆژی دوایی و زیندوبونەوە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا فَٱعْبُدْنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِيٓ * إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا تَسْعَىٰ * فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرْدَىٰ﴾ [طه: ١٤-١٦] واتە: بێگومان هەر منم الله هیچ پەرستراوێکی ڕاست نیە جگە لە من کەواتە من بپەرستە بە چاکی نوێژ بەجێ بێنە تامنت بێتەوە یاد * بێگومان ڕۆژی دوایی دێت من دەمەوێ تەنانەت لە خۆشمی بشارمەوە بۆ ئەوەی پاداشت بدرێتەوە هەموو کەسێك بە گوێرەی ئەو کردەوەی کە دەیکات * جا با ڕێگریت نەکات لێی ئەو کەسەی باوەڕی نیە بەو (قیامەتە) و شوێن هەوا و ئارەزوی خۆی کەوتوە ئەوسا تیا بچیت.

لە شوێنێکی تر موسا لەگەڵ فیرعەون گفتوگۆ دەکات، میراتگرانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەبێ چاو بکەن لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەندێک جار دەبێ قسە بکەن و گفتوگۆ بکەن یان پەنجە لەسەر حەق و ناحەق دابنێن و نوقتە لەسەر پیت دابنێن لەگەڵ کەسە سەرکردە و باڵا دەستەکانیش بۆ ئەوەی حەق و ڕاستی ڕونبێتەوە و دینی الله ڕابگەیەنن، ئەوەتا موسا دەفەرموێت بە فیرعەون: ﴿مِنْهَا خَلَقْنَٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ﴾ [طه: ٥٥] واتە: لەم زەویە دروستمان کردون دوبارە دەتانگێڕینەوە ناو زەوی (بە مردویی) جارێکی تر لەو زەویە دەرتان دێنینەوە بە زیندویی بۆ لێپرسینەوە.

جا بەڵگەکان یەکجار زۆرن بۆ ئەوەی هەموی نەبێتە بەڵگە هێنانەوە و وتەی پێغەمبەرەکان (علیهم الصلاة والسلام) بەڵام هەر ئەوەندە بەسە کە لە کۆتایدا ئەو یەک دوو ئایەتەش دەهێنینەوە ئینجا دەچینە سەر خاڵەکەی تر پشتیوان بە الله.

ئەوەتا الله تعالى لە قورئانی پیرۆز ڕونیکردەوە کە کەسێک هەبوو لەگەڵ فیرعەون دەژیا بەڵام بڕوادار بوو ئیمان و بڕواکەی خۆی شاردبویەوە و بە نهێنی ئیش و کاری دەکرد و ئیمانی بە الله هێنابوو وە بڕوای وابوو کە زیندوبونەوە هەیە بە تەواوەتی و سەدا سەد لەبەر ئەوە

ڕو دەکاتە گەل و نەتەوەکەی، و لەسەر زمانی ئەو الله تعالی دەفەرمویٚ: ﴿وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ * يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ﴾ [غافر: ٣٢-٣٣] واتە: وە ئەی گەلەکەم بەڕاستی من ترسی ڕۆژی هاوار و بانگ لە یەکتری کردنم هەیە لێتان * ئەو ڕۆژەی پشت هەڵدەکەن و هەڵدێن هیچ پەناگەیەك بۆ ئێوە نیە لە (سزای) الله وە هەر کەسێ الله گومڕای بکات ئەوە هیچ ڕێنمونی کەرێکی بۆ نیە.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُونِ أَهۡدِكُمۡ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ * يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ * مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةٗ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَاۖ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ يُرۡزَقُونَ فِيهَا بِغَيۡرِ حِسَابٖ * وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ [غافر: ٣٩-٤١].واتە: وە ئەو (پیاوەی) باوەڕی (بە موسا) هێنا بوو گوتی ئەی گەلەکەم شوێن من بکەون ڕێگای ڕاستان نیشان دەدەم * ئەی گەلەکەم بەڕاستی ژیانی ئەم دونیایە ڕابواردنێکی کەمە وە بەڕاستی هەر پاشەڕۆژ جێی حەسانەوەی هەمیشەییە * هەر کەسێك کاری خراپەی کردبێ هەر بە ئەندازەی خراپەکەی سزا دەدرێ هەر کەسیش چاکەی کردبێت ئافرەت بێ یان پیاو و باوەڕدار بێ ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە لەوێدا بێ ژمار (بێ سنور) ڕزق و ڕۆزییان پێ دەدرێ * وە ئەی گەلەکەم ئەوە چیە من بانگتان دەکەم بۆ ڕزگار بون کەچی ئێوە من بانگ دەکەن بۆ ئاگری دۆزەخ.

## هەندێك لە دەقی پەرتوکە ئاسمانیەکان دەربارەی دوارۆژ و زیندوبونەوە:

هیچ گومان لەوەدا نیە تەوڕاتی سەردەمی موسا و ئینجیلی سەردەمی عیسا ئەوانە فەرمودە و کەلام و فەرمانی الله بون، ڕاست و دروست بون، لە بیروبڕوادا شیرک و کوفر و خوڕافیات و ئەو شتە نارێکانەی کە ئێستا هەندێکیان تێدا نوسراوە هیچی تێدا نەبوە، هەموی تەواو یەکی گرتوەتەوە لەگەڵ قورئانی پیرۆز و حەدیسە سەحیحەکانی پێغەمبەری دڵسۆز (ﷺ).

١.ئەگەر تەماشا بکەین لە تەوڕات (السامرية) ئەوە وێنەیەکیانە لە یەکێک لە فەقەرەکانی (الإصحاح)ی سی و دوەم لە فەقەرەی (٣٤-٣٥) دەڵێ: (أليس هو مجموعاً عندي مختوماً

في خزائني، إلى يوم الانتقام والمكافأة، وقت تزل أقدامهم) واتە: موسا بە گەلەکەی خۆی گوت ئایە ئەو ڕۆژەتان نایەتە بەرچاو کە دەگەڕێنەوە و کۆدەکرێنەوە کۆتایی دێت بە هەموو خەزێنە و دەرگاکان دادەخرێت، الله تعالى لەلای خۆی کۆتان دەکاتەوە بۆ ئەوەی یان تۆڵەتان لێ بستێنێتەوە یان پاداشتان بداتەوە، ئەو ڕۆژە یەک قاچ ناتوانێت قاچ هەڵبێنێت کە لە مەیدانی حەشر و حیسابە هەتا الله حیسابی لەگەڵ نەکات باش پاداشتی بداتەوە و خراپیش تۆڵەی لێ بستێنێتەوە.

لە تەوراتی (العبرانية) هاتوە دەفەرموێ: (أليس ذلك مكنوزاً عندي مختوماً عليه في خزائني، لي النقمة والجزاء في وقت تزل أقدامهم) واتە: ئەو ڕۆژە کە هاتنی قیامەتە الله فەرمویەتی و موساش بە گەلەکەی خۆی گوتوە ئەو ڕۆژەی کە مۆر دەدرێ لەسەر خەزێنەکانی الله تعالى، قیامەت دێت و مەیدانی حەشر و حیساب ڕێک دەخرێت ئەو ڕۆژە دەمەوێت تۆڵە بستێنمەوە لە بێ بڕواکان وە پاداشتی ئەوانەش بدەمەوە کە چاکەکار و باوەڕدار بون کە قاچێک ناتوانێت هەنگاو هەڵبنێت بەبێ الله تعالى.

٢.بڕگەیەکی تر لە سفر دانیال دەڵێ: (کثيرون من الراقدين تحت التراب يستيقظون، هؤلاء إلى الحياة الأبدية، وهؤلاء إلى العار، والازدراء الأبدي[١]) واتە: هەمویان زۆرن کە هەڵدەستێنرێنەوە کاتێک ڕاکشاون و مردون و بە ئاگا دەهێنرێنەوە، دەهێنرێنەوە ژیانێکی هەمیشەیی کە ژیانی قیامەتە، هەندێکیان شەرمەزاریان بۆ دەمێنێتەوە لە خەڵکەکە کە سەرپێچی ئەمری الله و پێغەمبەرەکەیان کردوە کە موسا بوە (ﷺ)، وە هەندێکیشیان سەرفراز دەبن و هەتا هەتایی.

٣.لە سفر المزامير باسی کۆبونەوە و خەڵک ڕاکێشان و پاڵ پێوەنان بەرەو ئاگر دەکات ئەویش دەڵێ: (مثل الغنم إلى النار يساقون، الموت يرعاهم، ويسودهم المستقيمون غداة، وصورتهم تبلى، والهاوية مسكن لهم[٢]) واتە: بە نمونەی مەڕەکان دەهاژوژترێن مێگەل مێگەل

---

[١] الإصحاح ١٢ من سفر دانيال.

[٢] الفقرة ٥ من المزمور الخامس والخمسين.

خەڵکەکە بەرەو ئاگر، ئەوەی لەسەر سەریانە مردنە بەڵام مردنیش ماڵی ئاواکردوە و تەواو جارێکی تر بەسەریشیاندا نایەتەوە و بڵێ مردنیش لە ئاگرم بگێڕێتەوە، وێنەکانیان لاشەکانیان هەموی ڕزیوە و شوێن و مەنزڵگاشیان دەبێتە ئاگری دۆزەخ کافر و گوناحکارەکان.

٤.لە ئینجیلی لوقا ئاماژەی کردوە بە عەزابی قەبر کە دەڵێ: (ومات الغني ودفن، فرفع عينيه في الهاوية وهو في العذاب[١]) واتە: ئەو دەوڵەمەند مرد و شاردیانەوە چاوی هەڵهێنا بینی ئاگری دۆزەخ و عەزاب و ناخۆشی بوو (واتە ئەوە عەزابی قەبر بوە کاتێک گوناحکارەکان دەمرن).

٥.لە ئینجیلی متی دەڵێ: (فإن أعثرتك يدك أو رجلك فاقطعها وألقها عنك، خير لك أن تدخل الحياة أعرج أو أقطع من أن تلقى في النار الأبدية ولك يدان أو رجلان[٢]) واتە: ئەگەر هاتو ساتمەی بە تۆ کرد و گوناحی بە تۆ کرد چ دەستت چ قاچت بیبڕە ئەو قاچ و دەستەت نەوێ گوناحت پێ دەکات، هێشتا بۆ تۆ ئەوە باشترە بەبێ قاچ و دەست ڕەوانەی بەهەشت بکرێیت و نەک قاچ و دەستت ساغ و سەلامەت بێت لە دونیادا گوناحی پێکردبی بە قاچ و دەستەوە ببرێیتە ناو ئاگری جەهەنەم و دۆزەخ.

ئەوانە هەموی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەرانی هەموو ئومەتەکان (علیهم الصلاة والسلام) یەک دەنگ و هاوڕا بون لەسەر ئەوەی کە قیامەت و زیندوبونەوەش هەیە، هەشیانە تاقم و کۆمەڵ لەناو جولەکە و دیانەکانیش لە کۆنەوە و ئێستاش زۆربەیان هەر وان پەیدابون گۆڕیویانە شێوازی زیندوبونەوە و هاتنی قیامەت بە ڕاست و دروستی وەکو ئەوە نیە لە قورئان و حەدیس هاتوە بەڵام تەنها بەڵگەکانمان بۆ ئەوەبوو لەلای ئەوانیش بڕوابون بەوە هەیە ئەگەر کەم و کورتیشیان هەبێ.

[١]) الفقرة ٢٢ من الإصحاح السادس من إنجيل لوقا.

[٢] ١. الفقرة ٨ من الإصحاح الثامن عشر من إنجيل متى.

بەڵام ئینجیلی متی باسی تاقم و كۆمەڵەیەک دەكات كە ئەوانە بە درۆ هێنەرەوەی هاتنی ڕۆژی قیامەتن دەڵێ كاتێک هاتون بۆلای عیسا پێغەمبەر (ﷺ) گوتویانە: (في ذلك اليوم جاء إليه صادوقيون، الذين يقولون لا قيامة[1]) واتە: ئەوانە كە ئەو ناوەیان هەبوە (صادوقیون) بڕوایان بە هاتنی ڕۆژی قیامەت تەواو نەبوە، دەڵێن قیامەت بەرپا نابێ.

عیسا (ﷺ) بەو شێوەیەی جوابی دانەوە كە یەكێک لە قوتابیەكانی (یەكێک لە حەواریەكانی) پرسیاری كرد: (أيذهب جسدنا الذي لنا إلى الجنة؟) واتە: ئەو لاشەی ئێمە پێت وایە دەچێتە بەهەشت؟

عیسا (ﷺ) فەرموی: (احذر يا بطرس من أن تصير صدوقياً، فإن الصدوقيين يقولون: إن الجسد لا يقوم أيضاً، وإنه لا توجد ملائكة، لذلك حرم على جسدهم وروحهم الدخول في الجنة) واتە: ئاگاداربە نەبیتە (صدوقیاً) ئەوانەی دەیانگوت قیامەت نیە ئەو پرسیارانە چیە دەیكەی، چونكە (الصدوقیین) دەڵێن: لاشە زیندونابێتەوە و قیامەت بەسەر لاشەدا نایەت و لە مەیدانی حەشر و حیساب بەس گیانە دێتەوە، فریشتەش نیە، ئەوانە بە دەست و زمانی خۆیان بەوەندە قسە وایانكرد حەرام ببێ لەسەریان بچنە بەهەشت دەبردرێن بۆناو ئاگری دۆزەخ و جەهەننەم.

كۆمەڵێكی زۆریشیان بڕوایان وایە زیندوبونەوە تەنها بۆ گیانە (ڕۆحە)، هەندێک لە ئەهلی فەلسەفەش كەوتونەتە شوێن ئەو بیروبۆچونانەی دیان و جولەكەكان، كە دەڵێن لاشە زیندونابێتەوە، بەڵام لە كۆتایدا دەڵێین عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە دینی پێغەمبەرمان موحەممەدە (ﷺ) ئێستا لە هەموی ڕاستترە هەموو ئەوانی تری هەڵوەشاندوەتەوە لە تەوڕات و ئینجیل و ئەدیان و بیروبۆچونەكانی تر، بەڵێ ئێمە كە مردین ڕۆژێک لە ڕۆژانیش هەر هەمومان گیانمان بەبەر دێتەوە وەكو لە ڕابردودا ڕونمانكردەوە ڕاستدەكرێینەوە و لەناو گۆڕەكانمان دەبردرێین بەرەو مەیدانی حەشر و حیساب، هەم گیانمان لەبەرە هەم جەستەشمان

[1] فقرة ٢٣ من الإصحاح ٢٢ من إنجيل متى.

هەیە، بە هەردوکیان لەوێ ڕادەوەستێترێین و بە لاشە و ڕۆحەوە یان دەچین بەرەو بەهەشت الله لەوانمان بکات یان خەڵکانێک دەبردرێن بەرەو ئاگری جەهەنەم یا الله ئێمە لەوان نەبین.

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد**

**وعلى آله وأصحابه أجمعين**